**بنەما و پێکهاتەکانی زاراوە لە زمانی کوردیدا .**

- نووسەر: د. شەهاب شێخ تەیب تاهیر
- بابەت: زمانەوانی
- پیتچنی: نووسەر
- هەڵەچنی: چۆمان عادل
- نەخشەسازیی بەرگ: جەبار سابیر
- نەخشەسازیی ناوەوە: رووپاک مەحمود
- سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵلا
- قەبارەی کتێب: ٢/١ A٤
- زنجیرەی گشتیی کتێب: (٨٨٣)
- تیراژ : (٥٠٠) دانە
- چاپ: چاپخانەی کەمال
- نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- ژمارەی سپاردنی (١٩٥٠)ی ساڵی ٢٠١٢ی وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
گردی ئەندازیاران.
ژمارەی تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩

**پێشکەش بە:**

- هەناسەی کوردان و شارە خۆشەویستەکەم کەرکووك.
- هەردوو مامۆستا و پێشەوای ژیانم دایکم و باوکم.
- هاوسەری خۆشەویست و هاوڕێی ژیانم (عەبیر).
- هەردوو گلێنەی چاوم (کانی) و (داژیار).
- مامی شەهیدم د.عەبدولسەتار تاهیر شەریف.
- د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف و مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی.

**تێبینی:**

ئەم کتێبە لە ناوەرۆکدا نامەی دکتۆرایە پێشکەشی زانکۆی بەغدا-کۆلێژی پەروەردەی/ ئیبن ڕوشد کراوە وەك بەشێك لە پێداویستییەکانی بە دەستهێنانی پلەی دکتۆرا لە زمانی کوردیدا/ زمان بەسەرپەرشتی پرۆفیسۆر د.وریا عومەر ئەمین ،کە لە ٢٠٠٩/٣/٤ تاوتوێکراوە

## سوپاس و پێزانین

**سوپاسی ئەم دڵسۆزانە دەکەم:**

- د. وریا عومەر ئەمین، کە ئەرکی سەرپەرشتیکردنی ئەم نامەیەی گرتە ئەستۆ.
- دایکم و باوکم کە پەروەردەیان کردم و پێیانگەیاندم.
- (عەبیر)ی خێزانم کە هاندەری سەرەکیم بوو لە تەواوکردنی ئەم نامەیەدا.
- (کانی) کچم، کە لە کاتی نووسینی ئەم نامەیەدا لە سۆزی باوکێتی بێ بەشم کردبوو.
- گشت ئەو مامۆستایانەی کە لە قۆناغەکانی سەرەتاییەوە تا ئێستا وانەیان پێوتووم.
- د.ئازاد ئەمین فەرەج باخەوان و مامۆستا: مستەفا سەیدمینە مستەفا سەنگەسەری، کە زۆر ماندووبوون لەگەڵم و هیوادارم نموونەیان زۆربێت.
- سەرۆکایەتی بەشی کوردی و هەموو ئەو مامۆستایانەی لەو بەشە وانەیان پێ وتووم بە تایبەتی د.کەمال مەزهەر ئەحمەد و د.نەسرین

فەخری و د.ئەورەحمانی حاجی مارف و د.وریا عومەر ئەمین و د.فوئاد حسێن ئەحمەد...

- برا و هاوڕێی ئازیزم (د.ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید) کە زۆر کاری بۆ ئاسان کردم...

- ئەوانەی گەر بە تاکە وشەیەکیش یارمەتییاندابم.

- بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بلاوکردنەوەی سلێمانی.

# بەشی یەکەم

## پێشەکی و دەروازەی لێکۆڵینەوەکە

١- ناونیشانی نامەکە.

٢- هۆی هەڵبژاردنی بابەتەکە.

٣- گرنگیی و ئامانجی لێکۆڵینەوەکە.

٤- سنووری لێکۆڵینەوەکە.

٥- پێڕەوی لێکۆڵینەوەکە.

٦- کەرەسەی لێکۆڵینەوەکە.

٧- گیروگرفتەکانی لێکۆڵینەوەکە

# بەشی یەکەم

## پێشەکی و دەروازەی لێکۆڵینەوەکە

### پێشەکی

ناونیشانی ئەم نامەیە، لە سایەی زانستێکی نوێدا، کە زانستی زاراوەسازییە خۆی دەنوێنێت. سەرەڕای ئەوەی بابەتێکی نوێیە، بەڵام زانستێکە بووەتە بوارێك لە بوارەکانی لێکۆڵینەوە، بوارەکانیشی توێژینەوەی گشت ئەو لایەنانەی پێوەندییان بە کۆکردنەوەی زاراوە و پەسندکردن و چارەسەرکردن و نواندن و پیشاندانیانەوە هەیە، بە تایبەتی ئەو زاراوە فەرهەنگییانەی سەر بە بوارە تایبەتییەکانن، دەگرێتەوە.

سەرەڕای ئەوەی ئەم زانستە، کە چەند زانستێکی دیکەی وەك وشەسازی و واتاسازی و ڕستەسازی و زانستی بوون (علم الوجود) و

زانیاریی و ژیربیژیی و... هتد لەخۆ دەگریت، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە، ئەم زانستە هەرچەندە هەوڵی سەربەخۆبوونی بدەن، کەچی هەر لەژێر کاریگەری چەندین زانستی دیکەدا دەمێنێت و هەموو کاتیش پێوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ زانستەکانی زمان و لۆجیك و زانیاری و بواری پسپۆریی زانستی جیاوازی وەك کۆمپیوتەر دەمێنێ.

وەك زانراوە زاراوە هۆکارێکی گرنگی درووستکردنی زمانێکی یەکگرتووی هەموو گەلێکە، چونکە زاراوە بەردی بناغەی لە دایکبوون و پێکهێنانی زمانی نەتەوایەتی، گەلە پێشکەوتووەکانی ئەم سەر زەمینەیە و لە زانست و ڕۆشنبیری و ئەدەب و هونەردا هۆی یەکخستنی بیرکردنەوە و تێڕوانینیانە.

زاراوە کۆڵەکەی زمانی نەتەوایەتییە، بنچینەی زمانی ستانداردی نەتەوەیە. دیالێکتەکانی هەر گەلێك لێك نزیك دەکاتەوە و گڕوتینی نێوانیان پتەوتر دەکات و دەبێتە هۆی پێکهێنانی یەکێتی دەربڕین و بنچینەی ئامرازی گواستنەوەی هزر و بیر و داهێنان بۆ نەوەکانی داهاتوو بە یەکگرتوویی. لەبەر ئەوەش دەبینین زۆربەی زمانەکانی جیهان بایەخ بە پێناسە و ڕوونکردنەوەی چەمکی زاراوە دەدەن، یەکێ لەو زمانانەش زمانی کوردییە کە لە دوای درووستبوونی دەوڵەتی عێراق و بە کوردی خوێندن بایەخ بە زانستی زاراوەسازی و داڕشتن و دانان و وەرگێڕانی زاراوە بۆ خوێندنگا و دامودەزگا و جێگاکانی دیکە درا، بەڵام لەبەر هۆی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئابووری و زانیاری و کۆمەڵێك هۆکاری دیکە، ئەم زانستە لەنێو گەلی کورددا، پەرەی باشی نەسەندووە و هێشتا

زانستێکی نوێیە و بە باشی نەیتوانیوە جیَ پێی خۆی بگرێت، جا لەبەر گرنگیی ئەو زانستە و بایەخدان بە دانانی زاراوە پێویستە لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی و زانستی ئەنجام بدرێت و لە هەموو لایەنەکانی بکۆڵرێتەوە، هەر لەبەر ئەو پێداویستییەش ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئێمە هاتە کایەوە.

- بەشەکانی نامەکە.

نامەکە لە پێشەکییەك و چوار بەش و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە پێکهاتووە:

**بەشی یەکەم:**

بریتییە لە ناونیشانی نامەکە و هۆی هەڵبژاردنی و گرنگیی و گیروگرفتەکان و پێڕەو و سنوور و کەرەسەی لێکۆڵینەوە و ئەنجامدانی...هتد.

**بەشی دووەم :**

ئەم بەشە بۆ هەڵسەنگاندن و بەسەرکردنەوەی هەندیَ لە کارەکانی پێشوو تەرخان کراوە.، بە تایبەتی ئەو بەرهەمانەی کە جێی سەرنج و زۆر بایەخیان پێدراوە و تێبینی و سەرنج لە بارەیانەوە دەربڕاوە.

**بەشی سێیەم :**

لەم بەشەدا بە شێوەیەکی گشتی باس لە زانستی زاراوەسازی و زاراوە کراوە و لایەنەکانی ڕوون کراونەتەوە و کراوەتە دوو تەوەرە:

تەوەرەی یەکەم: بۆ پێناسە و ڕوونکردنەوەی زانستی زاراوەسازیی و باسکردنی کورتە مێژوویەکی زانستی زاراوەسازی کوردی و تیۆرە گشتییەکانی زاراوەسازی تەرخان کراوە.

تەوەرەی دووەم: لە ڕوونکردنەوەی چەمك و پێناسەی زاراوە و جیاوازی نێوانیان و نێوان وشە و زاراوە و ڕوونکردنەوەی گیروگرفت و مەرجەکانی دانانی زاراوە و زاراوەساز دەکۆڵێتەوە.

**بەشی چوارەم :**

باسی بنەمای دانانی زاراوەی کوردی و پێکهاتەکانی دەکات، وێڕای ئاماژەکردن بۆ گشت ڕێگاکانی سازکردن و دەوڵەمەندکردنی زاراوەی کوردی.

لە کۆتایی نامەکەدا ئەو ئەنجامانەی کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا پێی گەیشتووین، لەگەڵ لیستی سەرچاوە و کورتەی نامە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزیی خراوەنەتە ڕوو.

**- ناونیشانی نامەکە:**

نامەکە بۆ (بنەما و پێکهاتەکانی زاراوە لە زمانی کوردیدا) تەرخان کراوە و لە ئاستی وشەسازی و هەندێ جاریش بەپێی پێویست ئاماژە بۆ ئاستی واتاسازیی و ڕستەسازی کراوە، چونکە کەرەسەی شیکردنەوەکە خۆی لەو ئاستانەدا دەبینێتەوە.

- هۆی هەڵبژاردنی نامەکە:

هۆی هەڵبژاردنی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەتا ئێستا کەمتر کار - بە تایبەتی کاری زانستی - بۆ ئەم زانستە ئەنجام دراوە و ئەوەی کراویشە یەك دوو کتێب و چەند وتارێکە، کە بەرانبەر بە زانستێکی وا فراوان لە ئاستی پێویستدا نییە، سەرەڕای ئەوەی کە کەموکووڕییەکی زۆر لەو کارانەدا دەبینرێت. هەروەها ئەوانەی هەندێ کاریان لەم بوارەدا کردووە ئاماژەیان بۆ هەندێ باسی وەك وشە و زاراوە و چەمك و زاراوە و جیاوازییان و پێناسەکردنیان بە شێوەیەکی گونجاو نەکردووە..

هەروەها لەبەر پێویستی بواری زانستی زاراوەسازی بە زیاتر لێکۆڵینەوە و تێڕوانین و پشکنینی هەموو بوارەکانی، نووسینی نامەیەکی وامان بە پێویست زانی.

- گرنگیی لێکۆڵینەوەکە.

زمانی کوردی وەك هەر زمانێکی دیکەی زیندووی جیهان بە قۆناغێکی مەزنی پێشکەوتن و پەرەسەندندا دەڕوات و بووەتە زمانی فێرکردن و کارگێڕی و ڕامیاری و دادگا و یاسادانان و چەندین بواری دیکە، لێرەدا دەردەکەوێت کە زاراوە بە بەردی بناغەی زمانی هەر نەتەوەیەك دادەنرێت. هەروەها پێشکەوتنە خێراکانی زانست و زانیاریی تەکنەلۆژیاو...هتد، پێویستیان بە وشە و زاراوەی نوێ هەیە بۆ ئەوەی بتوانن گوزارشت لەو چەمکە نوێیانە بکەن، بۆ ئەوەی زمانەکەمان توانستی دەربڕینی چەمکە زانستییەکانی هەبێت، پێویستە گرنگی بە

دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمانەکەمان بدەین و زاراوە زانستییەکان - کە کارێکی پڕ بایەخە- بەکوردی بکەین.

گرنگیی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەوەدایە توانیویەتی لەسەرجەم ڕێگە و بنەماکانی پێکهاتەی زاراوەی زمانی کوردی بدوێ و بۆ یەکەمجارە لە نامەیەکی ئەکادیمی وادا باس لە گشت ڕێگاکانی دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی و چەمك و پێناسەی زاراوە و جیاوازی و ڕوونکردنەوەی پێوەندیی نێوان وشە و زاراوە و... هتد، بکرێت.

هەروەها گیروگرفت و مەرجەکانی دانانی زاراوە و زاراوەساز و ئەو کێشە و گیروگرفتانەی ڕووبەڕووی زاراوەی کوردی دەبن، باسکراون.

- سنووری لێکۆڵینەوەکە.

ئەم باسە لە چوارچێوەی دیالێکتی کرمانجیی نێوەڕاستدا، لە بنەما و پێکهاتەکانی زاراوەی کوردی دەکۆڵێتەوە.

- پێڕەوی لێکۆڵینەوەکە.

لە نووسینی ئەم نامەیەدا زیاتر بە ڕێبازی گشتی پەسندی شیکاریی پێڕەو کراوە، واتە لەپاڵ ئەو ڕێگایانەی کە ئەمڕۆ بۆ دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی کوردی پشتیان پێ دەبسترێت، بە شێوەیەکی بابەتیانە تیشك خراوەتەسەر لە بەشێکی زۆری وشە فەرهەنگییەکانی ئێستای زمانی کوردی و یاسا و تایبەتمەندییەکانیان پیشان دراون.

- کەرەسەی لێکۆڵینەوەکە.

بریتییە لە ئاخاوتنی ڕۆژانە و ئەو لێکۆڵینەوە کەمانەی تا ئێستا لەسەر زاراوەسازیی کوردی کراون، لەگەڵ سوود وەرگرتن لە هەندێ سەرچاوەی زمانەکانی وەکو عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی.

**گیروگرفتەکانی لێکۆڵینەوەکە:**

گیروگرفتی سەرەکی لە بواری کاری فەرهەنگ و زاراوەسازیدا کەمیی سەرچاوەیە بە زمانی کوردی و ئەوانەیش لەو بوارەدا نووسراون لە کەموکووڕی دوور نەبوون و زیاتر لە ژێر تیشکی وەرگێڕان لە زمانەکانی وەك عەرەبی و ئینگلیزییەوە نووسراون. هەروەها کاری زانستی و ئەکادیمی لەم بوارەدا کەم کراوە و لە لایەن ڕۆشنبیران و زمانەوانانیش بایەخێکی زۆری پێنەدراوە...

# بەشی دووەم

## بەسەرکردنەوە و هەڵسەنگاندنی هەندێك لە کارەکانی پێشوو:

لەم بەسەرکردنەوە و هەڵسەنگاندنەدا، تەنها چاو بەو بەرهەمانەدا خشێنراوە، کە نووسەرەکانیان لەم بوارەدا پسپۆربوون، یان خودان ئەزموونن. ئەم بەسەرکردنەوەیەش بۆ ئاگاداربوونە لە کارەکانی پێشتر و دووبارەنەکردنەوەیان و سوودوەرگرتنە لێیان. هەروەها هەوڵمان داوە تاڕادەیەکی باش هەڵیانبسەنگێنین و ڕاوبۆچوونی خۆشمان لە بارەیانەوە دەرببڕین، وەك:

## ١- كتێبی (زاراوەی کوردی)[1].

ئەم کتێبە بە بنەمایەکی باش لە بواری زاراوەسازیی کوردی تۆمار دەکرێت و نووسەرەکەی هەوڵی داوە ڕێبازێکی زانستی بگرێتە بەر بۆ لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی زاراوەی کوردی، بە شێوەیەکی تیۆری باس لە چۆنیەتیی دانان و سازکردن و کێشەکانی زاراوەی زمانی کوردی دەکات، کە ئەمەش هەنگاوێکی گرنگە و لەگەڵ ئەوەشدا جێی خۆیەتی ئەم چەند تێبینییە لە بارەی کتێبی ناوبراوەوە تۆمار بکرێت:

غازی فاتح وەیس[1] سەرجەم تێبینی و سەرنجەکانی بە هەژدە (١٨) خاڵ لە بارەی کتێبی ناوبراوەوە دەربڕیوە و چەند زانیارییەکی بە کەڵکی بەدەستەوە داوە، بۆیە لەم پێناوەدا و بۆ نموونە ئاماژە بۆ هەندێ خاڵی گرنگ و بەسوودی ئەو سەرەنج و تێبینییانە دەکەین:

هەندێ لەو خاڵانەی کە (د.کامل بصیر) وتوویەتی و م.غازی سەرنجی لەسەر نووسیوە بە کورتی ئەمانەن:

١- زۆرجار زاراوەیان لەگەڵ وشەی فەرهەنگی و واژەی خەڵکیدا تێکەڵ کردووە (ل١٣).

٢- وشە یاخود ناو واژەیەکە لە چەند دەنگێک پێکهاتووە - واتای هەیە و هیچ پارچەیەکی خۆی لە خۆیدا واتایەك نابەخشێت (ل١٤).

---

[1] د.کامل بەصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، سلێمانی، ١٩٧٩.

[1] غازی فاتح وەیس، کتێبی زاراوەی کوردی و چەند تێبینییەك، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٤)، ساڵی دووەم، بەغدا، ئەیلوولی ١٩٨٤، ل٩-١٤.

٣- وشە ئەبێ ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەی تێدا هەبێ (ل١٤):

ا- پێکهاتنی فۆنەتیکیی هەبێت.

ب- مانا و واتادارییێت.

پ- قەوارەی ڕێزمانیی هەبێت.

ت- هەمیشە خاوەنی دەنگ و واتابێت.

ج- پتر لەیەك گیرەی نەبێت.

چ- بتوانرێ لە ڕستەدا بەکار بهێنرێت.

خ- توانای هەبێ ببێت بە ئیدیۆم.

٤- لە کتێبەکەیدا باس لە واژەی (اصطلاح)ی (الشریف الجرجانی) دەکات، کە دەڵێن: ڕێککەوتنی تاقمێکە لە کۆمەڵانی خەڵك لە بارەی ناونانی شتێك یاخود کارێك بە وشەیەك لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی دیکە گواسترابێتەوە (ل١٦).

٥- سەرئەنجام نابێ بۆ تاقە مەبەستێك و یەك واتا پتر لەیەك زاراوە بەکاربهێنرێت و سەر لە خوێنەر و گوێگری کورد تێکبدرێت (ل٢٤).

٦- زاراوەی نوێ، حەوت ڕێبازی هەیە.

٧- وشەی (القلم)ی بە زاراوە لەقەڵەم داوە (ل٥٥).

٨- لەسەر وەزنی جوتیار و فرۆشیار د.کامل وشەی (هەستیار)ی بۆ شاعیر داناوە و هەستیاریش واتە ئەو کەسەی هەستی هەیە (ل١٤١).

سەرنجەکانی م.غازیش بەم شێوەیەی خوارەوەن :

- د.کامل خۆشی ئەم کارەی کردووە و چەندین ناوی ڕۆژانەی بە زاراوە لەقەڵەم داوە. وەك ئەم ناوانە بە زاراوە لە قەڵەم دەدات: (پایسکیل،

کتێب، شێر، مێرگەسوور، ڕەشماڵ، دارتاش، بەرماڵ، ئاسنگەر، مزگەر، گاسن، ناڵبەند، باخەوان، نانکەر، گوێچکە،...) ئەمانە هەموو ناون و نابن بە زاراوە.

- دکتۆر دەیەوێت بە پێی ناساندنی ئەرستۆ وشە بناسێنێ.

- سەبارەت بە تایبەتمەندییەکانی وشە:

أ- ئایا مەبەست لە پێکهاتەی فۆنەتیکی چییە؟

ب- ئایا مانا و واتا جیاوازییان هەیە؟

پ- وشە هەیە تەنیا ئەرکی ڕێزمانیی هەیە و واتاش دەبەخشێت.

ت- دووبارەکردنەوەی خاڵی یەکەم و دووەمە.

ج- ئەگەر مەبەست لە گیرە سترێس بێ، ئەوا وشەی سێ بڕگەیی لەیەك گیرە زیاتری هەیە.

چ- دووبارەکردنەوەی خاڵی سێیەمە.

خ- هیچ وشەیەك بە تەنیا نابێتە ئیدیۆم.

- بە پێی ئەم بۆچوونە بێ دەبێ کۆمەڵێك خەڵك زاراوە درووست بکەن نەك تاقە کەسێك؟

- مەبەستی دکتۆر ئەوەیە کە نابێ دوو زاراوە بۆ یەك مەبەست بەکاربهێنرێت، هەروەکو دەڵێ نابێ (جوانکاری) و (شیرینکاری) بۆ (الابداع) بەکاربێت. بەڕای د.کامل بێت نابێت (مرادف) هاوواتا لە زمانی کوردیدا هەبێ، بە تایبەتی لە بواری زاراوەدا.

- بەڵام ڕاستییەکەی دوو ڕێباز هەن یەکێکیان ڕێبازی لێکدانە و ئەوی دیکەیان ڕێبازی داڕشتنە.

- (قەڵەم) ناوە نەك زاراوە.

- هەستیاریش واتا ئەو کەسەی هەستی هەیە، ئەمەش هەڵەیە بە پێی ئەمە بێ تەنیا شاعیر دەبێ هەستی هەبێت.

سەرنجەکانی ئێمەش بە کورتی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

زۆرینەی ئەوانەی لە بواری زانستدا کاردەکەن، ئەوە دەزانن کە ئەم جۆرە تێکەڵکردنە هەیە و ئەمەش بۆ نەناسینەوە و جیانەکردنەوەی وشەی فەرهەنگی لەگەڵ وشەی خەڵکی یان جیانەکردنەوەی وشە لە زاراوە دەگەڕێتەوە، چونکە ئەوانەی د.کامیل ناوی بردوون ناون و زاراوە نین، هەروەها دەتوانین بڵێین هەموو زاراوەیەك ناوە، بەڵام هەموو ناوێك زاراوە نییە.

- لێرەدا نەهاتووە بڵێت ئەم پێناسەیە سنووری وشەمان بۆ دیاری دەکات، بەڵکو ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە وشە تا ئێستا پێناسە نەکراوە، بەڵکو بەر لە دوو هەزار و سێ سەدساڵ یان زیاتر پێناسە کراوە، گومانیش لەوەدا نییە، کە تا ئێستا وشە نەتوانراوە بە تەواوی پێناسە بکرێت، ئەگەر وابوایە بیرۆکەی مۆرفیم و سەرهەڵدانی نەدەدۆزرایەوە.

- جارێ پێش هەموو شتێك ئەو تایبەتمەندییانەی، کە غازی فاتیح داویەتە پاڵ د.کامیل، کە ئاماژەی هەر بۆ لاپەڕە (١٤)ی کتێبەکەی دەکات، ڕاست نییە، چونکە ئەو تایبەتمەندییانەی وشە لە کتێبی (وشەی زمانی کوردی)ی د.ئەوڕەحمانی حاجی مارفەوە وەرگرتووە[١]، دواتر

---

[١] بڕوانە: د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥، ل٧.

د.کامیل ئەمەی کردووەتە ناو کەوانەوە، لە پەراوێزی ژمارە (٦)دا، ئاماژەی پێکردووە، کە لە کوێوە وەری گرتووە. پاشان ئەو تێبینیانەی لە بارەی ئەو تایبەتمەندییانەوەن تۆماری کردوون لە جێی خۆیاندان.

لە خاڵی یەکەمدا باسی پێکهاتنی فۆنەتیکی دەکات و دەڵێت: ئایە مەبەست لە پێکهاتنی فۆنەتیکی چییە؟ مەبەست لە پێکهاتنی فۆنەتیکی مانای ئەوەیە، قاڵبێکی فیزیاوی هەبێت، و بوونی هەبێت[1]، کە وەك دەنگ لە قسەکردندا دەبیسترێ. یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی کە باسی کردووە، ئەوەیە: مانا و واتادار بێ، بەڵام غازی فاتیح لە (ل١١)ی وتارەکەیدا دەڵێت: وشە هەیە واتای نییە، وەکو (بۆ)، (بەڵکو). بەلای ئێمەوە مەرجێ لەمەرجەکانی وشە ئەوەیە واتای هەبێت، کە ماناشی نەبوو بە وشە ناژمێررێت، وشەی (بۆ) و (بەڵکوو) بەلای ئێمەوە مانای هەیە، ئەویش ئەرکە (وشەی ئەرکی)یە. (بۆ) بۆ (هۆ)ی هەرشتێك بێت بەکاردێت،(بەڵکوو)ش بۆ (ئەگەر)ی هەر شتێك بێت بەکاردێت.

بۆیە سەبارەت بەو هەشت تایبەتمەنییانەی کە د.ئەورەحمان حاجی مارف، دیاریی کردوون، دەتوانین لە چوار خاڵدا بیانخەینەڕوو:

١- قاڵبێکی فیزیاوی هەبێت.

٢- مانایەکی هەبێت.

٣- ڕۆڵی لە ڕێزماندا هەبێت.

---

[1] د.وریا عمر ئەمین، چەند ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەکەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤،ل٣٦٤.

٤- بەلەتلەتکردنی و جیاکردنەوەی فۆنیمەکانی لە یەك، مانا و دەورە بنجییەکەی نامێنێ[٢].

- تاقە کەس بۆی هەیە زاراوە دابنێ، بەڵام بە پێی مەرجی تایبەتی. کاری زاراوەدانان هەموو سەرچاوە بیانییەکان و سەرچاوەکانی خۆمانیش جەخت لەوە دەکەن، کە زاراوە ڕێککەوتنی کۆمەڵێکە لەسەر وشەیەك، هەروەها کارکردنی کۆمەڵە خەڵك باشترە لە کاری تاکەکەسێك، هەروەها زۆربەی وشەکانی هەر زمانێك بە ڕێکەوت و ڕێککەوتنی کۆمەڵە خەڵکەکە درووست بووە، ئەوانی دیکەیش بە پێی یاسا درووست بوون.

- لەبارەی ئەمەوە و لە زانستی زاراوەسازیدا تا بتوانرێت دەبێ هەوڵ بدرێت دیاردەی هاوواتا و فرەواتایی و هاوبێژیی نەمێنێت، چونکە سەر لە خوێنەر دەشێوێنێت و یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی زاراوە ئەوەیە بۆ هەر چەمکێك یەك زاراوە بەکاربهێنرێت، نەك وەك ئێستا بۆ (ضمیر)ی عەرەبی، نازانین بلێین (جێناو) یان (ڕاناو)... ئەمە سەر لێشێواندن نییە؟.

- ڕاستە ئەو دوو ڕێگایە بۆ داڕشتن و لێکدانی وشە و زاراوەی کوردی زۆر سەرەکین، بەڵام ڕێگاکانی دیکەیش ڕۆڵی باڵایان لەو بوارەدا بینیوە.

- ئێمەش دەڵێین، کە (قەڵەم) وەك چۆن (کتێب)مان لە (کتاب)ی عەرەبییەوە وەرگرتووە بەهەندێ گۆڕانەوە، هەروەها وشەی (قەڵەم)یش هەر بەو شێوەیە، زاراوە نییە، بەڵکو ناوە.

- هەستیار واتە ئەو کەسەی هەستی هەیە، (هەستیار) بۆ (شاعیر)، جێی خۆی نەگرت، چونکە بە پێی ئەمە بێ تەنیا شاعیر دەبێ هەستی

---

[٢] د.وریا عمر امین، چەند ئاسۆیێکی تری زمانەوانی، ل٣٦٤.

هەبێت. زاراوەی (هەستیار)یش خەڵکی ئارەزووی پێ ناکات و بەکاری ناهێنێت، هەر وشەی (شاعیر)ە، کە ڕۆیشتووە و جێی خۆی گرتووە، وەك خۆی بمێنێتەوە باشترە، چونکە کەس نییە ئەم وشەیە بەکارنەهێنێت.

.... ئەمە بە کورتی ئەو تێبینی و سەرنجانەبوون دەربارەی کتێبی ناوبراو[*]...

## ٢- کتێبی (زاراوەسازی پێوانە)[1].

ئەم کتێبە بە کارێکی گەورەی زاراوەسازیی کوردی دەژمێردرێت، چونکە بەشێکی زۆری ئەو وشە و کەرەستانەی کە هەر لە زووەوە هەبوون هەڵیسەنگاندوون و لە بنچینەیانی کۆڵیوەتەوە و لە بارەی ڕۆنانیانەوە دواوە و بە پێی قاڵبی وشەسازی و دەستووری گشتی خستوویانیەتە ڕوو. بەپێی ڕێبازی پێوانەیی پێشنیاری دەیان زاراوەی بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی کردووە و لە باسی وشەی داڕێژراودا لیستی بۆ چەندین زاراوەی فرەجۆر کردووە و وشەی لێکدراویشی بەسەر دوو جۆردا دابەش کردووە:

---

(*) لە بارەی سەرجەم سەرنج و تێبینییەکان سەبارەت بە کتێبی ناوبراو، بڕوانە:

– غازی فاتح وەیس، کتێبی زاراوەی کوردی و چەند تێبینییەك، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٤)، ساڵی دووەم، بەغدا، ئەیلوولی ١٩٨٤، ل٩–١٤.

(١) مسعود محمد، زاراوەسازی پێوانە، چاپخانەی (سومر)، بەغدا، ١٩٨٨.

- لێکدانی کار و ناو.

- لێکدانی ناو و ناو.

سەرەڕای ئەوانەی لەسەرەوە باسکران، لەم کتێبەدا ئاماژە بۆ هەندێ لەو گیروگرفتانەی کە ڕوو بەڕووی زاراوەی کوردی دەبنەوە و ئەو مەرجانەی دەبێت لە زاراوەسازدا هەبن و بە مەرجی دانانی زاراوەی کوردی دانراون...

(ئازاد حەمە شەریف) لە وتارێکدا[1] هەندێك تێبینی و سەرنجی خۆی لە بارەی هەندێك لەو زاراوانەی مەسعود محەمەد پێشنیاری کردوون تۆمارکردووە و بە کورتی ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکەین:

١- ((هەڵبەت بۆناو لەگەڵ ناقۆڵایی خۆیدا پەسەندترە لە ڕاناو)) (زاراوەسازی ل٤).

بە پێچەوانەی قسەکەی مەسعود محەمەد، من وای بۆ دەچم (ڕاناو) گەلێ ڕاسترە، چونکە لە زمانی ئینگلیزیدا (pronoun) بە واتای (noun) (for + name)دێت = ڕا + ناو = ڕاناو. پاشان دەڵێت: خۆ لە زمانی کوردیدا (ڕا) بەواتای (for)ی ئینگلیزی دێت. کورد لە مێژە وتوویەتی (لە ڕاهی خوا)، جا هەر هەمان (ڕاهی) بۆتە (ڕا) بە واتای (لەپێناو، بۆ خاتر).

٢-((دەتوانین بەشتێك (قابل للتجربة) بێ بڵێین، بەرئەزموون)) (زاراوەسازی ل٣٩).

---

[1] ئازاد حەمە شەریف، سەرنجێك لە کتێبی (زاراوەسازی پێوانە)، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (١٧)، هەولێر، تشرینی دووەم ١٩٩٧، ل١٢٥-١٢٧.

له کوردیدا وشەی (فڕندە) مان هەیە بە واتای ئەوەی (توانای فڕینی هەیە)، جا دەکرێ وشەی (ئەزموون) لەسەر ئەو وشەیە دابڕێژرێت و ببێتە (ئەزموووندە).

٣- ((وابزانم (کەمەند) لە کەمەرەوە هاتووە)) (زاراوەسازی ل١٦١).

من وای بۆ دەچم لە (کەمە)ەوە بە واتای (چەمانەوە)وە هاتبێت، چونکە ئەو گوریسەی کەمەندی پێدەکرێت دەچەمێتەوە و لوول دەخوات.

٤- ((ئینجا هەر وەك (قطار)ی عەرەبی بە واتای (جەلوو) Train چەسپا دەشێ (جەلوو) بۆ شەمەندەفەریش بەکار بێ)) (زاراوەسازی ل١٩٦).

کورد دەمێکە بە (قطار) دەڵێت: (شەمەندەفەر) هەرچەندە ئەم وشەیە وشەیەکی بێگانەیە، بەڵام تازە ڕۆییوە و لە (جەلوو) بەر زەینترە و لەسەر زمانی کورد بڵاوبووەتەوە.

٥- ڕەنگژە بۆ (مصبغة) (زاراوەسازی ل٢١٨).

بە بڕوای من لە کوردیدا هەر زاراوەی (خومخانە)، پڕ بە پێستی (مصبغة)یە نەك (ڕەنگژە).

٦- ((بە باوەڕی من هەقی خۆمانە لە جێی (ثلاجة - glacier)دا بڵێین: (بەفرانگە) (زاراوەسازی ل٢٢٨).

هەموو لایەکمان ئەوە باش دەزانین کە پاشگری (گە) لە کوردیدا واتای (جێگا) دەبەخشێت کەچی مەبەست لە (glacier) ئاوە بەفراوەکەیە، کەواتە (بەفراوك)، یان بوترێت (بەفرگە).

٧- ((aesha واتە گاسن. من بە بیرمدا نایەت لە کوردیدا وشە هەبێت بۆ ئەو واتایە لە فۆرمێکی نزیك بە ئەئێشە مابێت))(زاراوەسازی ل٣٩٨).

لە فەرهەنگی (کوردی – ئینگلیزی) تۆفیق وەهبـی و ئەدمۆندزدا، (هێشە) بەواتای (گاسن) هاتووە.

٨- ((سارقی دەبێتە (دزەکی)))(زاراوەسازی ل١١).

بە بڕوای مـن کورد وشەیەکی پڕ بە پێستی (سارقی) هەیە ئەویش (دزۆك)ە.

سەرنج و تێبینییەکانی ئێمەش سەبارەت بەو خاڵانەی سەرەوە، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

- ئێمە ئێستە وەك زاراوەیەك کە لە قوتابخانە و فێرگەکاندا بەکاربێت، بۆ (ضمیر)ی عەرەبی (جێناو) و (ڕاناو) بەکاردێنین، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە، وەك چۆن لە زانستی دەنگسازیدا نابێت دەنگێك دوو پیت بینوێنێت، وەك دوو (وو) بۆ دەنگی (و)ی درێژ، بەو شێوەیەش لە زاراوەسازیدا نابێت، یەك چەمك دوو زاراوەی هەبێت. سەبارەت بەم دوو زاراوەیە هەر کەسێك ڕاوبۆچوونی خۆی هەیە و تا ئێستاش ئەوانەی ڕاوبۆچوونی جیاوازیان هەیە نەیانتوانیوە دان بە ڕاوبۆچوونی بەرانبەرەکەیان بنێن، بەلای ئێمەوە زاراوەی (جێناو) بەڕاستر دەزانین لەبەر هەندێ هۆ، وەك زمانزان هاتووە لە بری (ضمیر – pronoun) زاراوەی (ڕاناو)ی پەسەند کردووە یاخود زۆرکەس لە جێگەی (فعل)ی عەرەبی (فرمان)یان بە باش زانیوە، کەچی وشەی ناپەسندتر لە (ڕاناو، فرمان)

بە زۆرە ملێ نەبێ هەر دەست ناکەوێت: وشەی (ڕاناو) ئەگەر لە پێشگری (ڕا - ڕاهاتن - ڕاپسکاوتن - ڕابواردن) و وشەی (ناو) پەیدابووبێ[1]، وەك ئەوەیە لۆکە بە ئاسن بدرووین، چونکە پێشگری (ڕا) هەر لەگەڵ کاردا دێت، کەس نەیبیستووە گوترابێت، ڕابەرد، ڕاعەلەشیش، ڕازوڕنا،... ئەگەر لە (ئەڕا) بەواتای (بۆ)ەوە، هاتبێ دەبێ بگوترێ (ئەڕای ناو) وەك کە هەندێك دەنووسن (بۆناو)... وشەی (فرمان) هەمان (فرمان)ە، کە بەواتای (أمر) هاتووە: نەخوێندەواری کورد لەهەندێ شوێنی کوردستاندا، دەڵێت: (فرمانی خۆم بەجێ کرد) مەبەستیشیان ئەوەیە کە فرمان لەو بەکارهێنانەدا بەواتای (عمل، فعل) هاتووە، ئیتر گورج فرمانیان لە جێگەی فعلی ڕێزمانی عەرەبی هەڵنا، بۆ ڕێزمانی کوردی[1]. هەروەها هۆیەکی دیکەیش ئەوەیە (ڕاناو) باش مەبەست ناپێکی و خوێنەر لە واتاکەی ڕادەمێنێ، چونکە:

بەشی یەکەمی ئەو زاراوەیە بە گەلێ واتا دێ، بۆ نموونە:

١-تەگبیر (بیروڕا) لە (رأی) عەرەبییەوە.

٢-ڕێ، ڕێگە

ڕابەر > ڕێبەر

(ڕا) پتر ڕیژە فارسییەکەیەتی و (ڕێ) کوردییە.

٣-وەك پێشگرێك دەچێتە سەر کردار:

هاتن ---- ڕاهاتن

---

[1] مسعود محمد، زاراوەسازی پێوانە، ل٤.

[1] مسعود محمد، زاراوەسازی پێوانە، ل٤.

کردن ---- ڕاکردن ......................... هتد.

٤-ئەڕا = بۆچی.

٥-وەك پاشبەندی (وە / ەوە):

لەتۆوە = لەتۆڕا

لەمنەوە = لەمنڕا

٦-جار = ئەمجارە.

٧-شیان (ڕات ناکەویٚ)[١]

سەرەڕای ئەوەی مەسعود محەممەد هیچ زاراوەیەکی بۆ (ضمير) عەرەبی پێشنیار نەکردووە، ئەوەش بەلای ئێمەوە زاراوەی (جێناو) بە باشتر دەزانین و شێوەی ڕۆنانی ئەو زاراوەیە لەهەندێ زماندا بەمجۆرەیە:

یۆنانی: antonymia = (anto-جیٚ) و (nymia - ناو).

لاتینی: pronomen = (pro – جیٚ) و (nomen – ناو).

ئینگلیزی:pronoun = (pro – جیٚ) و (noun – ناو).

ڕووسی: mes-toemenye = (mesto – جیٚ) و (emya – ناو).

............. هتد.

کەواتە (جێناو) لە گشت ڕوویەکەوە، واتە بەپێی ڕوخسار و ناوەڕۆك لە (ڕاناو) ڕوونتر و ڕاستر و تەواوتر و گونجاوترە... لەبەر ئەوەی:

---

[١] د.ئەورەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی و خەوشی هەندێ وشە و زاراوەی نویٚ، بەشی یەکەم، بەغدا، ٢٠٠٠، ل١٨-١٩.

١- (جیٚ) بە تەواوی لەگەڵ (anto)ی یۆنانی و (pro)ی لاتینی و ئینگلیزی و (mesto)ی ڕووسیدا یەك دەگرنەوە.

٢- لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بەکاری دێنن و بەپێی ئاوازی دەنگی خۆیان کردوویانە بە (جێناڤ).

٣- (جیٚ) تەنیا یەك واتای هەیە، کە ئەویش (شوێن)ە و واتاکەشی زۆر ئاسان و ڕوونە (سەرەڕای ئەوەی لە هێندێك شوێن بە واتای بەشیش دێت). واتە هەرچی (ڕا)یە، مۆرفێمێکی فرەواتایە و زۆربەی ماناکانیشی لێڵ و گرانن بۆ زاراوە وشەی یەك واتایی، لە فرەواتایی پەسەندترە[1].

- سەرەڕای ئەوەی وشەی (ئەزموندە) تا ئەندازەیەك بۆ وشەی (ئەزموون) گونجاوە، ئەگەر شتێکمان هەبوو شایستە نەبوو بۆ (ئەزموون) چی پیٚ بڵێین، جا بۆیە هەر زاراوەکەی مەسعود محەمەد بە گونجاوتر دەبینین، وەك ئاماژەشی بۆ کردووە پەندێکی پێشینان هەیە کە خەریکە لە بیر دەچێتەوە، کە دەڵێت: ماستی ئەزموو لە نەزموو چاکترە. بەواتای تاقیکراوە و تاقی نەکراوە. دەتوانین بە شتێك (قابل للتجربة) بیٚ بڵێین بەرئەزموون، ئەوەش کە تاقی نەکرابێتەوە و ئەوەی نەتوانرێت تاقی بکرێتەوە (نەزموو)ی بۆ دەست دەدات[2].

- جاریٚ وشەی (وابزانم) لە زانستدا جێی گومانە، واتە لێی دڵنیانیت، پاشان زۆر ڕێی تێدەچێت کە لە (کەمە)وە بە واتای (چەمانەوە)وە

---

[1] د.ئەورەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی و خەوشی هەندیٚ وشە و زاراوەی نویٚ، ل١٩-٢٠.

[2] مسعود محمد، زاراوەسازی پێوانە، ل٣٩-٤٠.

هاتبێت، چونکە ئەو گوریسەی کەمەندی پێ دەکرێت دەچەمێتەوە و لوول دەخوات.

- هەر وشەی (شەمەندەفەر) بەکاربێت باشترە لە وشەی (جەلوو).

- بەلای ئێمەوە، وشەی (ڕەنگخانە) بۆ (مصبغة) لە (خومخانە) ئاسانتر و خۆشترە و سەرەڕای ئەوەی (خانە) لێرەدا پاشگر نییە و وشەیەکی واتادارە.

-دیارە لە فەرهەنگەکەی (تۆفیق وەهبی) و(ئەدموندز)دا وشەی (هێشە) بە واتای (گاسن) هاتووە [1] ڕەگی (هێشە) لەو دوو وشەیە دا لە کوردیدا ماونەتەوە (کاڵەهێش،هێشەبڕ) لە هەردوو وشەشدا واتای گاسنیان تێدا ماوەتەوە.

- بەلای ئێمەوە وشەی (دزەکی) تەواترە، چونکە لە وشەی (دز) و پاشگری (- ەکی) پێك هاتووە، کە ئاوەڵناوی نیسبییە لە ڕووی واتاوە بە هۆی هەندێ پێشگر و پاشگرەوە دروست دەبێت، وەك:

(- ی): ---- کوردی، کرمانجی...

(- ین): ---- ئاسنین، بەردین...

(- انە):---- پیاوانە، مەردانە...

(- ە کی): ---- دەشتەکی، خێڵەکی.

---

[1]Kurdish – English Dictionary,London,١٩٦٦,p٦٦. Tawfiq Wahbyi and C.j.Admondez, A

(- ە): ---- بەهارە، زستانە[٢].

وشەی (دزۆك) لە وشەی (دز) و پاشگری (- ۆك) پێکهاتووە بە واتای (سارق)[٣]ی عەرەبی دێت بۆ (سارقی) دەست نادات.

ئەمانە بە کورتی هەندێ لەو تێبینیانە بوون، ڕەخنەگر ئاڕاستەی کتێبی (زاراوەسازی پێوانە)ی کردبوون[*].

## ٣- زاراوەکانی ((کۆڕی زانیاریی کورد))[**]:

هەر لە سەرەتای حەفتاکانەوە کۆڕی زانیاریی کورد هەوڵێکی مەزنی بۆ درووستکردن و ڕۆنانی زاراوەی کوردی دا و لەو بوارەشدا جێ پەنجەیان دیارە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك تێبینی بەرچاو دەکەون، کە لەچەند خاڵێکدا ئاماژەیان پێدەدەین، لەوانە:

---

[٢] د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی سێیەم -ئاوەڵناو-، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٩٢، ل٦٧.

[٣] بڕوانە: ڕزگار کەریم، فەرهەنگی دەریا (عەرەبی – کوردی)، بەشی یەکەم، نشری احسان، تەهران، ١٣٨٢- ٢٠٠٦، ل٣٩٢.

[*] بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئەو سەرنجانەوە، بڕوانە:

– ئازاد حەمە شەریف، سەرنجێك لە کتێبی (زاراوەسازی پێوانە)، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (١٧)، هەولێر، تشرینی دووەم ١٩٩٧، ل١٢٥-١٢٧.

[**] لە بارەی سەرجەم زاراوەکانی کۆڕی زانیاریی کورد، بڕوانە:

– گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورد، زاراوەی کارگێڕی، بەرگی (یەکەم)، بەشی (یەکەم)، بەغدا، ١٩٧٣، ل٤١٩- ٥٢٥.

- ئەنجومەنی کۆڕ لە دانانی زاراوەی کارگێڕیدا زۆر سەرکەوتووانە، زاراوەکانی داناوە، بەڵام لە هەندێ جێگەدا زاراوە عەرەبییەکەی هەر بە ڕێنووسی عەرەبی داناوەتەوە، وەك (درس)ی عەرەبی کراوە بە (دەرس) ل٤٦٩. لەوانەیە لەو ڕوانگەیەوە بێت، کە زۆرینەی خەڵك هەر وشەی (دەرس) بەکاردێنێت، هەروەها وشەکانی:

حاضر ---- حازر(ل٤٦١) وشەی (ئامادە) گونجاوە بۆ (حاضر).

تنقلات (للموظفين) ---- ئاڵوگۆڕ(ل٤٥٣) وشەی (گواستنەوە) بەلای ئێمەوە لە وشەی (ئاڵوگۆڕ) بە باشتر دەزانین، چونکە بە واتای شتێ بگۆڕدرێتەوە بە شتێکیتر دێت، بۆ کڕین و فرۆشتن (ئاڵوگۆڕ) بەکاردێت.

درس ---- دەرس (ل٤٦٩) ئەی بۆ نەڵێین (وانە) کە لە (دەرس) باشترە و کوردیشە.

- هەروەها لەو وشە عەرەبییانەی کە بە دەستکارییەوە بەکارهاتوون و کراونەتە کوردی:

سکرتیر ---- سکرتێر (ل٤٧٦). (ڕازپارێز) بۆ وشەی (سکرتێر) پێشنیار دەکەین.

شاهد ----- شایەد (ل٤٧٨). (گەواهـ) بۆ وشەی (شاهد) پێشنیار دەکەین.

شتل ---- شەتڵ (ل٤٧٩).

صفر ----- سفر (ل٤٨٢) یان بوترێ (هیچ).

ضمير ---- ڕاناو (ل ٤٨٣) بەلای ئێمەوە (جێناو) تەواوترە.

فرصە ---- دەلیڤە(ل٤٩١)، (هەل)یشمان هەیە، کە بۆ (فرصە) زۆر گونجاوە.

قرض ---- قەرز، وام (ل٤٩٥) وشەی (قەرز) لە (وام) گەلێ باشترە، چونکە خەڵکەکە هەموو لە (قەرز) تێ دەگەن، بەڵام (وام) بە وشەیەکی نامۆ دێتە گوێ.

قضاء ---- هەرێم (ل٤٩٥) وابزانم (هەرێم) بۆ جێگەیەکی گەورەتر لە (قضاء) بەکاردێت، کە (اقلیم)ی عەرەبی دەگەیێنێت، بۆیە بۆ (قەزا) وشەی (شار) و بۆ (ناحیە)ش وشەی (شارۆچکە) بۆ (محافظة)ش وشەی (پارێزگا) پێشنیار دەکەین.

- هەروەها هەندێ تێکەڵی و دووبارەکردنەوە لە زاراوەکانی کۆڕدا دەبینرێ...

پاشان دەتوانین ئاماژە بەوەش بدەین کە نووسەرانی دیکەش تێبینی خۆیان لەو بوارەدا هەبووە..

ڕەئوف عوسمان لە وتارێکیدا[1] ئاماژە بۆ هەندێ تێبینی و سەرنج سەبارەت بە زاراوەکانی کۆڕی زانیاریی کورد کردووە و سەرنجەکانیشی تایبەتە بەوەی هەندێ زاراوەی خستووەتە سەر ئەو تەنیا زاراوانەی کە کۆڕ بۆ یەك واتا دایناون و باس لە (٧٦) زاراوە دەکات، لێرەدا ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکەین:

- انحراف ----- (ڕادان)(کۆڕ).

---

[1] رؤوف عثمان، پێداچوونەوەیەك بە پەراوێزی زاراوەکانی کۆڕدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٥٠)، بەغدا، حوزەیرانی ١٩٧٦،ل٣٦-٤٢.

پێشنیاری (ڕاپێچان)ی بۆ دەکات، ئێمەیش پێشنیاری وشەی (ڕامالّین)ی بۆ دەکەین.

- الفروسیة ---- (سواری) (کۆڕ).

وشەی (سوارچاك)ی بۆ پێشنیار کردووە، بەلای ئێمەشەوە وشەی (سوارچاکی) بۆ (الفروسیة) زۆر لە جێی خۆیەتی.

- موزع ---- (نامەبەر) (کۆڕ).

ڕەخنەگر ڕاستی بۆچووە، کە دەڵێت: مەرج نییە هەموو (موزعێك) هەر نامە بەرێت، (نامەبەر) — بۆ (موزع البرید) دەبێت، بەلاّم بۆ (موزع) وشەی (دابەشکار) ڕەنگە گونجاو بێت.

- شد---- (کێشانەوە) (کۆڕ).

(کێشانەوە) بۆ (سحب) بەکاردێت، بەلای ئێمەوە (شد) واتایەکی گشتی هەیە هەر زاراوەیەك لەمانە دەگونجێت بۆ (شد): (بەستن، بەستنەوە، شەتەکدان، ڕاکێشان)[1].

- الاقتصادیون ---- (ئابووری ناسانی) (کۆڕ).

وشەی (ئابووریناسان) یان (ئابووری ناسەکان) بە تەواوتر دەزانین، پارچەی دووەمی وشەکە (ناسان)، (ی)نیسبەت وەرناگرێت.

-جزر---- نیشتاو / مد---- بەرزاو (کۆڕ).

دوو وشەی وەك (هەڵچوون — داچوون)مان هەیە. بەلای ئێمەوە هەر (نیشتاو) و (بەرزاو) بێت باشترە، چونکە (هەڵچوون) خەڵکی بە (انفعال)ی عەرەبی تێدەگات.

---

[1] ڕزگار کەریم، فەرهەنگی دەریا، بەرگی یەکەم، ل٤٨٩.

- القاعدة ----(بنار)(كۆڕ).

پێشنیاری زاراوەی (بنکە)ی بۆ دەکات، کە لە جێی خۆیەتی و زاراوەی (بنە)شمان هەیە.

- القوة العاملة ---- (دەستکارە)(کۆڕ).

زاراوەی (هێزی کارا)ی بۆ پێشنیار کراوە. کە بەڕاستری دەزانین لە(دەستکارە).

- رج ---- (ژاندن)(کۆڕ).

زاراوەی (ژەندن)ی بۆ پێشنیار کراوە، بە لای ئێمەشەوە (ژەندن) بە تەواو دەزانین.

ئەمە و چەندین زاراوەی دیکە، کە (ڕەئوف عوسمان) وەك هاوواتا بەرانبەر بەو زاراوانەی کە کۆڕ بۆ یەك واتا دایناون[*].

- (یوسف ڕەئووف عەلی)یش، سەبارەت لیستەی زاراوەکانی کۆڕ، هەندێك تێبینی و سەرنجی دەربڕیوە[1]. هەندێك لەوانەی جێی سەرنج بن دەیانخەینە ڕوو و ڕای خۆمانی لەبارەیانەوە دەردەبڕین:

١- الممكن --- شیاو (ل٤٤٤)(کۆڕ). بۆ (الممكن) وشەی (دەشێ، دەکرێ) دەتوانرێت بەکاربێت.

جدیر ----- شیاو (ل٨٩٠ لیستی دووەم)(کۆڕ).

---

[*] بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی ئەو باسەوە، بڕوانە:رؤوف عثمان، پێداچوونەوەیەك بە پەراوێزی...، گ (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٥٠).

[1] یوسف ڕەئووف عەلی، دەربارەی لیستەی زاراوەکانی کۆڕ، گۆڤاری (ئاسۆی زانکۆیی)، ژمارە (١٠)، بەغدا، ئابی ١٩٧٨، ل٩٢-٩٤.

کۆڕ لێرەدا دوو زاراوەی بۆ یەك وشە داناوە کە تەنیا (شیاو) بۆ (جدیر) لەبارترە.

٢- المرتجل---- سەرزارەکی(کۆڕ).

لە (ارتجال)ەوە هاتووە، وەك لە گۆڤاری کۆڕی ژمارە (یەك)دا بە واتای (سەرپێیی) تەواوترە لە (سەرزارەکی).

٣- التوجیه ---- ڕابەری(کۆڕ).

(ئاراستەکردن) بۆ (التوجیه) ڕاستە.

٤- الاسالیب التعلیمیة---- بەرنامەکانی پەروەردەیی(کۆڕل٤٦٤).

ڕەخنەگر ڕاست بۆ ئەوە چووە کە دەڵێت: نە(اسالیب) بەرنامەیە و نە (تعلیمی)یش پەروەردەییە، چونکە بەرنامە (منهج) دەگرێتەوە و (پەروەردە)ش، (تربیة) هەروەها لە لاپەڕە (٥٢٧) لیستەی چوارەم بەرانبەر (السیاسة التعلیمیة) سیاسەتی فێرکردن دانراوە.

٥- حجم الجماعة ---- چەندایەتی کۆمەڵ (کۆڕ).

(چەندایەتی) بۆ (کمیة)و (چەندێتی) بۆ (مقدار) بەکارهاتووە، ئەگەرچی ئەمیش هەر هەڵەیە و (حجم) قەوارە و بارستایی بۆ بەکاردێت، بۆیە (قەوارەی کۆمەڵ) بە باش دەزانین بۆ (حجم الجماعة).

٦- سوق کبیرة ---- فرۆشگە(کۆڕ).

هەر (بازاڕ) بەکاربێت باشترە، چونکە (فرۆشگە) بۆ (دوکان) یان هەر جێگەیەکی بچووك یان شت بفرۆشی دەتوانیٚ زاراوەی (فرۆشگە)ی بۆ بەکاربێنیت.

٧- ارتکاز ---- بەند(کۆڕ).

ڕەخنەگر ڕاستە، کە دەڵێت: (بەند) یەکێکە لە واتاکانی (ارتکاز)، بەڵام ئەم (بەند)ە، واتای جۆربەجۆری زۆرە و باس نەکراوە:

ا- بەند ---- - مسجون.

ب- بەند --- - فصل – فقرة.

پ- بەند ----- رزمە.

ت- بەند ----- دەبێتە پاشگر (کەمەربەند، ناڵبەند).

ج- بەند ------ بەستنی شتێك بە شتێکی ترەوە.

ح- بەند ------ لەگەڵ نیشانەی (ان)ی کۆ دەچێتە سەرهەندێ ناو، وەك: (خەنەبەندان، سەهۆڵبەندان).

٢٠- الأوعية الدموية ---- خوێنبەرەکان(کۆڕ).

ڕاست وایە بڵێین (خوێنبەر) بۆ (الشرايين) و (خوێنهێنەر) بۆ (الاوردة).

ئەمە هەندێ لە سەرنجەکانی (یوسف ڕەئووف عەلی) بوو سەبارەت بەهەندێ لە زاراوەکانی کۆڕ(*).

- لەبارەی چەند زاراوەیەکی کۆڕەوە، مەسعود محەمەد لە کتێبی (زاراوەسازی پێوانە)دا، ڕای خۆی بەرانبەر هەندێ لەو زاراوانەی کە کاتی خۆی پێشنیاری کردوون، دەردەبڕێت، دەڵێت: زۆر لە بارن، بۆ نموونە:

انتخاب هەڵبژاردن.

---

(*) بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی ئەو سەرنجانە، بڕوانە:

- یوسف ڕەئووف عەلی، دەربارەی لیستەی زاراوەکانی کۆڕ، گۆڤاری (ئاسۆی زانکۆیی)، ژمارە (١٠)، بەغدا، ئابی ١٩٧٨، ل٩٢-٩٤.

منتخب هەڵبژاردە.

ناخب هەڵبژێر.

استنباط هەڵێنجان.

تسامي هەڵکشان sublimation

حمل (لە منطق) هەڵگرتە.

موقف هەڵوەست.

واقع هەڵکەوت.

اندفاع هەڵپە.

تفكك هەڵوەشان.

مستنبط عقلي هۆش هەڵێنج.

ئەمە و چەندین وشەی تر کە مەسعود محەممەد بە گونجاو و لە باریان دەزانێت و کۆڕی زانیاری هەڵیبژاردوون و دایڕشتوون و دایناون[1].

د.کامیل بەصیر لە کتێبیی (زاراوەی کوردی)دا، زۆر بە کورتی باسی لە هەندێ کار کردووە کە تایبەتە بە زاراوەدانان. لە لاپەڕە (٢٧)ی کتێبەکەیدا، دەڵێت: لە کاتی خوێندنەوەی کارە زاراوەییەکانی کوردیدا زۆر جار تێبینی دەکەین، کە زاراوەکانیان لە ڕووی بابەتەوە تێکەڵ و پێکەڵن، ڕوونترین نموونە بۆ ئەم تێکەڵ و پێکەڵییە کتێبیی زاراوەی کارگێڕییە کە کۆڕی زانیاریی کورد دایناوە، ناونیشانی ئەم کتێبە هەروەکو بە ڕواڵەت لێی تێدەگەین بۆ زاراوەی کارگێڕی و فەرمان بردنە سەر تەرخان کراوە، بەڵام هاوکات زاراوەی جۆربەجۆری جیاوازیشی تێ

[1] مسعود محمد، زاراوەسازی پێوانە، ل٧٢-٧٣ .

ئاخنراوە، بۆ بەڵگە زاراوەی (کاوێژ) بە واتای (الاجترار)دێت، و هیچ پێوەندیەکی بە کارگێڕییەوە نییە[2].

د.کامل لەو هەموو کار و بەرهەمانەی کۆڕ کە بۆ دانان و داڕشتن و هەڵبژاردنی زاراوە داینراون و بە تایبەتی زاراوەی کارگێڕی؛ تەنیا یەك نموونەی هێناوەتەوە، ئەویش (کاوێژ)ە، ڕاستە کە پێوەندیی بە زاراوەی کارگێڕییەوە نییە، بەڵام کاتێك دەڵێت: ڕوونترین نموونە بۆ ئەو تێکەڵێو پێکەڵییە کتێبی زاراوەی کارگێڕییە، بەلای کەمەوە دەبوو چەند نموونەیەکی بهێنایەتەوە کە ببێتە بەڵگەی قسەکەی. هەروەها لە لاپەڕە (١١٢-١١٣) باسی کارەکانی کۆڕی زانیاری کورد دەکات، کە سەرکەوتوون، پاشان دەڵێت: لەو چوار لیستەیدا هەروەکو سەرنجمان داوە و سەرنجی دەدەین گەلێ زاراوە هەن کە لە شوێنی خۆیاندا نین و پڕ بە پێستی واتاکانیان دانەنراون و لە دیاردەی سەرپێیی و دوو واژەیی و لەنگی ڕزگاریان نەبووە، بەڵام لەبەر ئەوەی کۆڕ خۆیشی هەستی بەو کەموکووڕییە کردووە، بەڵگەشمان بۆ ئەم ڕاستییە بانگکردنی زانا و خوێندەوارە کوردەکانە بۆ چەسپاندنی ڕەخنەکانیان[1]. جاری پێش هەموو شتێك د.کامل باسی ئەو هەموو ناتەواوییە دەکات بێ ئەوەی یەك نموونەی بۆ لێدوانەکەی هێنابێتەوە، ئەمەش لە زانستدا پووچەڵ دەبێتەوە، پاشان کۆڕ لە کاتی زاراوەداناندا، کە دەست بۆ خوێندەوار و شوان و زانا و سەپان

---

[2] د.کامل بەصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٢٧-٢٨.

[1] هەمان سەرچاوە، ل١١٢-١١٣.

و ڕۆشنبیر... درێژ دەکات لە ڕوانگەی سوود وەرگرتنەوە، پاشان ئەوانە سەرچاوەی ڕەسەنی زاراوەی کوردین...

د.جەمال نەبەز، لە وتارێکیدا[٢] لە گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، چەند ڕەخنە و تێبینییەکی تۆمارکردووە، کە باسی:

١- شێوە پێکهاتنی کۆڕ.

٢- پلەی کارەکانی کۆڕ.

- هەڵەی زلە زلەی زمانەوانی.

- گۆڤاری کۆڕ.

- ڕێنووسی کۆڕ.

زاراوەکانی کۆڕ.......... دەکات.

لێرەدا ئەوەی پێوەندیی بە باسەکەی ئێمەوە هەبێت، ئەو ڕەخنانەیە کە لە بارەی (زاراوەکانی کۆڕ)ەوە، نووسیویەتی، ڕەخنەی لە هەندێ زاراوەکانی کۆڕ گرتووە و لە بەرگی یەکەمەوە تا بەرگی چوارەم ، لەم بەسەرکردنەوەیەدا تەنیا هەندێکی دەکەین بە نموونەی باسەکەمان و زۆر بە کورتی ڕای خۆمانی لە بارەوە دەردەبڕین:

د.جەمال، لەسەرەتای ئەو تێبینییانەی کە ئاڕاستەی زاراوەکانی کۆڕی کردووە باسی ئەوە دەکات کە خۆی بە یەکەم زاراوەنووس دەزانێت و ئاماژە بۆ بەرهەمەکەی دەکات بۆ سەلماندنی قسەکانی، کە بەلای ئێمەوە وانییە،

---

[٢] د.جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەكی تازە بەكارهاتوو و كۆڕی زانیاری كورد، گۆڤاری كۆلێجی ئەدەبیات، ژمارە (٢٢)، چاپخانەی (دار الجاحظ)، بەغدا، ١٩٧٨، ل٧٩-١١٥.

چونکە هیچ کاتێك نووسینی بەرهەم پێش چاپکردنی و بڵاوکردنەوەی نابێتە مێژووی ئەو کارە، وەك د.جەمال وادەبینێت، کە لەساڵی ۱۹۵۲-۱۹۵۳دا وەك هەوڵێك دەستی کردووە بە دانانی زاراوە[*].

بەلای ئێمەوە ئەم کارەی د.نەبەز بە کاری هەوڵی دانانی زاراوە دانانرێت، چونکە لە نووسین یاخود وەرگێڕانی هەر نووسراوێکدا بۆ سەر زمانی کوردی کۆمەڵێك زاراوە دێنە پێش نووسەر یاخود وەرگێڕ، کە دەبێ هەوڵی ئەوە بدەن بەرانبەریان بۆ بدۆزنەوە. هەر بەو جۆرە لە کتێبی (سەرەتای میکانیك و خۆماڵەکانی مادە)دا پێویستی، د.نەبەزی بۆ ئاوڕدانەوە لە زاراوە ڕاکێشاوە[1]، هەروەها لە لایەکی تریشەوە ئەگەر ئەو هەولانە بە بنچینەی دانانی زاراوە دابنێ، ئەوە بێگومان هەر بەتەنیا د.نەبەز هەوڵی نەداوە، بەلکو کەسانیتریش پێش ئەو هەوڵی وایان داوە، وەك کتێبی (دەستوری زمانی کوردی)ی تۆفیق وەهبی کە لە ساڵی (۱۹۲۹)دا بڵاوکراوەتەوە و گەلێ زاراوەی ڕێزمان بەدی دەکرێن و بۆ زۆربەیان وشەی لە بار و گونجاوی کوردی داناوە. نەك هەر ئەمەش بەلکو هەوڵی سەربەخۆش بە ئامانجی دانان و داڕشتن و دۆزینەوە و هەڵبژاردن و

[*] ناوبراو باس لە کتێبی (سەرەتای میکانیك و خۆماڵەکانی مادە) دەکات کە لە ساڵی ۱۹۵۷ تەواو بووە و لە ساڵی ۱۹٦۰ کەوتۆتە بەردەست خوێنەران...

[1] د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (۷۵)، بەشی (چوارەم)، بەغدا، تەمموزی ۱۹۷۹، ل٤٨.

وەرگێڕانی زاراوە لە زمانی کوردیدا دراوە. بە وێنە (فەرهەنگۆکی زاراوەی جەنگی رووسی – کوردی) کە، ڤ. نیکیتین ساڵی ١٩١٦ لە ورمێ بڵاوی کردووەتەوە، (فەرهەنگۆکی زاراوەی زانستی ئەرمەنی – کوردی) لە لایەن لیژنەیەکەوە دانراوە و ساڵی ١٩٣٥ لە یەریڤان لە چاپ دراوە، لیستەی ئەو زاراوە کۆمەڵایەتی و سیاسیانەی جەلادەت عالی بەدرخان، لە بەشێکی تایبەتی گۆڤاری (هاوار)دا لەژێر ناوی (فەرهەنگۆك)دا، تۆماریکردون، ئەو زاراوانەی عەلائەددین سەجادی لە گۆڤاری (نزار)دا و هەروەها ئەو زاراوانەی کە لە گۆڤاری (گەلاوێژ، ژین، دەنگی گێتیی تازە، هەتاو،...)دا خراونەتە بەرچاوی خوێنەران[1]، ئەم هەوڵانە پێش کارەکەی د.نەبەز دراوە و کارێکی مەزن بوون لەسەردەمی خۆیدا و تا ئێستاش سوود لە زۆرینەی زاراوەکانیان دەبینرێت. هەندێ لە تێبینییەکانی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

### ١- بەرگی یەکەم – بەشی یەکەم، ١٩٧٣، ل٤٢٣ – ٥٢٥.

- لە جیاتی (إستعلامات) (پرسگە) دانراوە. (إستعلامات) لە زمانی عەرەبیدا کۆ (جمع)ی (إستعلام)ە، بەڵام (پرسگە) جێی پرسی درایە. لەبەرئەوە (پرسگە) دەبێتە (محل الاستعلامات) یا (دائرة الاستعلامات) نەك (استعلامات) (ل٩٦-٩٧) (کۆلێجی ئەدەبیات).

جێی ئاماژەیە (د.نەبەز) خۆشی هیچ وشە و زاراوەیەکی بۆ (استعلامات) پێشنیار نەکردووە، تەنیا ئەوەیە لە ڕووی وەرگێڕانەوە

---

[1] د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، باڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٧٥) بەشی(٤)، ل٤٩.

سەیری زاراوەکەی کردووە، چونکە مەسەلەی زاراوە تەنیا وەرگێڕان نییە، بەڵکو گەڕان و دۆزینەوە و هەڵبژاردن و دانان و داڕشتن و...یشە، ئنجا کە لە شوێنێك دەنوسرێ (استعلامات) ئەوە مەبەست (شوێنی پرسین)ە.

ئەم چاوگە کە لە شێوەی کۆدایە بە تەنیا ناو نییە بۆ ئەو شوێنە، بەڵکو لە شوێنی (دائرة الإستعلامات)دایە. گەر گریمان (پرس) وەرگێڕانی وشەی (إستعلام)یش بێ شتێکی درووستە، چونکە (است) لە بابی (استفعال)دا، زۆر جار بۆ (طلب)ە، وەکو (استفهام) — واتە (طلب الفهم)،(استعلام) — (طلب العلم بشيء). کەوابوو لەگەڵ (پرس)دا یەك دەگرنەوە، چونکە (پرس)یش (طلب الفهم بشيء)ە، ئنجا (استعلام) کە ناوی واتایە (ئەبستراکتە) ڕاستە لەگەڵ (پرسگە)دا هاوڕێژە نین، چونکە (استعلام) ناوی واتا و چاوگە کە مانای کات و شوێن نادات، بەڵام (پرسگە) بەهۆی پاشگری (گە)ەوە بووە بە ناوی شوێن (شوێنی پرسین) — (مکان طلب العلم بشيء).

- بۆ (نقابة) (جڤات) دانراوە، کە وشەیەکی کرمانجیی ژووروو لە (جەماعەت) (جماعة)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە(کۆلێجی ئەدەبیات ل٩٧).

سەرەڕای ئەوە ئێستا بۆ (نقابة) وشەی (سەندیکا) جێی خۆی گرتووە، بەڵام د.نەبەزیش هیچ وشەیەکی پێشنیار نەکردووە..

- زۆر ڕاستە، کە دەڵێت:، بۆ (رصاص) (مز) دانراوە. جارێ (مز) ڕاست نییە، بەڵکو (مس) ڕاستە، ئەگەر بەتەنیابوو، بەڵام ئەگەر (مز) بوو بە بەشێك لە وشەیەك، وەك (مزگەری) ئەوا هێندێ جار دەنگی(س) دەبێتە (ز). دوایی (مز) بە عەرەبی (نحاس)ە، نەك (رصاص) (ل٩٧).

- بۆ (تعویض) (بژاردن) نووسراوە، (بژاردن) (تنقیح)ە، نەك (تعویض). (تعویض) بژاردنەوە)یە.(كۆلێجی ئەدەبیات ل٩٨).

ڕاستە (بژاردن) بە مانای (تنقیح) دێت، وەك كورد دەڵێت: (خانم برنج دەبژێری). جگە لە (بژاردن) هەروەها (بژار)یش بەكار دەهێنرێ، كە نە كۆڕ و نە د.نەبەز ناویان نەبردووە. جا هەر دوو وشە — (بژاردن) و (بژار) — بەرانبەر (تنقیح) دەوەستن، بەڵام هەریەكەیان بۆ شتێك، بە وێنە (بژاردن) بۆ (برنج و ساوەر و...) هەرچی (بژار)یشە بۆ (باخ و مەزرا و...)[1] هەروەها كورد زۆرجار (بژاردن) بۆ (تعویض) بەكاردەهێنێ وەك دەڵێت: (ئەگەر گەنمەكەم بسوتێنی پێتی دەبژێرم) لە لایەكی تریشەوە (بژاردنەوە) بۆ (تعویض) دادەنێت، ئەو پاشگرە دەلالەت لە دووپاتكردنەوەی (تعویض) دەكات. وەك ئەوەیە بڵێین (بردن) و (بردنەوە) كە بۆ دووپاتكردنەوەیە. ئەو هەڵە بچووكەی د.نەبەز تێی كەوتووە دەمانگەیێنێتە لێكدانەوەی دوو وشەی (ژماردن) و(بژاردن) كە لەیەكدی جیاوازن. ئەو هەڵەیەی تێی كەوتووە، ئەوەیە كە(هەمووی پێدەژمێرمەوە)ی كردووە بە نموونەی سەلماندنی بوونی زاراوەی (بژاردنەوە) بە واتای (تعویض) لێرەدا (دەژمێرمەوە) لە (ژماردن، ژمێردن)ەوە وەرگیراوە، نەك لە (بژاردن)ەوە[2].

---

[1] د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، با ڕێزی لێكۆڵینەوەی زانستی بگرین، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٧٥) بەشی (٤)، ل١٣.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٣.

## ٢- بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٤، ل٨٩٩- ٩٣٩:

- سەبارەت بە زاراوەی (الطبقة العامة) کە (چینی ڕەمەکی)ی بۆ دانراوە، باس لە زاراوەی (ڕەمەکی) دەکات و دەڵێت: لە کوردیدا بە مانای (عام) نایەت، بەڵکو بە مانای (فطري) و (غريزي) و (تطورنەکردوو) دێ، (ڕەمەکی) وێنەیەکی دی (ڕەوەکی)یە ئەمە ڕاستە کە (ڕەمەکی) بە واتای (عام) نایەت، بەڵام ئەویش هیچی پێشنیار نەکردووە و بوترێ (چینە گشتییەکان) گونجاوترە.

- ڕاست بۆ ئەوە چووە، کە دەڵێت: بۆ (مقياس) (پێودان) دانراوە. (مقياس) (پێوەر) دەگرێتەوە (کۆلێجی ئەدەبیات ل١٠١).

- بۆ (تسويق) (بازاڕکاری) دانراوە، کە (بازاڕ) وشەیەکی فارسی ڕووتە و کوردییەکەی (باژێڕ)ە (ل١٠١). بەلای ئێمەوە وشەی (بازاڕ) وشەیەکی فارسی نییە وشەیەکی هیندو و ئەورووپییە و هەر وشەی (بازاڕکاری) گونجاوترە لە وشەی (باژێڕ) کە لە کرمانجیی ژووروو بۆ (شار) بەکاردێت.

## ٣- بەرگی دووەم، بەشی دووەم، ١٩٧٤، ل١٧٠-٢١٨:

- بۆ (مباشر) (ڕاستەوخۆ) بەکارهێنراوە و بۆ (غير مباشر) (تيان) (کۆلێجی ئەدەبیات ل١٠٢). جێی خۆیەتی کە بۆ (غير مباشر)، (ناڕاستەوخۆ) بەکاربێنین.

- بۆ (جراح) (برینساز) و (برینگەر) دانراوە و لە شوێنێکیتردا (نژدار) بەکارهێنراوە (کۆلێجی ئەدەبیات ل١٠٢).

دیاره لێرە تەنیا ڕەخنەی ئەوەیە کە کۆڕ ئاماژەی بۆ زاراوەی (نژدار) نەکردووە، کە لە لایەن ئەوەوە دانراوە، بەڵام هیچی نەوتووە لە بارەی (برینساز) و (برینگەر) کە زۆر گونجاون بۆ (جراح).

- زۆ ڕاستە زاراوەی (لاکێشە) باشترین زاراوەیە بۆ (مستطیل) نەك (تەژە)(کۆلێجی ئەدەبیات ل١٠٣)، پاشان ئێستا لە فێرگەکاندا هەر وشەی (لاکێشە) بەکاردێت .

## ٤- بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٥، ل٥٠٦-٥٤٢:

- بۆ (اجرة مقطوعة) (وشکەمز) دانراوە، (وشکەمز) بەوە دەڵێن کە یەکێك کاری پێ بکەن و تەنیا ڕۆژانەکەی بدەنێ، بەڵام خواردنی نەدەنێ (کۆلێجی ئەدەبیات ل١٠٤)

بەلای ئێمەوە بۆ (اجرة مقطوعة) (کرێی بڕاوە) دابنرێت لە (وشکەمز) باشترە.

- بۆ (انعدام) (نەمان) دانراوە، ڕاستییەکەی، (انعدام) (نەبوون)ە، نەك (نەمان)(کۆلێجی ئەدەبیات ل١٠٤).

ئێمەیش وەك د.ئەوڕەحمان دەڵێت: نە ئەوەی کۆڕ و نە ئەوەی د.نەبەز بە ڕاست نازانین، چونکە ئاشکرایە (نەبوون) — (فقر، عوز)ە، نەك (انعدام)[1]. بۆ (إنعدام) لەناوچوون، لەکیسچوون، دابنرێت...

---

[1] د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)،ژمارە (٧٥) بەشی(٤)، ل١١.

## ٥- بەرگی سێیەم، بەشی دووەم، ١٩٧٥، ل٥٣٠-٥٥٣:

- بۆ (مائی) (ئاوەکی) دانراوە. (ئاوەکی) بە شتێك دەڵێن کە لە نێو شتێکی دیدا توابێتەوە و ونبووبێ. دەڵێن (مەڕەکە ئاوەکی بووە)(کۆلێجی ئەدەبیات ل١٠٤).

ئەمە ڕاستە و ئەویش د.نەبەز هیچ وشەی بۆ پێشنیار نەکردووە، کە بەلای ئێمەوە گەر (ئاوی) بە کاربێنین لەوانەیە گونجاوبێت بۆ (مائی) وەك (دەریایی) بۆ (بحری).

- بۆ (شراع) (بایەوان) نووسراوە و لە پاڵییەوە نووسراوە (ماوەیەکە بەکار دێ) و باسی نەکردووە(ل١٠٤). لێرەدا گلەیی ئەوەیە کۆڕ باسی د.نەبەزی نەکردووە کە ئەو زاراوەیەی درووست کردووە.

## ٦- بەرگی چوارەم، ١٩٧٦، ل٤٤٢-٤٧٩:

- بۆ (نظرية المعرفة) (دیمانە زانیار) دانراوە (کۆلێجی ئەدەبیات)ل١٠٥).

بەڕاستیش بۆ ئەوە نەچووە، چونکە دیمانە بۆ (نظرية) بەکاردێت ، بۆ (نظرية) (دیمانە) یان (گریمانە، بیردۆزە) لە جێی خۆیەتی و (زانیار) ئەگەر لێرەشدا بگونجێ ئەوا (عارف) دەگرێتەوە نەك (معرفة)، کەواتە بوترێت (دیمانە زانیارییەکان) لەوانەیە گونجاوبێت، کە د.نەبەز خۆی هیچی بۆ پێشنیار نەکردووە.

- ڕاستە (سەپاندن) و (سەلماندن) بۆ (الحكم) ڕاست نی یە (کۆلێجی ئەدەبیات ل١٠٥)، چونکە (سەپاندن) (فەرزکردنە) و (سەلماندن)یش

(ئیسپاتکردنه) هەر وشەی (حوکم) وەك خۆی بمێنێتەوە، یان وشەی (أمر) بەکاربێت باشترە کە بەواتای (فەرمان) دێت.

- لێرەدا زۆر بە جوانی بۆ ئەوە چووە، کە دەڵێت: بۆ (الزاهد) (نەویست) و بۆ (الزهد) (نەویستی) دانراوە، (الزاهد) ئەو کەسەیە کە پشتی کردبێتە دنیا و دنیای نەوێت. لەبەرئەوە (الزاهد) (دنیانەویست) دەگرێتەوە نەك (نەویست) هەروەها (الزهد) (دنیانەویستی) دەگرێتەوە (کۆلێجی ئەدەبیات ل١٠٥).

- ڕاستە (نەیار) بە مانای (الخصم) دێت و بۆ (العنادیة) دەست نادات (کۆلێجی ئەدەبیات ل١٠٦)، بەڵام (ڕکەبەرایەتی) گونجاوترە.

- ڕاستە (هۆگری) بۆ (الانتماء) زۆر لە جێی خۆی نییە (کۆلێجی ئەدەبیات)ل١٠٧)، بەڵام واتای (إنتماء)ی بە عەرەبی ڕوون کردووەتەوە، کە بە (إنتساب) و (عائدیة) دێت و وشەیەکی کوردیشی بۆ پێشنیار نەکردووە، سەرەڕای ئەوەی کە (هۆگری) بە مانای (ألفة)دێت. بەلای ئێمەوە بۆ (الانتماء) وشەی (سەربەچییەتی) یان (سەربە...) گونجاوترن.

## ٤- زاراوەکانی لیژنەی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ):

لیژنەیەك لە گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) کۆمەڵێك زاراوەی سەر بە (حساب) و (هندسة) و (مثلثات) لە لایەن مامۆستایان: ئەبوبەکر هەوری، جەمال جەلال، جەمال ئیبراهیم، ئەحمەد هەردی، عوسمان عارفەوە دانراون و داڕێژراون... ئەم کارەش نزیکەی (٦٠٠) زاراوەیەك دەبێ شێوەی

ڕێکخستنی عەرەبی - کوردیە[1]. سەبارەت بەم زاراوانەی لیژنە د.جەمال نەبەز بە زنجیرە وتارێك[1] (زاراوەکانی لیژنەی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) هەڵدەسەنگێنێت و کۆمەڵێك کەموکورتیی ئەو زاراوانە باس دەکات و لەگەڵ زۆربەی زاراوەکاندا بیروبۆچوونی جیاوازی هەیە. ئێمە لەم بەسەرکردنەوەیەدا تەنیا مشتێك دەکەین بە نموونەی باسەکەمان و زۆر بە کورتی لە چەند خاڵێکدا کورتیان دەکەینەوە:

د.جەمال سەرەتای وتارەکەی بەوە دەست پێدەکات،کە کۆڕێکی زمانەوانی چۆن درووست بکرێت و هەندێ بنەمای لەو بارەیەوە داناوە، دوایی هاتووەتە سەر جۆری دانان و درووستکردن و دارشتنی زاراوەی زانستی و (شەش) خاڵێکی لەو بارەیەوە داناوە و هەندێ نموونەشی بۆ هێناوەتەوە، پاشان باری سەرنج و ڕەخنە و تێبینییەکانی بەم شێوەیە دەربڕیوە:

---

[1] لیژنەی زاراوەکانی بیرکاری، گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)، ژمارە (٥)، ساڵی (١)، سلێمانی، ١٩٦٠، ل٥٩-٦٦.

ژمارە (٦)، ساڵی (١)، سلێمانی، ١٩٦٠، ل٧٩- ٨٧.

[1] د.جەمال نەبەز، زاراوەی لیژنەی (ریاضیات) لەژێر وردبینی لێکۆڵینەوەدا، گۆڤاری (ڕۆژی نوێ):

بەشی یەکەم، ژمارە (٦)، ساڵی (١)، سلێمانی، ١٩٦٠، ل١٠٢-١٠٩.

بەشی دووەم، ژمارە (٧)، ساڵی (١)، سلێمانی، ١٩٦٠، ل١١٢-١٢١ .

بەشی سێیەم، ژمارە (٨)، ساڵی (١)، سلێمانی، ١٩٦٠، ل٨٥- ٩١ .

بەشی چوارەم، ژمارە (١١)، ساڵی(١)، سلێمانی، ١٩٦١، ل١٠٦- ١١١.

**تێبینییەکانی ژمارە (٦)ی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ):**

- لیژنە بۆ (التناسب الطردي) (دووڕێژەی یەکسا)ی داناوە و بۆ (التناسب العکسي) (دووڕێژەی پێچا)ی داناوە، د.جەمالیش پاش ڕوونکردنەوەی بیروبۆچوونەکانی خۆی لە بارەی (تناسب) و (طردي) دەڵێت: (گونجانی ڕاستەوخۆ) بۆ (التناسب الطردي) و (گونجانی پێچەوانە) بۆ (التناسب العکسي). بەلای ئێمەوە هەردوو زاراوەکەی د.جەمال بە گونجاوتر دەزانین و کورتترە لەو دوو زاراوەیەی تر.

- لیژنە (ماوە)ی بۆ (باقي) و بۆ (زمن) و بۆ (مدة) بەکارهێناوە.

نابێت لە زاراوەسازیدا وشەیەك یان زاراوەیەك بۆ زیاتر لە یەك واتا دابنرێت، وەك د.جەمال دەڵێت: پێویستە جیاوازی لە نێوان زاراوە و وشەکاندا هەبێت و بۆ (باقي)یش یان (پاشماوە) یان (دواماوە) دابنێین، (ماوە) لەجیاتی (زمن) و (مدة) بەکاربێنین، لە کاتێکدا بۆ (زمن) و (مدة) و (وقت) چەند وشەیەکمان هەیە وەك (چاخ، کات،...). بەلای ئێمەوە بۆ (باقي) هەر وشەی (پاشماوە) گونجاوترە.

تێبینییەکانی ژمارە (٧)ی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ):

- لیژنە بۆ (ژمارەی سادە) مانای (العدد البسیط)ی بەکارهێناوە، بۆ (ژمارەی ئاوێتە) (العدد المرکب)ی بەکارهێناوە.

د.جەمال تێبینییەکەی سەبارەت بە وشەی (ئاوێتە)یە و دەڵێت: کە(بسیط) بۆ (سادە) دانراوە، باشتر وایە بۆ (مرکب) بڵێین (ناسادە) نەك (ئاوێتە)، بەلای ئێمەوە بڵێین بۆ وشەی (المرکب) وشەی (ئاوێتە)

بەكاربێنین، چونكە دەمێكە لەوانە زانستییەكانی وەك كیمیا و فیزیا (مركب) بە (ئاوێتە) بۆ كوردی وەرگیراوە.

- لیژنە بۆ (القسمة) (بەشكردن)ی داناوە و بۆ (خارج القسمة) (بەركەوت)ی داناوە.

د.جەمال (بەركەوت) كە بۆ (خارج القسمة) دانراوە بەهەڵە دەزانێ و دەڵێت: بۆچی نەڵێین (سەرەنجامی بەشكردن) بۆ (خارج القسمة) هەروەها بەلای ئێمەشەوە (بەركەوت) (حصة)ی عەرەبی دەگەیەنێ، بە وێنە وەك ئەوەیە كە (٤) دینارت بەركەوتبێت لە كۆی (٨) دینار.

هەروەها لیژنە وشەی (بەش)ی لە (ل٨٣)دا، داناوە بۆ (سهم وحصة) وەك (سهم) و (حصة) هەردووكیان یەك واتا دەبەخشن..

- لیژنە بۆ (نسق) (پێودان)ی داناوە. د.جەمالیش دەڵێت: (پێودان) لە كوردیدا نییە و (پێودانگ)ە، (پێودانگ) ڕاستە، بەلام گەر سەیری هەندێ لە فەرهەنگەكان بكەین دەبینین لە فەرهەنگی (هەنبانە بۆرینە)دا بەم شێوەیە هاتووە:

پێودان: ١- ئەندازە، ٢- ڕێوشوێن و دەستوور (ل١٣٦).

(پێودانگ: پێودان(ل١٣٦)، بەلام لە فەرهەنگی دەریا (نسق) بە (ڕێكوپێك، پێودان، ڕازانەوە، ڕێگە شێواز، ڕژێم، ڕەوش، دەستوور (ل١٤٤٣). هاتووە، بەلام ڕاستییەكەی (پێودانگ)ە.

- لیژنە بۆ (طريقة الوحدة) (یەكەڕێ)ی بەكارهێناوە، كە ئەمە گونجاو نییە بۆی، بەلكو بوترێ (ڕێگای یەكە، یان ڕێی یەكە) نەك (یەكەڕێ)، بەلای ئێمەوە (یەكەڕێ)بە گونجاو دەزانین.

- لیژنە بۆ (متوازي الاضلاع) (باسك تەریب) و بۆ (متوازي المستطیلات) (لاكێشی تەریب)ی داناوە، كە بەلای ئێمەوە وشەی (لاكێشەهاوڕێك) یان (لاكێشی هاوڕێك) گونجاوترە.

دوای ڕوونكردنەوە د.جەمال وشەی (پەل هاوڕێك) بۆ (متوازي الاضلاع) دادەنێ و دوای قرتاندنی (ە)ەكەی (هاوڕێك) دەبێتە (پەلاورێك) و دەلێت: زۆر سووكتر و ڕاستر و جوانترە لە وشەی (باسك تەریب)، بەلای ئێمەوە (پەل هاوڕێك) بێت خۆشترە لەسەر زمان، پاشان دەلێت: (تەریب لاكێشی) بۆ (متوازي المستطیلات) باشترە لە (لاكێشی تەریبی)، لێرەدا د.جەمال جارێ دەلێت: (هاوڕێك) بۆ (متوازی)یە و بەلام لە (متوازي المستطیلات) گەڕاوەتەوە سەر (تەریب) كە ئەم دوو لایەنییە لە زانستی زاراوەدا نابێت.

- لیژنە بۆ (كشاند- توند – التوتر – الشد)ی داناوە.

د.جەمال دەلێت: جارێ (كشاند) لە كوردیدا هەر نییە، ئەمە ئەوە دەگەیێنێ بەهیچ شێوەیەك نەبێت، بەلام بەلای ئێمەوە وانییە و (كشاند) وەك فرمانێكی تێپەڕ كە لە بنەڕەتدا تێنەپەڕ بووە (كشان) وەك دەلێی (كشام، كشایت، كشا،...) كەواتە (كشان) هەیە، ئەگەر تەنانەت بۆ (التوتر)یش ڕاست نەبێت، بەلام بۆ (بسط – شد) لە عەرەبیدا هەمان شتە بەم واتایانە دێت (ڕاكێشان، كرژبوون، توندبوون، ئالۆزبوون، پێدادان)فەرهەنگی دەریا(ل١٥). سەبارەت بە وشەی (توند) ڕاست دەكات، كە واتایەكی گشتیی هەیە و واتای زۆری هەیە و ئەوەی د.جەمال بە ڕاست نازانین.

تێبینییەکانی ژمارە (٨)ی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ):

- لیژنە بۆ (الاساس) (بنچینە، بنواشە) و بۆ (الاس) (وا)ی داناوە.

بەڵێ ڕاستە (الاساس) (بنچینە)یە و بەڵام بۆ (الاس) کە جیایە لە (الاساس) ئێستا لەهەموو فێرگەکاندا (توان) بەکاردێت، ئەمەش لەگەڵ بۆچوونەکەی د.جەمال یەك دەگرێتەوە.

- لە ڕووی دەستوورەوە، وەك د.جەمال دەڵێت:، وشەی (ڕاستەقینە) بۆ مانای (حقیقة)ی عەرەبی ڕاست نییە، بەڵکو (حقیقة) مانای (ڕاستی) یان (ڕاستییەتی)یە.

کاتێ کەسێك دەڵێت: (حەقیقەتی) شتەکە وایە، بە مانای (ڕاستی)ی شتەکە وایە و بەڵام (ڕاستەقینە) مانای (حقیقی)یە، نەك (حقیقة).

- لیژنە بۆ (محدب) (دەرپەڕیو)ی داناوە.

د.جەمال دەڵێت: هەموو شتێکی دەرپەڕیو مەرج نییە (محدب)بێت، و وشەی (کووڕ) باشترە بۆ (محدب) بەلای ئێمەوە وشەی (کووڕ) بۆ (محدب) نابێت، چونکە (احدب)ی عەرەبی دەگرێتەوە و یان (دەرپەڕیو) بەکاربێت یان (قۆقز) گونجاوترە.

- لیژنە بۆ (الادخار) (کۆکردنەوە)ی داناوە.

(ادخار) بە مانای (کۆکردنەوە) نایەت، بەڵکو (پاشەکەوت) لە جێی خۆیەتی و ڕاستە پاشەکەوتکردنی شتێك بە مانای کۆکردنەوە دێت، بەڵام دەبێ جیاوازی لە نێوان (جمع) و (ادخار)دا بکرێت پاشان لە لاپەڕە (٦)ی ژمارە (٥)یدا بۆ (عملیة الجمع) (کۆکردنەوە)یان بەکارهێناوە.

- لیژنە بۆ (العدد المقابل للوغارتیم) (ژمارەی بەرابەری لۆگاریتم)ی داناوە.

جاریَ پێش هەموو شتێك (بەرابەر) بۆ (مقابل) بە ڕاست نازانین، چونکە ئەو ناوبەندانەی لە لێکدانی وشەی کوردیدا هاوبەشی دەکەن (بە، او، لە، و، ە، ەو، ان..) کەچی وشەی (بەرابەر) بەم شێوەیە پێك هاتووە: (بەر + ا + بەر) بە پێی ئەمە بێت دەبێت ناووبەندی (ا)مان هەبێت لە زمانی کوردی دا، کە دەزانین ناوبەندی (ا)مان نییە دوو وشە لە یەك بدات، و پاشان بۆ نەڵێین (بەرانبەر) کە لە (بەرامبەر)یش زۆر ڕاسترە، لە لایەکی تریشەوە (بەرابەر) یان بۆ (معادلة) بە کارهێناوە، لێرەش بۆ (مقابلة) بەکارهاتووە، کە ئەمەش نابێت، چونکە سەر لە خوێنەر دەشێوێنێت.

- لیژنە بۆ (المعادلة القیاسیة) (بەرابەری نموونە)ی داناوە، کە واتا ناپێکی، چونکە (بەرابەر) (معادلة) نییە و (نموونە)ش (نموذج)ە. لیژنە خۆیشی لە (ل٥٩)ی ژمارە (٥) (نموونە)یان بە (نموذج) داناوە، هەروەها د.جەمالیش هیچ وشەیێك یان زاراوەیەکی پێشنیار نەکردووە، کە بەلای ئێمەوە (هاوکێشەی پێوانەیی)ی بۆ (المعادلة القیاسیة) زۆر گونجاوە.

تێبینییەکانی ژمارە (١١)ی گۆڤاری (ڕۆژی نویَ):

- لیژنە بۆ (القیاس الدائري، الطریقة الدائریة) زاراوەی (بازنەپێوان)ی داناوە.

د.جەمال دەڵێت: (قياس الدائرة) (بازنە پێوان)ە. واتا (پێوانەی بازنە)، بەڵام (القياس الدائري) (پێوانەی بازنەیی) دەگرێتەوە، نەك (بازنە پێوان).

- لیژنە بۆ (الطريقة الطبيعية، القياس الطبيعي) (پلە پێوان)ی داناوە.

ئەمەش بە هەمان شێوەی ئەوەی سەرەوە (پلە پێوان) بۆ مانای (قياس الدرجة) دێت، نەك (القياس الطبيعي) بۆ (القياس الطبيعي) (پێوانەی ئاسایی/ سروشتی) ڕاستە.

- لیژنە بۆ (بسط) (سەرە) و بۆ (مقام) (ژێرە)ی داناوە.

لەبەرئەوەی ئەو دوو زاراوەیە واتایەکی گشتییان هەیە، کەواتە وەك د.جەمال دەڵێت: (سەرهێڵ) بۆ (بسط) و (ژێرهێڵ)یش بۆ (مقام) بەکاربێنین باشترە، پاشان بۆ سووککردن لەسەر زمان دەتوانین بڵێین (سەرێل) (ژێرێل).

- لیژنە بۆ (توحيد المقامات) زاراوەی (یەك ژێر)ی داناوە.

د.جەمالیش دەڵێت: (یەککردنی ژێرەکان) یان (یەککردنی ژێریلەکان)، بەلای ئێمەوە (یەکگرتنی ژێر)یان (ژێریەکگرتن) بەکاربێنین بۆ (توحيد المقامات).

- لیژنە بۆ (القيمة) زاراوەی (بایەخ)ی داناوە.

لیژنە لە جێگەیەکی تردا بۆ (القيمة الاسمية) (بەهای ناوبراو)ی دانابوو، کە بەلای ئێمەوە (بایەخ) بۆ (إهتمام) دەست دەدات، (بەها) بۆ (القيمة) بەکاربێت ڕاستە.

- (بەش دراو) بۆ (مقسوم عليه)ی ڕاست نییە و (بەسەرابەشکراو) یان (لێبەشکراو) واتای (مقسوم عليه) دەگرێتەوە.

- لیژنە بۆ (المنحرف) زاراوەی (لادەر) و بۆ (شبه المنحرف) (نیمچەلادەر)ی داناوە، کەچی د.جەمال دەڵێت: بۆ (المنحرف) وشەی (گیرەك) دابنێین و بۆ (شبه المنحرف) وشەی (نیمچە گیرەك)، بەلای ئێمەوە (منحرف – مائل) بە زۆر واتا دێت، (چەماوە، لار، خوار، کەچ، خێچ، لادەر) بۆیە وشەی (لادەر) بۆ (منحرف) و (نیمچە لادەر)یش بۆ (شبه منحرف) بەکاربێت .

## ٥- فەرهەنگی زانیاری و هەندێ سەرنج:

کەمال جەلال غەریب، دەورێکی باڵای لە بواری فەرهەنگ و دانان و وەرگێڕانی زاراوەی کوردیدا هەیە (فەرهەنگی زانیاری)یەکەشی گەواهیی ئەوەی بۆ دەدات[1]. ئەم کارەی کەمال جەلال غەریب، (فەرهەنگی زانیاری) بە گشتی وشە و زاراوەی زانستی لە بابەت (پزیشکی و توێکاری و نەخۆشییەکان و گیاندار و ڕووەك و خواردەمەنی و زکماکی و کیمیا و بیرکاری و ئەندازیاری و ئەستێرەوانی و جیۆگرافی و کشتوکاڵ...)ەوە تۆمارکردووە.

[1] کەمال جەلال غەریب، فەرهەنگی زانیاری (عەربی – ئینگلیزی – کوردی)،
بەرگی یەکەم،چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٤.
بەرگی دووەم،چاپی یەکەم ، بەغدا، ١٩٧٩.
بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٣.

بێجگە لەم کارە، کەمال جەلال غەریب، ئەم کارانەشی لە بواری فەرهەنگ و زاراوەدا بە ئەنجام گەیاندووە:

**- فەرهەنگی زانیاری، گۆڤاری (پەروەردە و زانست):**

بریتییە لە کۆمەڵێ ناوی گیا و گوڵ و درەخت و میوە لە شێوەی فەرهەنگۆکێکی عەرەبی – ئینگلیزی کوردی دا ڕێك خراوە[1].

- فەرهەنگی زانیاری وێنەدار (عەرەبی – ئینگلیزی – کوردی):

کۆمەڵێك وشە و زاراوەی زانیاریی لە بابەت گیاندار و ڕووەك و ئامرازەکان و فیزیا و کیمیا و ئەستێرەوانی لەخۆ دەگرێت، کە بەقەبارەی (١٠٢) لاپەڕەی گەورەیە و نزیکەی (١٥٠٠) زاراوەیەك دەبێت[2].

**- القاموس العلمی، گۆڤاری (کاروان):**

ئەم کارەی (١٠٧) زاراوەی زانستین لە مەودای (الصخور المعدنية والأحجار الكريمة – کەڤرە کانزاییەکان و بەردە بەنرخەکان)ەوە. شێوەی ڕێکخستنی عەرەبی – ئینگلیزی – کوردییە و لەبەشە کوردییەکەیدا شیکراونەتەوە[3].

---

[1] کەمال جەلال غەریب، فەرهەنگی زانیاری، گۆڤاری (پەروەردە و زانست)، ژمارە (١٥)، بەغدا، ١٩٧٩، ل٤٨–٥٠.

[2] کەمال جەلال غەریب، فەرهەنگی زانیاریی وێنەدار (عەرەبی – ئینگلیزی – کوردی)، چاپخانەی (الاجیال)، بەغدا، ١٩٧٥.

[3] کەمال جەلال غەریب، القاموس العلمي، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٤)، هەولێر، کانوونی دووەم ١٩٨٣،ل١٠٣–١١٢.

- فەرهەنگی مامۆستا، گۆڤاری (دەنگی مامۆستا):

ئەمەش فەرهەنگۆکێکی زاراوەی عەرەبی — کوردییە، نزیکەی (٥٠) زاراوەیەکی سەر بە تەندرووستی و ڕووەك و ئاژەڵ و کیمیا و فیزیایە[١]...

- ئەمانە هەندێ لەو بەرهەمانەن، کە (کەمال جەلال غەریب) نووسیونی و دەست ئێمە کەوتوون. سەرەڕای ئەوەش هەندێ تێبینی و سەرنج دەربارەی (فەرهەنگی زانیاری)ەکەیەوە لە لایەن (عەبدولکەریم شێخانی)ەوە نووسراوە، کە لە گۆڤاری (کاروان)دا بڵاوبووەتەوە[٢].

تێبینییەکانی عەبدولکەریم شێخانی تایبەتن بە بەرگی سێیەمی (فەرهەنگی زانیاری)ی کەمال جەلال غەریب، ئەمانەی خوارەوە نموونەی هەندێ لەو سەرنجانەن:

لاپەڕە وشە و واتاکەی، کە بەم شێوەیە ڕێکخراوە:

ل١١: (أنثى الذئب): گورگی مێ.

تائەندازەیەك ئەمە ڕاست نییە، بەڵام دەتوانین بۆ مێیەی گورگ (گورگە مێ) بەکاربێنین، بەڵام وەك ڕەخنەگر دەڵێت: بە کوردی بە مێیەی سەگ و گورگ و ورچ دەڵێن (دەڵ) یان (دێڵ) و بە نێرەکەشیان دەگوترێ (گۆڵ). دەڵێن دێڵە سەگ، دەڵە ورچ، دەڵە گورگ. تەنانەت بۆ مەیموونیش دەگوترێ دێڵە مەیموون، گۆڵە مەیموون.

---

[١] کەمال جەلال غەریب، فەرهەنگی مامۆستا، گۆڤاری (دەنگی مامۆستا)، ژمارە (٢)، ساڵی (١)، سلێمانی،١٩٧١، ل٤٠-٤١.

[٢] عبدالكريم شێخانی، فەرهەنگی زانیاری و چەند تێبینییەك، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٣٤)، ساڵی (٣)، هەولێر، تەمموزی ١٩٨٥، ل٢٦-٣٥.

ل١٥: (ذبابة جنية): مێشە پەری.

مێشە جنۆکە ڕاستە، چونکە پەری = حوریە.

ل١٦: (ذبابة الضان):مێشی لووت

ڕەخنەگر نووسیویەتی (مێشەمەڕ) ئەمە هەڵەیە، ڕاستییەکەی (مێشی لووت)ە، مێشە مەڕ جۆرە مێشێکە کرمۆکەکەی لە بۆشاییەکانی ناوچەوانی مەڕدا دەژی[1]. لەگەڵ ئەوەشدا وەك ڕەخنەگر دەڵێت: مێشە مەڕانە ڕاستە، بە تایبەتی کە لە لاپەڕە (١٣)دا وشەی (مێشە کەرانە) هاتووە، یان دەڵێین مێشە سەگانە.

ل٢٦: (ذعرة): سۆفیلکە. بەلای ئێمەشەوە هەڵەیە، چونکە (کلاوکوڕە) لەهەندێ ناوچەدا (سۆفیلکە)یە، کە بەعەرەبی پێی دەوترێت (قبرة).

ل٥٦: (راشح): پالاوتە، پالێو، پاڵفتە.

ڕەخنەگر دەڵێت: هەرسێ واتاکە هەڵەن، چونکە (راشح) ناوی بکەرە دەکاتە (پالێوەر) واتە شتی دیکە دەپالێوێ و ئەو شتەی لە ئەنجامی پالاوتنەکە پەیدا دەبێت دەبێتە پالاوتە، نەك ئەوەی شتەکە دەپالێوێ.

ل٥٧: (راعي الغنم):شوان، شوار، چوپاڵ، بەرخەوان. لێرەدا وەك ڕەخنەگر دەڵێت:، وشەی (بەرخەوان)ی لەگەڵ ئەو وشانەی تر ڕیزکردووە، کە هەموو دەزانین (بەرخەوان) جیاوازە لەگەڵ (شوان). هەروەها دوای چەند دێڕێك هەر لەو لاپەڕەیەدا لە (راعي الطليان)یشدا هاتووە و واتاکەی نووسراوە. هەروەها بۆ (راعي المعز) نووسراوە شوانی بزن. ڕەخنەگر سەبارەت بەمە دەڵێت: ئەوەی بە گشتی مەڕ و بزن بلەوەڕێنێ،

---

[1] کمال جلال غریب، فەرهەنگی زانیاری، بەرگی سێیەم، ل١٦.

پێیدەڵێن (شوان)، بەڵام ئەگەر تەنیا بەرخ بلەوەڕێنێ پێی دەڵێن (بەرخەوان) هەروەها (کارەوان) و (بزنەوان) و (گاوان)... یشمان هەن.

ل٦٠: (راكب): سوار، ڕێبوار، ڕەوك.

تەنیا وشەی (سوار) زۆر ڕاسترە لە دوانەکەی تر.

ل٦٧: (ربح): قازانج، قانجاز، قانزاج، سوود، دەرامەت. تەنیا تێبینی لەسەر وشەی (دەرامەت) هەیە، کە دەڵێت: مەرج نییە، دەرامەت قازانج بێت. لەبەرئەوە وشەکانی تر بۆ (ربح) ڕاستترن.

ل٨٢: (ردیء): گەند، گەن، خراو، خراپ، ناپەسەند، پەژمووده.

ڕەخنەگر (پەژمووده) بەهەڵە دادەنێت، چونکە بە مانای سیس و ژاکاو دێت.

ل٩٩: (رضاعة، ارضاع): شیرخواردن، مەمك خواردن.

لێرەدا (رضاعة) و (إرضاع) دوو واتای جیاواز دەدەن ڕاستە (رِضاعة) بە واتای (شیرخواردن) یان (مەمك خواردن) دێت، بەڵام (إرضاع) بە مانای (شیرپێدان) یان (مەمك پێدان) دێت، یەکەمیان چاوگی فرمانی (رضع)ەیە و دووەمیان چاوگی فرمانی (أرضع).

ل١١٣: (رقوء، مرقی): خوێن وەستێنەر.

ڕاستەکەی (خوێن وەستێن)ە، هەروەها (خوێن گیرسێن) ڕاسترە لە (خوێن گیرسێنەر).

ل١٦٣: (زايكوت متحرك): زایگۆتی جووڵاوە.

(بزێو) له جیاتی (جوولاوه) بەکاربێت باشتره، چونکه (جوولاوه) لەوانەیە تەنیا جارێك جوولابێ، بەلام (بزێو) جێ بەخۆی ناگرێ و هەر دەجوولێتەوە.

ل۲۰۰: (زلطخ): شەیتانۆکە.

له هەندێ ناوچەی کوردستان (قاقله جنۆکه) و (هێلکەشەیتانۆکە)شی پێ دەڵێن.

ل۲۰۹: (زنبیل): زەمبیله، بەرچنه.

ڕەخنەگر تێبینییەکەی له جێی خۆیدایه، که دەڵێت: زەمبیله لەگەڵ بەرچنه لێك جیان، بەرچنه (سەبەته، سەوه، قەرتاڵه)یەکی بچووکه، له شوو (شووڵ)ی دار بی درووست دەکرێت، بەلام زەمبیله له گەلای دارخورما (تافاڵ) درووست دەکرێ و دەسکی هەیه.

ئەمەو چەندین تێبینی تر، که عەبدولکەریم شێخانی له بارەی ئەو بەرهەمەی کەمال جەلال غەریب نووسیونی و سەرنجی لەسەر تۆمار کردوون و لێرەدا توانرا هەر باسی ئەوەندەی بکرێت.

## ٦- زاراوە زانستییەکانی کۆڕ:

سەبارەت بە زاراوە زانستییەکانی کۆڕ، ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی، لە گۆڤاری (کاروان)دا هەندێ سەرنج و تێبینی خۆی لەو بارەیەوە تۆمار کردوون و ئاماژەی بۆ هەندێ لەو زاراوانە کردووە[1] و مەسعوود محەمەدیش هەر لەو گۆڤارەدا وەڵامی ئەو ڕەخنانەی ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی داوەتەوە[1]. لێرەدا دەمانەوێت ئاماژە بۆ هەندێك نموونەی ئەو تێبینی و ڕەخنانە بکەین، چونکە ئەگەر یەك بە یەکی ڕەخنە و تێبینییەکانی بەسەر بکەینەوە، کات و ئەرکێکی زۆری دەوێت. بەم شێوەیەی خوارەوە تێبینییەکانی ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی دەست پێدەکات:

ل٧: لەسەر بەراوردی زمانە پێشکەوتووەکان (شێوەپەروەر)مان دانا بۆ (صوری) عەرەبی و (شێوەپەروەرایەتی)یش بۆ (الصورية)...

بەر لەوەی کە – شێوە – بە باڵای – (Form)ی ئینگلیزی بگرین، پێویستە لە جەرگەی کوردییەوە بۆی بچین:

---

[1] ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی، نرخاندنێك دەربارەی (زاراوە زانستییەکان)، گۆڤاری (کاروان):

بەشی یەکەم، ژمارە (١، هەولێر، تشرینی یەکەم ١٩٨٢، ل٦٩-٧٢). =

بەشی دووەم، ژمارە (٢)، هەولێر، تشرینی دووەم ١٩٨٢، ل٤٤-٤٨.

بەشی سێیەم، ژمارە (٣)، هەولێر، کانوونی یەکەم ١٩٨٢، ل٤٦-٥١.

[1] مسعود محمد، خۆدیتنەوە لە دوو ڕەخنەی دۆستانەدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٧)، هەولێر، نیسانی ١٩٨٣، ل٤١-٥٠.

أ- شێوە ⁄ لە کوردیدا – بە فراوانتر لقی هاویشتووە و بە مانای (شکل، روخسار، بیچم، دیمەن).

ب- صورة ⁄ لە (وێنە، ڕواڵەت)دا سوورگایەکی بۆ خۆی دابین کردووە.

پ- پەروەر. پەروەرش ⁄ بە مانای – پەرستن، هۆگری، خۆشەویستی، خزمەتگوزاری، ڕۆیشتووە، وەك: دادپەروەر، ئاین پەروەر، دادپەرست، منداڵ پەروەر، نیشتمان پەروەر، کورد پەروەر... هتد. لە ئەنجامدا دەڵێت: بەڕای من (ڕواڵەت) بۆ (مظهر، شکل، صورة) بمێنێتەوە، کەواتە بگوترێ:

١- الصوری = ڕواڵەتی.

٢- الصورية، الصوريات = ڕواڵەتایەتی.

لە وەڵامدا مەسعود محەممەد، دەڵێت:... وشەی شێوە پتر لە (وێنە – ڕواڵەت) هۆگری (بابەت) دەبێت، چونکە (ڕواڵەت) ڕووکەشێکی بێ بایەخە (وێنە)ش بەلای شکڵی ناو ئاوێنە و کامێرادا دەچێتەوە (form)ی ڕۆژاوایش نە ڕواڵەتە و نە وێنە. ئنجا ئەگەر نیو هێندەی (ڕواڵەت و شێوە) چاوپۆشی لە کەرتی دووەمی زاراوەکە بکەین ئەوسا (شێوەپەروەرایەتی) گەلێك بەولای (ڕواڵە تاییەتی و ڕواڵەتی) واتای (خۆپێوەبەستەوە) دەگەیەنێ کە لە ئەسڵی زاراوەکەدا مەبەستێکی بنەڕەتییە.

- لە بارەی (مذهب) کە کۆڕ (ڕاڕەو)ی بۆ داناوە و ڕەئوف ئالانی زاراوەی (ڕێباز) بە باش دەزانێ بۆ (ڕاڕەو) و مەسعود محەمەدیش دەڵێت: (ڕاڕەو) هەر چونکە لە واتادا بەر تەسکترە لە (ڕێگا – ڕێباز) پتر دێتە ڕەوایێ بۆ واتای (مذهب فلسفي) کە، ئەویش بۆ خۆی باریکە ڕێگەیەکە.

بەلای ئێمەشەوە هەر (مەزهەب) بنووسرێت، چونکە زۆرینەی خەڵکەکە لێی تێدەگات و پاشان زاراوە بۆ خەڵك دادەنرێت نەك بۆ چەند کەسانێکی تایبەتی.

- لە بارەی زاراوەی (گومانگر) کە بۆ (متشكك) دانراوە، ڕەئوف ئالانی دوای ڕوونکردنەوەی بۆچوونەکانی وا پێشنیار دەکات بۆ (متشكك) (گوماندار) بنووسرێت و دەڵێتیش: مەبەستم ئەوە نییە کە بڕیاری لیژنەکە بە ڕاست دا نەنێم... بەڵام (متشكك) و ئەو زاراوەیەی کە هەمان واتا ڕابگەیەنیێ، ئاوەڵناوی کارای تێنەپەڕە.

مەسعود محەمەد دەڵێت: لەگەڵ ڕوونکردنەوەی مامۆستا ئالانیش من هەر لایەنگیری (گومانگر) دەبم نەك (گوماندار)..کەرتی دوای (گومان)یش چ (گر) بێت و چ (دار) هەردوویان تێپەڕن، هەروەك دەگوترێ باجگر دەشگوترێ پارەدار و مڵکدار و زەویدار.. ئەم پاشگرە (دار) لە (داشتن – داشتەن)ی فارسییەوە هاتووە کە (مضارع)ەکەی دەبێتە (دارد) و ناوی کارای لیٚ پێك دێت و دەبێتە (...دار).

- بێگومان باسی (ی) نیسبی و (ی) مەعنەوی خۆی لە خۆیدا باسێکە زۆر جار جۆرە تێکەڵاویەکی تێدا ڕوو دەدات، ڕەئوف ئالانیش کە لە کۆتایی (ل٧٠-٧٢)ەوە باس لەو (ی) نیسبی و مەعنەوییە دەکات. هەندێك تێکەڵی لە کارەکانیدا ڕوویداوە و هەندێك ئەو نموونانەی کە ئەو لە (ل٧١-٧٢)ی ژمارە یەکی (کاروان) بۆ نیسبەتی داناون بەشی زۆریان هی ناوی مەعنەوین وشەکانی: (بران، هاوبەش، وشەسازی، داماوی، سەپانی، کەڵەگایەتی، هەرزەکاری، جودایی، لاوی، گەنجی، ئازایەتی،

لاوێتی، گەنجێتی) هەموویان ناوی مەعنان و پێوەندییان بە نیسبەتەوە نییە لەمەشدا ڕوون دەبێتەوە کە م.ئالانی هەردوو (ی) مەعنەوی و نیسبەتی تێکەڵ کردووە.

مەسعود محەمەد پاش ئەوەی بە دوور و درێژیی هەموو لایەنەکانی (ی) نیسبەت و مەعنەوی ڕوون کردەوە تیشکی خستووەتە سەر ئەو تێبینیانەی ڕەئوف ئالانی، پاشان لە جێگەیێکی تری وتارەکەیدا و سەبارەت بە (ی)ی ناوی مەعنا، دەڵێت:

لە کوردیدا (ی) ناوی مەعنا هەر بەو وشانە دەوێرێ بیانکاتە ناوی مەعنا کە ئاوەڵناون و وەسفی مادەکە دەکەن نەك خۆیان مادەن، وەك: جوان، جوانی — شیرین، شیرینی — ناسك، ناسکی — دزێو، دزێوی(ل٤٤). بێجگە لەمەش سێ ئامرازی دیکەی بۆ دارشتنی ناوی مەعنا داناوە، کە ئەمانەن:

- ەتی ---------- پیاو، پیاوەتی/ برسی، برسییەتی....
- ایی ---------- بەرزایی شاخەکە/ سەوزایی گیایەکە...
- ایەتی--------- خزمایەتی، دۆستایەتی، مەردایەتی...

ڕەئوف ئالانی لە کۆتایی (ل٧١)دا، دەڵێت: (ڕێژگەی نیسبەت) لێرەدا (ڕێژگە) ناوی شوێنە، وەك(ئێستگە، شەڕگە، لەوەڕگە،...) هەرچی وشەی (ڕێژە)یە بۆ (صیغة) دەست دەدات.

سەبارەت بەوەی ڕەئوف ئالانی لە (ل٧٢)دا، و لە خالّی (د)، دەڵێت: نێرەك — لە سوانەوەدا بزوێنەکەی دەڕوا، وەك: نێرکەپیاز، نێرکەڕێواس، نێرکەکاردوو... هتد.

واتە: نێرەك = نێرك + ە = نێوبەند + کاردوو = نێرکەکاردوو (ل٧٢).

بەڵام وەك مەسعود محەمەد دەڵێت: لە وشەی (نێرکەپیاز)دا بەشی یەکەمی وشەکە لە (نێرەك)ەوە نەهاتووە، بەڵکو لە(نێرتك)ەوە سواوە، بەئەسڵ (نێرتکەپیاز و دەستکە قۆڕاوە، بووە (ل٤٥). پیرەکان تا ئێستاش لە هەندێ جێگادا هەر (نێرتك) و (دەستك) بەکاردێنن و لە گوندەکانی سەر بە شاری کەرکووك و سلێمانی و دەوروپشتی و زۆرینەی خەڵك (نێرك) بەکاردێنن. ئەمە سەبارەت بە هەندێ لەو تێبینیانە بوو کە لە ژمارە (١)ی گۆڤاری (کاروان) لە لایەن ڕەئوف ئالانییەوە دانرابوو، پاشان لە ژمارە (٢)ی هەمان گۆڤاردا هەندێ تێبینی تری خستۆتە ڕوو، کە ئەمەش هەندێ لەو تێبینیانەیەتی بە کورتی:

- تحصيل الحاصل = قسە کاوێژکردنەوە.

ئێمەش وەك ڕەئوف ئالانی وشەی (کاوێژکردنەوە) بۆ زاراوەیەکی زانستی بەگونجاو نازانین و لە جێی خۆی نییە، بەڵام م.ئالانی زاراوەی (قسەڕستنەوە)ی پێباشە و مەسعود محەمەد، دەڵێت: بۆ هەر مەبەستێك بێ (قسە ڕستنەوە) بەجێترە لە (قسە کاوێژکردنەوە).

- الترابط = هاودەنگی.

بەلای ڕەئوف ئالانییەوە (هاوبەندی) کە لە جێی خۆیەتی بۆ (الترابط) دابنرێت و مەسعود محەمەدیش، دەڵێت: ڕەنگە (هاوبەندی) لە (هاودەنگی) بۆ (ترابط) لەبارتر بێت.

- المنطق = ژیربێژەکی.

ڕەئوف ئالانی پاش هەندێ ڕوونکردنەوە، لەم بارەیەوە پێشنیاری ئەوە دەکات، کە بۆ:

المنطق = ژیربیژی = لۆجیك.

المنطقي = ژیربیژانە.... دابنرێت

مەسعود محەممەدیش دەڵێت: (ژیربیژی) بۆ هونەر یا زانستی (منطق) و (ژیربیژ) بۆ کەسێکی(منطق زان) بێ و (ژیربیژەکی) بۆ نیسبەن وەلای (ژیربیژ) و (ژیربیژیەکی) بۆ نیسبەت وەلای (ژیربیژی)کرە ناکەن. هەرچی (ژیربیژانە)یە ئاوەڵکارە ، وەك بڵێی: ژیربیژانە دەدوێ/کوردانە دەپۆشێ/مەردانە هاتەکایەوە (ل٤٥).

- تصنيف = دابڕین.

ڕەئوف ئالانی پاش هەندێ ڕوونکردنەوە، وا بە باش دەزانێ، کە بۆ (تصنيف) زاراوەی (پۆلاندن) بەکاربێت، کە بەلای ئێمەوە وا دەبینین لە جێی خۆیەتی و مەسعود محەممەدیش دەڵێت: ئەگەر (پۆلاندن) بۆ (تصنيف) بێتە دەستووری داتاشینی (کار) لە (ناو) خزمەتێکی گەورە بە زمانەکەمان دەکات، هەرچەندە لە (پۆلاندن)یشدا هەر واتای کۆ و کۆمەڵ و ئاپۆرە وەردەگیرێ نەك واتای (جۆرجۆر و خوار و ژوور) کە لە (صنف)ی عەرەبی و (class)ی ئینگلیزی وەردەگیرێ. هەروەها هەندێ کەسان بۆ (تصنيف) (پۆلێن کردن)یان داناوە، کە ئەمەش هەڵەیە، چونکە زاراوەی (پۆلێن) و (پۆلێنکردن) بەرانبەر (التصنيف) یەکێکە لەو زاراوانەی باش دروست نەکراوە، چونکە پاشگری (- ێن) کە دەچێتە سەر ناو بە زۆری ناوی یاری پەیدا دەبێ، وەك: (هەڵماتێن، تۆپێن،

هەلووکێن، میزراحێن، کلاوکلاوێن،... هتد)، بەلام سەیر ئەوەیە هەندێ زمانەوان زاراوەی (کارپۆلێنکردن) بەکار دێنن، وەك بلێی یاری کردار دابەشکردن بکەن[1]. ئێمە لە زمانی کوردیدا بۆ (تصنیف) وشەمان زۆرن، وەك (دابەشکردن، دابڕین، دەستەبەندی، بابەتبەندی،...) تارادەیەکیش (پۆلکردن) لەگەڵ هەڵکەوتی زمانی کوردیدا دەگونجێ. لەلایەکی تریشەوە ئەوەی جێی سەرنج بێت، جارجار (پۆلێن) بە بێ کرداری (کردن) دەبینرێ، وەك: (ئەم جۆرە پۆلێنە بووەتە هۆی...)، (پۆلێنەکەی مامۆستا فلان)، (پۆلێنێکی تەواوە...) ئەمەش هێندەی دی بەکارهێنانی زاراوەکەی نابەجێ و ڕەزا قورس کردووە[1].

- کۆکەرەوە = الجامع.

ڕەئوف ئالانی بۆچوونی خۆی لە بارەی ئەوەوە دەربڕیوە و هاتووەتە سەر ئەوەی،کە دەڵێت: بۆ:

کۆگر = جامع / کۆنەگر = مانع دابنرێت مەسعود محەممەد دەڵێت: ئەگەر (کۆگر) بە (جامع) وەربگیرێ (کۆنەگر) نابێتە (مانع)، دەبێتە ئەو شتەی هەندێکیان دەگرێ و هەندێکیان ناگرێ، بۆ ئەوەی ببێتە پێچەوانەی (کۆگر) دەبێت بگوترێت (هیچ نەگر) ئەوساش (هەمووگر) پەسەندتر،

---

[1] د.ئەورەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی و خەوشی هەندێ وشە و زاراوەی نوێ، ل٢١–٢٢.

[1] د.ئەورەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی و خەوشی هەندێ وشە و زاراوەی نوێ، ل٢٢.

دەبێت لە (کۆگر)، بەڵام (هیچ نەگر) هەر لە بەرانبەر (کۆگر، هەمووگر)دا دەسازێ نەخۆ (مانع) (هیچ نەگر) نییە.

- علم الجمال = زانستی جوانی.

وەك چۆن بە (علم الدلالة) دەوترێت (واتاناسی) دەتوانین بۆ (علم الجمال)یش بڵێین (جوانناسی) یان (جوانزانی) لەسەر قالبی (زیندەوەرزانی).

لێرەدا تێبینییەکانی بەشی دووەمیش تەواو، کە مەسعود محەممەدیش تا ئێرە سەرنجی خۆی دەربڕیبوو، ئێستاش دێینە سەر هەندێك لە تێبینییەکانی دووا بەشی وتارەکەی:

- الضبط = ڕێك هێنان.

ڕەئوف ئالانی زاراوەی (دابین) بەگونجاو دەزانێت و دەڵێت: بۆ (ضبط) (دابین کردن) و بۆ (انضباطیة = دابینی) گونجاوە. بەلای ئێمەوە سەرەڕای ئەوەی کە (پێکهێنان) بە باش دەزانین، بەڵام زاراوەیەکی ترمان هەیە بۆ (انضباط) کە هەر بە واتای (ضبط)دێت، ئەویش وشەی (زاکوون) وەك دەڵێی (لیژنەی زاکوونی کولێژی پەروەردە).

- (اللاادریة) کراوە بە (نازانم کاری).

ئەوەی گوێی لەم زاراوەیە بێت زاراوەی (گەچ کاری)ی دێتە بەر گوێی و لێی تێناگا.

بەرانبەر بەو زاراوانە وەك ڕەئوف ئالانی دەڵێت: باسوود لەم زاراوانە وەربگرین (خۆنەزانکاری، نەویست زانی).

- مذهب المصادفة او الاتفاق = ڕاڕەوی ڕێکەوتەکیەتی.

ڕەئوف ئالانی دەڵێت: ڕێکەوتە ڕێباز یان ڕێبازی ڕێکەوتایەتی نە مەبەست لە دەست دەچێ و نە دەم و زبانیش تووشی بار قورسی دەبن، بەلای ئێمەوە بوترێت (ڕێکەوتە ڕاڕەوی) یان (ڕێبازی ڕێککەوتەکی).

- إختبارات الاتجاهات والميول = ئەزموونەکانی بەریان و وازان.

ڕەئوف ئالانی هەر یەك لە وشەکانی ڕوونکردۆتەوە، بەڵام هیچ زاراوەیەکی پێشنیار نەکردووە، بەلای ئێمەوە، بڵێین (تاقیکردنەوەی بەریان و ئارەزووان)، چونکە (إختبارات) لەهەموو جێگەیەکدا بە واتای ئەزموون نایەت.

- إختبارات إستخلاص الحقائق - ئەزموونەکانی وەدەستهێنانی ڕاستیان.

ڕەئوف ئالانی پێشنیار دەکات، کە بوترێت (ئەزموونەکانی ڕاستی وەدەستهێنان) لەبەرئەوەی کوڕ دەقاودەق لە عەرەبییەوە وەریگێڕاوە، بەلای ئێمەوە بوترێ (تاقیکردنەوەکانی بەدەستهێنانی ڕاستی).

لە بەرهەمێکیتردا کە لە بارەی زاراوە زانستییەکانی کۆڕەوە، نووسراوە، جەمال عەبدول لە گۆڤاری (ڕوشنبیری نوێ)ی ژمارە (١٢٣) هەندێك تێبینی و سەرنجی لەو بارەیەوە تۆمار کردووە[1]، کە یەکەم جار زاراوەکانی کۆڕی نووسیوە، ئەوجا تێبینییەکانی خۆی دەربڕیوە، ئەمانەش هەندێکن لەو تێبینییانە:

---

[1] جەمال عەبدول، چەند سەرنجێك دەربارەی نامیلکەی (زاراوەی کوردیی زانستەکان)ی کۆڕی زانیاری عێراق– دەستەی کورد –، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٢٣)، بەغدا، ١٩٨٩،ل٨٤–٩٤.

ل۳:

- گوڕسەندن تعجیل Acceleration

دەڵێت: (گوڕ) هێز و تەوژم دەگرێتەوە، بۆیە (تاودان) گونجاوترە.

گەر چاوێك بە فەرهەنگێکی (عەرەبی – کوردی)دا بخشێنین، دەبینین (تعجیل) بە مانای (تاودان، گوڕسەندن، خێراکردن، دەستوبرد، پەلەکردن) (فەرهەنگی دەریا ل۱۱۹) دێت مەرج نییە هەر (تاودان تەواوبێت).

-گۆشە هاوتەکەکان زوایا متبادلە Adjadent Angles

ڕەخنەگر دەڵێت: جاریٚ واتا عەرەبییەکەی (زاویتان متجاورتان) یان (زوایا متجاورة) دەگرێتەوە، ئەو کاتەش ڕەنگە (گۆشەهاوسێکان) گونجاوتربێت. بەلای ئێمەوە بۆ (زوایا متبادلة) زاراوەی (گۆشە بەرانبەرییەکان) بە گونجاو دەزانین.

- ئەندازەی شیکارەکی الهندسة التحلیلیة Analytical Geometry

(ئەندازەی شیکاری) گونجاوترە.

ل٤:

- ژماردن الحساب Arithmetic

(ژمێرە) بۆ (حساب) بە کارهێنراوە، (ژماردن) (عد) دەگرێتەوە.

- ناهاودیتمەیی لاتناظر Asymmetry

ئەم زاراوەیە هەر بە کوردی ناکات، پاشان (ناڕێکی، ناهاوتایی، ناچوونیەکی) هەرسێکیان مانای (لاتناظر) و (لاتناسق) دەگەیێنن.

- هاوشانی پێچەوانە مختلف التوازي Anti Parallet

(مخالف التوازي) دەگەیەنێ و ئەویش بە واتای (تەریب پێچەوانە) یان (دژە تەریب) دێت.

دەتوانین (دژەهاوشان) بەکاربێنین.

- ڕێکخستنی هەورازی ترتیب تصاعدي Ascemaung Order

(بەرەوژوور ڕیزکردن) یان (بەرەوژوور ڕێکخستن)یان (هۆنینی بەرەوژوور) بەکاربێنین.

ل٥:

- هەڵمژ ممتص Absorbent

ڕەخنەگر دەڵێت: (مژە) یان هەر (مژ) کورتتر و سادەتر و عەرەبییەکەشی (ماص)ە نەك (ممتص)، بەلای ئێمەوە (مژە)یان (مژۆك) تەواوترە لە (مژ)، چونکە (مژ) بەواتای (مص) دێت.

- پێکهێنی بەکار مرکبة فعالة Active Componemt

ڕەخنەگر دەڵێت: (پێکهێنی کارا) یان (پێکهێنی چالاك) ڕاسترە. بەلای ئێمەشەوە هەر وشەی (پێهێنی کارا) بەباشتر دەزانین.

ل٦:

- تاوی لووزەو شدة التيار Amperaye

ئەگەر (تینی لووزەو) یان (تینی تەزوو) بێت، وەك ڕەخنەگر دەڵێت: (لووزەو) و (تەزوو) هەر بە (تیار)دێت.

- دەرك فتحة Aperture

بەلای ئێمەشەوە (دەرك) بۆ (فتحە) گونجاو نییە و ڕەخنەگر ئاماژە بۆ (کون) و (گوزەر) کردووە، بێجگە لەمانەش وشەی وەك (دەلاقە، دەروازە،

کەلێن، دەرواز، کون، دەرچە)مان هەیە (فەرهەنگی دەریا ل٨٥١). بەلای ئێمەوە وشەی (کەلێن / دەروو)یش گونجاوە.

ل٧:

- بنیاتی گەردیلەیی ترکیب ذري Atomic Structure

ڕەخنەگر (پێکهاتنی گەردیلەیی)ی بۆ داناوە کە لە جێی خۆیەتی.

ل٨:

- سەنگ و کێشی دارایی الميزانية المالية Finantial

ئەو زاراوەیەی کۆڕ دوور و درێژە و (تەرازووی دارایی) ڕەخنەگریش وەرگێڕانی دەقاودەقە، بەلای ئێمەوە (بودجەی دارایی) بەڕاست دەزانین.

- کۆکەرەوە (پاتری) نضيدة Battery

ڕەخنەگر دەڵێت: (خانکۆ) ڕاستە و بەلای ئێمەشەوە هەر (پاتری)بەکاربێت باشترە، چونکە زۆرینەی خەڵك لێی تێیدەگەن یان زاراوەی (خانەلان).

- گرتۆك کابح Brake

ڕەخنەگر دەڵێت: (دابینە، دابینۆك) باشترە لە (دابینکردنەوە). بەلای ئێمەوە ئەم وشانە پێوەندییان بە (کابح)ی عەرەبییەوە نییە، (گرتۆك)یان (گرۆك) لە جێی خۆیەتی.

- سەرئاوکەوتن طفو Buoyamcy

بەلای ئێمەوە (طفو) بە مانای (سەرئاوکەوتن) دێت نەك (کەوتنەسەر) کە مانای (وقع على) دێت.

ل٩:

جمینی چەمەرەکی حرکة دائرية Cincular Motion

ئەوەی ڕەخنەگر تەواوە، کە دەڵێت: (جووڵەی بازنەیی) یان (چەمەرەیی) باوترە.

- بەرامی خاچی جدار اتجاهي Cross praduct

(خاچە لێکدان) باشترە.

ل١٠:

- پەستران انضغاط Compression

لەگەڵ ڕەخنەگر یەك دەگرینەوە لە (پەستێوران) بۆ (انضغاط) و(پەستێراو) بۆ (مضغوط).

ل١١:

- گەرمۆڵە حراري، سعري Caloric

(گەرمۆکە) بۆ (calorie) یان (calory) بەکارهێنراوە...

(گەرمۆکەپێو) بۆ (calorimeter) لە جیاتی(گەرمۆڵەپێو) باشترە یان (گەرمۆك/گەرمۆکپێو).

- لێکدان تصادم Collision

(لێکدان) بۆ (تصادم) نابێت، وەك ڕەخنەگر دەڵێت: (ضرب) و (تضارب) دەگرێتەوە. (پێکداکەوتن، بەیەکداکەوتن، پێکدادان) بۆ (تصادم) گونجاوە...

ل١٢:

- بروسکە کوژ مانع الصواعق Conductor lightning

ڕەخنەگر دەڵێت: (بروسکەگر) و (بروسکەبڕ)ی بەڕاست داناوە، بەلای ئێمەوە (بروسکەگر) واتای (مانع الصواعق) ناگەیەنێ، (بروسکە بەند)بە پێوانەی (گوللەبەند) بە تەواو دەزانین.

- گواستنەوە حمل Conrection

بەلای ئێمەوە گواستنەوە بۆ (حمل) نابێت، بەڵکو (هەڵگرتن) گونجاوترە.

ل١٣:

- دوورایی مسافة Distamce

(دووری) زیاتر بۆ (بعد، بعید) بەکاردێت، بەڵام (ماوە)یان (مەودا) تەواوترە.

ل١٥:

١- هەڵ هێنك مولد تیار مستمر Direct

ڕاستە (هەڵ هێنك) بۆ (مفقس – generator) دەشێت. ڕەخنەگر (لووزەوی بەردەوام) یان (یەکبینە پێکهێن)ی بۆ داناوە. بەلای ئێمەوە (پێکهێنەری تەزووی بەردەوام) بۆ (مولد تیار مستمر) بەگونجاو دەزانین.

ل١٦:

- هەڵهێنەری کارەبا مولد کهربائی Dynmic

ڕەخنەگر دەڵێت: ، جارێ (Dynumo) (مولدە)یە نەك (Dynamic) جا ئەگەر داینەمۆ بێ (پێکهێن) یان پەیداکەر باشە، ئەگەر (داینەمیك) بێ ئەوا چالاکی چوستی، جووڵەیی باشە بۆی...)، بوترێت (خەرۆکی یەکبینەلووزەو/بخەرۆك) یان (مووەلیدە).

- هاوکێشی توازن Equilibrium

(هاوسەنگ) بۆ (توازن) زۆر لە جێی خۆیەتی (هاوکێشی) بۆ (متعادل) دەبێت، (هاوکێش)بۆ (توازن) گونجاوە.

ل١٧:

٢- دەنگ دانەوە صدى Echo

ڕەخنەگر دەڵێت: (زایەڵە) بۆ (صدى) باشترە، (دەنگ دانەوە)ش بۆ (رنین) بەو پێیەش (زایەڵە پێو) بۆ (مقیاس الصدى) لە جیاتی (دەنگ دانەوە پێو). بەلای ئێمەوە (دەنگ دانەوە) یان (زایەڵە) بۆ (صدى) درووستە و بۆ (رنین) (زرنگانەوە، لەرینەوە) گونجاوە.

ل١٨:

- گەیاندنایەتی کارەبا توصيلة كهربائية Electrical conductivity

(کارەبا گەیاندن) یان (کارەبا گەیێنیێ) باشترە.

ل٢١:

- قەڵشان، قەڵشێن انشطار Fission

بەلای ئێمەوە (کەرتبوون) تەواوترە، چونکە (قەڵشان، قەڵشێن) درزبردن دەگرێتەوە و (انشطار) دووکەرتبوون و لێك جیابوونەوەی شتەکەیە، یان وشەی (پەرتبوون) بەکاربێت.

- شلاو مائع Fluid

ڕەخنەگر دەڵێت: زاراوەي (شلگاز) بۆ (مائع) زۆر لە جێی خۆیەتی بۆ (مائع) لەبەرئەوەی (مائع)(شل) و (گاز)یش دەگرێتەوە، بۆیە هەر وشەی (شلاو) بۆ (مائع) لەجێی خۆیەتی.

ل٢٢:

- تیۆروانەی گرۆکان نظرية الزمرة Group theory

ڕەخنەگر کۆمەڵێ وشەی جۆراوجۆری پێشنیار کردووە (گرۆبیردۆز)، (کۆمەڵەبیردۆز)، (بیردۆزی کۆمەڵە)، (بیردۆز)، بەلای ئێمەوە (دیمانەگرۆ) بە گونجاو دەزانین بۆ (نظرية الزمرة).

ل٢٣:

- کێشە گەردیلەی گرامی وزن غرامي Gram atom

وەك ڕەخنەگر دەڵێت: (گەردیلەیی گرامی) یان (گەردیلە کێشی گرامی) ڕاستە، بەلای ئێمەشەوە (گەردیل کێشی گرامی) بە گونجاو دەزانین.

ل٢٤: - ناوبڕەی گەرمی، دابڕەی گەرمی عازل حراري Heat insulator

ڕەخنەگر دەڵێت: (گەرمی بڕە) ڕاستە، بەلای ئێمەوە (گەرمی دابڕ)یش ڕاستە.

- گەرمی لکاندن حرارة الامتزاز Heat of adsorption

(لکاندن)(التصاق)ە، ڕەخنەگر دەڵێت: (ڕوومژە) یان (ڕوومژین) بۆ (امتزاز) ڕاستە. کەواتە بڵێین (گەرمی ڕوومژە) یان (گەرمی ڕوومژین). گونجاوترە.

لە لاپەڕە(٨٧- ٩٢)ی وتارەکەی جەمال عەبدولدا تێبینیەکانی سەبارەت بە لاپەڕەکانی نامیلکەی زاراوە زانستییەکانی کۆڕ، لە (ل ١٩ — ٤٣) زۆرینەی تەنیا سەبارەت بە شێوەی ڕێکخستنی دەستووری زمان، یان پاشوپێشکردنی هەندێ وشەیە، بۆیە بە باشمان زانی تەنیا ئەوەندە

نموونەیەی بۆ ئەم ڕوونکردنەوەی سەرنج و تێبینیانەی جەمال عەبدول هێناومانەتەوە بەسبێت.

بێجگە لەم بەرهەمانە، جەمال عەبدول چەندین بەرهەمی تری لە بواری زاراوە و زاراوەسازیی کوردییەوە هەیە و ڕۆڵێکی باشی لە دانان و داڕشتن و وەرگێڕانی زاراوەی کوردیدا هەیە و (فەرهەنگی کیمیا) و (فەرهەنگی زیوار) و فەرهەنگی (شەوکار) هەروەها چەند وتارێکی لەم لاو لەولا لە گۆڤارەکاندا بڵاوکردووەتەوە بەناوی (بیردۆزی گشتیی زاراوەدانان و یەکخستنی و تۆمارسازی) لە ژمارە (١)ی گۆڤاری (وەشت) و (زاراوەسازی و زانستاندنی زمانی کوردی) لە ژمارە (٧)ی گۆڤاری ئەکادیمی کوردی و هەروەها کتێبێکیشی لەو بوارەدا بەناوی (بەرکولێکی زانستە زاراوەسازی کوردی) هەیە و لە ٢٠٠٨ چاپی دووەمی بڵاوکرایەوە .

## ٧- زاراوەکانی (نەقابەی مامۆستایان لە سلێمانی) زاراوەی زانستی کوردی:

(نەقابەی مامۆستایان لە سلێمانی) لە دانان و داڕشتنی زاراوەی زانستی کوردیدا، هەوڵێکی باشیان لەو بوارەدا داوە و توانیویانە لەو زاراوانە بکۆڵنەوە و زاراوەی گونجاویان بۆ دابنێن[1]. لەگەڵ ئەوەشدا کە

[1] نەقابەی مامۆستایان لە سلێمانی، زاراوەی زانستیی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠.

ئەمە کارێکی ئاسان نییە و گیروگرفتی زۆرە و لە کەموکووڕی بەدەر نابێت.

لقی نەقابەی مامۆستایان لە سلێمانی بەرهەمی ئەو لیژنانەی کە بە پێی فەرمانی بەڕێوەبەرێتی گشتی زانیاری کوردی پێکهاتبوون بۆ دانانی زاراوەی زانستیی کوردی لەم کتێبە (١٠٤) لاپەڕەییەدا چاپ کردووە. ئەمەش بریتییە لە بەرهەمی پێنج لیژنە:

١- لیژنەی زاراوەی زانستی.

٢- لیژنەی زاراوەی ڕێزمان و ئەدەب.

٣- لیژنەی زاراوەی پەروەردەی نیشتمانی.

٤- لیژنەی زاراوەی بیرکاری.

٥- لیژنەی زاراوەی کارگێڕی و ڕامیاری.

تێکڕا نزیکەی (٢) هەزار زاراوەیەك دەبێت، شێوەی ڕێکخستنی عەرەبی — کوردییە.

لە گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)ی ژمارە (١٢)، غەفوور ڕەشید، هەندێ سەرنج و تێبینیی لە بارەی ئەو کارەی (نەقابەی مامۆستایانی سلێمانی)یەوە نووسیوە و ڕاوبۆچوونی خۆیانی لە بارەیەوە وتووە[١]، کە تایبەتە بە زاراوەکانی بەشی جوغرافیای ئەو کتێبەی نەقابەی مامۆستایانی سلێمانی، کە هەندێکیان دەکەینە نموونەی باسەکەمان:

---

[١] غەفوور ڕەشید، سەرنجێك لە پەڕاوی زاراوەی زانستی کوردی، گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)، ژمارە (١٢)، ساڵی (١)، سلێمانی، ١٩٦٠، ل٢٧-٣٠.

- نەقابە بۆ وشەی (الجنوب) وشەی (خواروو) کە واتای (أدنی) یان (سفلی) دەبەخشیٚ داناوە، بەلاٚم وشەی (باشوور)مان هەبیٚت بۆ وشەی (خواروو) بەکاربیٚنین.

- نەقابە بۆ وشەی (المساحة) وشەی (پیٚوان)یان بەکارهیٚناوە کە هەموو کەس دەزانیٚت (پیٚوان) مانای (قیاس)ە نەك (المساحة)، ڕەخنەگر دەلیٚت:(ڕووگە) ڕاسترین وشەیە بۆ (المساحة) یان زاراوەی (ڕووپیٚو)یش تاڕادەییٚك بۆ (المساحة) گونجاوە بەلای ئیٚمەوە (ڕووگە) (اتجاه)ی عەرەبی دەگەیەنیٚت و (ڕووپیٚو)یش (مساح) دەگەیەنیٚت.

- سەبارەت بە زاراوەی (قطب) نەقابە وشەی (قطب)یان وەك خۆی بەکارهیٚناوە و لە لایەکی ترەوە (تەوقەسەر)ی بەکارهیٚناوە کە زاراوەییٚکی زۆر ناقۆلاٚیە، چونکە زاراوەی (تەوقەسەر) دەمانباتە جیٚگە و واتاییٚکی تر وەك (تەوقەی سەر کچان)...، بەلاٚم ڕەخنەگریش هیچ زاراوەییٚکی پیٚشنیار نەکردووە. بەلای ئیٚمەوە بۆ زاراوەی (القطب) لە بواری جوگرافیادا، زاراوەی (جەمسەر) زۆر لە جیٚی خۆیەتی، وەك بلیٚیی (جەمسەری باکوور — القطب الشمالي / جەمسەری باشوور — القطب الجنوبي...) لە لای ئەندازیارانیش (قطب) بریتییە لە خالیٚك یان چەقیٚکی جیٚگیر لەسەر بازنەیەکی خولاو بە دەوری خۆیدا.

- نەقابە بۆ زاراوەی (الحواجز الجغرافية) زاراوەی (کەلەبەری جوغرافی) بەکارهیٚناوە، بەلاٚم ڕەخنەگر ڕاست بۆ ئەوە چووە،کە دەلیٚت: (کەلەبەر) پیٚچەوانەی (الحواجز)ە، بەلکو (حاجز) بە مانای (چەپەر، دیوار، پەرژین، پەردە)یە، (کەلەبەر) مانای دەلاقە یان کونە. بەلای ئیٚمەشەوە ڕاستە

(کەلەبەر) بۆ (حاجز) ناگونجێت،چونکە کاتێ کە دەڵێی (کونوکەلەبەر)ێکم بۆ ڕێکبکەوێ ئەوە بە مانای (هەل)ێکی بۆ ڕێك بکەوێ یان بۆ جێگە بەکاردێت... هتد. کەواتە (کەلەبەر) لە بواری جوگرافیادا بە واتای (دەلاقە) دێت، بەڵام بۆ وشەی (بەربەست، بەربەستکار) بەکار نەهێنین و بڵێین (بەربەستی جوگرافی)یان (لەمپەری جوگرافیایی) لە جیاتی (الحواجز الجغرافیة).

- نەقابە بۆ (المصالح الاقتصادیة) وشەی (دەسکەوتی ئابووری) بەکارهێناوە، بەلای ئێمەوە (المصالح) بەرژەوەندییە و ڕەخنەگر دەڵێت: بڵێین (بەرژەوەندی ئابووری) بەلای ئێمەوە بوترێ (بەرژەوەندییە ئابوورییەکان) بۆ (المصالح الاقتصادیة) کە بەهۆی نیشانەی (کۆ) و (ناسیاوی)یەوە گونجاوتر دەبێت..

- نەقابە بۆ (جبهة التحریر الوطنیة) (سەربەستکەران و نیشتمان پەروەران)ی بەکارهێناوە. بەلای ئێمەشەوە لە جێی خۆی نییە و پێویستە بکرێتە (بەرەی ڕزگاریی نیشتمانی).

- نەقابە بۆ (الرطوبة النسبیة) زاراوەی دانەناوە، بەڵام ڕەخنەگر دەڵێت: (شێی ڕێژەیی) بۆ داناوە کە زۆر لە جێی خۆیەتی.

ئەمانە هەندێك لەو سەرنجانە بوون، کە غەفور ڕەشید لە بارەی زاراوەکانی (نەقابەی مامۆستایانی سلێمانی) نووسیبوونی[*].

---

[*] بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی ئەو سەرنجانە، بڕوانە:

- غەفوور ڕەشید، سەرنجێك لە پەڕاوی زاراوەی زانستی کوردی، گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)، ژمارە (١٢)،ساڵی (١)، سلێمانی، ١٩٦٠، ل٢٧-٣٠.

## ٨- بەشی فەرهەنگی گۆڤاری (دەنگی مامۆستا):

ئەبوبەکر ماوەتی لە گۆڤاری (دەنگی مامۆستا) وتارێکی لە ژێر ناوی (چەند سەرنجێك دەربارەی بەشی فەرهەنگ) نووسیوە[1] و لەو وتارەدا دەربارەی ئەو زاراوانەی لە بەشی (فەرهەنگ)ی، گۆڤاری (دەنگی مامۆستا)ی ژمارە (١) بڵاوکراوەتەوە دواوە و ڕای خۆی لە بارەی هەندێکیانەوە دەربڕیوە[2]، کە هەندێکیان دەکەینە نموونەی لێدوانەکەمان:

- دەنگی مامۆستا بۆ (حفظ الشهية) (ئارەزوو پاراستن)ی داناوە، ئێمەش لەگەڵ ئەوەین کە (دڵبردن) تەواوترە و دەنگی مامۆستا بە هەڵە چووە، چونکە (ئارەزوو) (هواية)یە، بەڵام (الشهية) (دڵبردن)ە.

- ڕەخنەگر دەڵێت: (مرکب) = ئاوێتە (مکون = پێکهاتوو). واتە ئەم وشەیە بەم جۆرە (ئاوێتە پێکهاتوو) ڕاست نییە، چونکە ئەوانە دوو وشەی سەربەخۆن و واتایان جیایە. ڕەخنەگریش هیچ زاراوەیێکی پێشنیار نەکردووە، بەلای ئێمەوە (ئاوێتە پێکهاتوو) لە جێی خۆیەتی.

- دەنگی مامۆستا بۆ (العصارات الغدية) (ئاووکی گلاندەکان)ی داناوە. بەلای ئێمەوە زاراوەکەی ڕەخنەگر زۆر لە جێی خۆیەتی، کە دەڵێت:

---

[1] ئەبوبەکر ماوەتی، چەند سەرنجێك دەربارەی بەشی فەرهەنگ، گۆڤاری (دەنگی مامۆستا)، ژمارە (٨)، ساڵی (٢)، سلێمانی، ١٩٧٣، ل٣٣-٣٤.

[2] گۆڤاری (دەنگی مامۆستا)، بەشی فەرهەنگ، ژمارە (١)، ساڵی (٢)، سلێمانی، ١٩٧٣.

(العصارات الغدية = لوولاوەکان) واتە ئاوی لووەکان یان (لینجاوی لووەکان)یان بلێین (لووواوەکان) .

- دەنگی مامۆستا بۆ (الخلايا الاسفنجية) (ئیسفەنجەخانە)ی داناوە، بەڵام ڕەخنەگر (شانەکانی هەوری یان ئیسفەنجی) پێشنیار دەکات، بەلای ئێمەوە بلێین (شانە ئیسفەنجییەکان) گونجاوترە.

- دەنگی مامۆستا بۆ (السماد الحيواني) (ئاژاڵە پەین)ی داناوە، بەڵام بوترێت (پەینی ئاژاڵی) گونجاوترە، وەك ڕەخنەگر دەڵێت: چونکە (پەین) ئاژاڵ دروست ناکات، بەڵکو ئاژاڵ پەین دروست دەکات.

- دەنگی مامۆستا بۆ (سوء التغذية) (بەدخۆراکی) داناوە، بەلای ئێمەوەش (کەمخۆراکی) بەتەواو دەزانین، چونکە لە کەمخۆراکییەوە ئەو نەخۆشییەوە دروست دەبێت.

- (وەرگیراوەکان) بۆ (المشتقات) نەك (بەرهەمەکان) کە دەنگی مامۆستا بۆی داناوە، چونکە بەرهەمەکان بە مانای (منتوجات) دێت.

- دەنگی مامۆستا بۆ (الشريان العضدي) (باڵە خوێنەر)ی داناوە و ڕەخنەگر (خوێنبەری بازوو)ی بۆ داناوە، بەلای ئێمەوە (بازووە خوێنبەر) گونجاوترە.

* گۆڤاری (دەنگی مامۆستا) لە وتارێکیدا بە ناوی (پرسیارێك) [1] دەربارەی نووسراوی کۆڕی زانیاری کورددا کە لە گۆڤاری ناوبراودا

---

[1] گۆڤاری (دەنگی مامۆستا)، پرسیارێك دەربارەی نووسراوی کۆڕی زانیاری کورد، گۆڤاری (دەنگی مامۆستا)، ژمارە (٨)، ساڵی (٢)، سلێمانی، ١٩٧٣، ل٤٥-٤٦.

بلاوبۆتەوە، ئەم نووسینە وەڵامی ئەو پرسیارەیە کە (دەنگی مامۆستا) لە (کۆڕی زانیاری کورد)ی کردبوو سەبارەت بە دۆزینەوەی وشەی کوردی بۆ (نقابة) و (نقابة الزراعيين الفنيين) هەروەها ڕای د.کەمال فوئاد لە بارەی پێشنیارەکەی کۆڕەوە خراوەتە پێش چاو کە کۆڕ بڕیاری داوە وشەی (جڤات) بەرانبەر (نقابة) دابنێت، چونکە لە جێگەیێکی زۆری کوردستان بەکاردێت، بۆ کۆبوونەوە یان جووتبوون. هەروەها ئەحمەدی خانیش بە مانای خرۆشان و کۆبوونەوە بەکاریهێناوە[2]. مامۆستا جگەر خوێن لە بەرگی دووەمی فەرهەنگەکەیدا (بغداد ١٩٦٢) ل١٠ دەڵێت:

جڤات – کوم بونە – جڤیتە وبیژن – بیشەن

جڤات ل مالا بارامە – جڤاتا مللەتا – جمعية الامم[1].

پاشان ئەمە دەگاتە ئەوەی کە بۆ (نقابة الزراعيين الفنيين) (جڤاتی وەرزێرانی هونەرکار) بەکاربێنێ... ئەوجا لەوبارەیەوە پرسیان بە د.کەمال فوئاد کردووە سەبارەت بەو دوو زاراوەیە و د.کەمال فوئادیش بەم شێوەیە بیروڕای خۆی دەربڕیوە:

جڤات – وشەیەکی بێگانەی تەواوەیە، کە لە ڕێگای زمانی ئارامییەوە هاتووەتە ناو زمانەکەمان و لەگەڵ وشەی (جمعيت)ی عەرەبیدا یەك دەگرنەوە... دیسانەوە ئەم وشەیەش بە پێی دەستووری زمانی عەرەبی (مێ)یەکە لە کاتی ئیزافەدا بە پێی دەستووری زاراوەی کرمانجیی ژووروو

---

[2] گۆڤاری (دەنگی مامۆستا)، پرسیارێك دەربارەی نووسراوی کۆڕی زانیاری کورد، گ (دەنگی مامۆستا)، ژمارە (٨)، ل٤٥.

[1] گۆڤاری (دەنگی مامۆستا)، ل٤٥.

ئەبێت بە (جڤاتا) کەواتە کە بە زۆریش بکرێ بە (نێر) لە کاتی خستنەسەر دەبێت بە (جڤاتێ) ئنجا لە کۆتاییدا دەگاتە بڕیاردان و دەڵێت: کەواتە (جڤاتی) بە هیچ جۆرێك ڕاست، نییە.

لە جێگەیەکی تردا ئاماژە بۆ وشەی (کۆمەڵە) و (یەکێتی) دەکات بەرانبەر بە (جمعية) و (نقابة) و (اتحاد) بۆیە تا ڕیشەی بەر (جڤات) کە لە بنەڕەتدا کوردی نییە و وشەیێکی وەرگیراوە، دەڵێت: دەتوانین بەرانبەر بە (نقابة) (یەکێتیی پیشەیی) بەکار بێنین. هەروەها دەڵێت: (وەرزێر — وەرزیار) ئەگەرچی ئەمڕۆ لە کوردیدا بەرانبەر بە (زارع) بەکارنایەت، بەڵام وشەیەکی کۆنە لە زمانە ئێرانییەکاندا. پاشان دوای ئەوەی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، کە لە پەهلەوی و فارسیی نوێدا بە مێ هاتووە، بە پێی هەندێك سەرچاوەش، دەڵێت: (وەرزێر) کە وشەیێکی سامییە و لە ڕێگای ئارامییەکانەوە هاتووەتە ناو زمانە ئێرانییەکانەوە لەگەڵ وشەی (بذر)ی عەرەبی دا یەك دەگرێتەوە. بە پێی ئەم لێکدانەوەیە (وەرزێر — وشەیەکی سامی + پاشگرێکی ئێرانی) بە تەواوی (بژار — تۆوچێن) دەگرێتەوە.

هەروەها دەڵێت: ئەگەر (وەرز) بە مانای (فصل) وەربگرین، ئەو کاتە (وەرزبار — وەرزێر) ئەو کەسە ئەگرێتەوە کە بە پێی وەرزەکانی ساڵ کار ئەکەن. ئەمەش لەگەڵ سروشتی کاری (وەرزێر) دا لەلای ئێمە زیاتر دەگونجێت.

دواتر دەڵێت: بەلای منەوە (وەرزێر) بەرانبەر بە (زارع) وشەیێکی خەراپ نییە و لە هەمووی سەیرتر (هونەرکار) بە مانای (فني) بەکاربێت، چونکە (هونەرکار) لە کوردیدا (هونەرمەند) دەگرێتەوە. لە

کۆتاییدا و دوای لێکدانەوەکانی دەڵێت: بەرانبەر بە (نقابة) (یەکێتی) یان (یەکێتیی پیشەیی) و بەرانبەر بە (زارع) (وەرزێر) یان (تۆوچێن) بەرانبەر بە (فني) هەر (فەنی) یان (تەکنیکی)بێت. بەلای ئێمەوە بۆ وشەی (نقابة) ئێستا لە گشت شوێنێك و لە زۆربەی کوردستان زاراوەی (سەندیکا) بەکاردێت و ڕۆیشتووە. بۆ (وەرزێران)یش ئێمە وشەی (کشتیاران)مان هەیە لەوانەیە (مزارع) یان (زارع) گونجاوبێت یان هەر وشەی (وەرزێر) وەك خۆی بمێنێ، بۆ وشەی (فني) بە مانای (خاوەن پیشە، هونەرزان، هونەری، هونەرمەندی) دەگەیەنێ کەواتە بوترێ (پیشەساز). لە جیاتی (نقابة الزراعیین الفنیین) بوترێ (سەندیکای کشتیارانی پیشەساز).

## ٩- زاراوە و ئیدیۆم:

لە بواری خزمەتکردنی زمانی کوردی لە بارەی زاراوە و ئیدیۆم و...تریش، نابێ ڕۆڵی د.نەسرین فەخری لە یادبکرێت، لەم بوارەدا خامەیەکی چالاك بووە و هەندێ لە بەرهەمەکانیشی گەواهی ئەوەی بۆ دەدەن. سەرەتا لە وتارێکیدا لە گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، ژمارە (١٩) باس لە کۆمەڵێ زاراوە و ئیدیۆمی کوردی دەکات و شیکردنەوە و لێکدانەوەیان لە ڕووی زمانەوە، نووسەر لەم وتارەدا (٨٧) ئیدیۆمی کوردی هێناوەتەوە و واتاکانی لێکداونەتەوە و لە پەیدابوون و پێکهاتنیان

دواوه[1]. هەروەها بەرهەمێکی تری نووسەر بەناوی (فەرهەنگی ناوی دەنگ لە زمانی کوردیدا) ئەم فەرهەنگەش باسی ناوی دەنگیٚ سروشتی دەکات و لە بابەت تایبەتمەندیی و درووست بوونیان لە ڕووی زمانەوە و بنچینەی گۆڕینیان بۆ چاوگ و کردار دەکات – کە باسی (٩٠) لەو ناوی دەنگانەی کردووە و دەتوانرێ بۆ دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمانی کوردی سوودیان لێ ببیندرێت.[2] هەروەها لە کتێبێکی سێ بەرگیدا ناوی چەندین یاریی لە کۆمەڵی کوردەواریدا هێناوە[1]زۆربەیان بۆ زاراوەدانان و دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمانی کوردی سوودیان لێدەبینرێت و لەبەرگی یەکەمی باسی ناوی (١٧٠) و لەبەرگی دووەمی (١١٥) و لە بەرگی سێیەمیش (٧٩) یاریی دەهێناوە لەوانە: (پڕناپۆش، ئەلۆیانێ، فڕیوە، شوانەمەڕێ، گاڵە مستێ، مووڕێن، مێشێن... هتد)

---

[1] د.نەسرین محەمەد فەخری، هەندێ زاراوە و ئیدیۆمەی کوردی – لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەیان لەڕووی زمانەوە، گۆڤاری (کۆلێجی ئەدەبیات)، ژمارە (١٩)، بەغدا، ١٩٧٦، ل٧١– ١١٥.

[2] د.نەسرین محەمەد فەخری، فەرهەنگی ناوی دەنگ لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری (کۆلێجی ئەدەبیات)، ژمارە (١٨)، بەغدا، ١٩٧٤، ل٩٥–١٢٢.

[1] د.نەسرین محەمەد فەخری، یاری لە کوردەواریدا پێکهاتنی لە ڕووی زمانەوە و کاری بۆ سەر کۆمەڵ:

-بەرگی یەکەم، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ١٩٩٢.

-بەرگی دووەم، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ٢٠٠٠.

-بەرگی سێیەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، زنجیرە (٢٩٨)، سلێمانی، ٢٠٠٥.

پێش ئەم کتێبەش ناوی ئەو یارییانەی لە گۆڤاری (ئاسۆی زانکۆیی)ی ژمارە (١) بڵاوکردۆتەوە[٢]. ئەمانە و چەندین بەرهەمی تریش کە لە ڕاستیدا بە کارێکی گەورە لەقەڵەم دەدرێن و کەم کەس هەیە بەم شێوەیە توانیبێتی بچێتە ناخی کلتوور و کەلەپووری نەتەوەکەی و ناوی ئەو هەموو یاری و زاراوە و ئیدیۆمانە تۆمار بکات و لێیان بکۆڵێتەوە و شییان بکاتەوە و بەمەش وای کردووە کە ناوی ئەو یارییانە لەبیر نەچێت و زیندوویان بکاتەوە. سەرەرای ئەوەش سەبارەت بەهەندێ لەو زاراوە و ئیدیۆمانەی باسی کردوون، هەندێ تێبینی و ڕەخنە لە لایەن (ئەحمەد تاقانە)ەوە لە وتارێکیدا کە لە گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان)دا بڵاوبۆتەوە[١] لەو کارەی د.نەسرین فەخری گیراوە و دەربارەی زاراوە و ئیدیۆمی کوردییە.

هەروەها (جەلال مەحمود عەلی) لە گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)دا، ژمارە (٦٥) لە وتارێکیدا هەندێ تێبینی و سەرنجی لە بارەی هەمان بەرهەمی د.نەسرین فەخری نووسیوە[٢] و پاشان لە کۆتایی وتارەکەیدا (١٠٧) ئیدیۆمی تری خستۆتە پێش چاو و واتاکانیانی لێك داوەتەوە.

---

[٢] د.نەسرین محەمەد فەخری، یاری لە کوردەواری دا و پێکهاتنی لە ڕووی زمانەوە و کاری بۆ سەر کۆمەڵ، گۆڤاری (ئاسۆی زانکۆیی)، ژمارە (١)، ساڵی (١)، سلێمانی، ١٩٧٧، ل٥١-٦٠.

[١] ئەحمەد تاقانە، لەبارەی هەندێ لە زاراوە و ئیدیۆمی (کوردی)یەوە، گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان)، ژمارە (٤٣-٤٤)، بەغدا، ١٩٧٧، ل٥٧-٥٩.

[٢] جەلال مەحمود عەلی، چەند سەرنجێك دەربارەی ((هەندێ زاراوە و ئیدیۆمەی کوردی))، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٦٥)، بەغدا، کانوونی دووەم و شوباتی ١٩٧٨، ل٤٨-٥٤.

لەم وتارەدا ڕەخنەگر لە دەربڕینی ڕاکانیدا بەرانبەر ئەو کارەی د.نەسرین پشتی بە تێبینی و سەرنجەکانی (لەتیف هەڵمەت و عەبدولکەریم شێخانی و ئەحمەد تاقانە) بەستووە و لە زۆربەی تێبینییەکانیدا ئاماژە بە ڕایەکانی ئەوان دەکات و بە ڕاستیان دەزانێت.

هەروەها باسی ڕاوبۆچوونەکانی (سەروەت محەمەد ئەمین)ی کردووە، لە ڕۆژنامەی (هاوکاری) ژمارە (٣٥٧)دا بلاوی کردووەتەوە، کە سەبارەت بەو زاراوە و ئیدیۆمانەیە، کە د.نەسرین فەخری نووسیونی، بەڵام لەبەرئەوەی باسەکەی ئێمە پێوەندیی بە ئیدیۆمەوە نییە تەنیا ئاماژە بۆ سەرچاوەکانیان دەکەین.[*]

---

[*] بۆ زانینی ئەو تێبینی و سەرنجانە، بڕوانە:

– ئەحمەد تاقانە، لەبارەی هەندێ لە زاراوە و ئیدیۆمی (کوردی)یەوە، گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان)، ژمارە (٤٣–٤٤)، بەغدا، ١٩٧٧، ل٥٧–٥٩.

– جەلال مەحمود عەلی، چەند سەرنجێك دەربارەی ((هەندێ زاراوە و ئیدیۆمەی کوردی))، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٦٥)، بەغدا، کانوونی دووەم و شوباتی ١٩٧٨، ل٤٨–٥٤.

# بەشی سێیەم

**تەوەرەی یەکەم:**

**١- پێناسە و ڕوونکردنەوەی زاراوەسازی.**

**٢- کورتە مێژوویەکی زانستی زاراوەسازی.**

**٣- کورتە مێژوویەکی زاراوەسازی کوردی.**

**٤- تیۆرە گشتییەکانی زاراوەسازی.**

## زاراوەسازی، پێناسە و ڕوونکردنەوە

زانستی زاراوەسازی، بەپێی ئەو قۆناغە مێژووییانەی پێیاندا تێپەڕیوە، هەوڵدراوە وەك زانستێك ڕوون بکرێتەوە و، بناسێنرێت ، بۆیە، لە ئاکامی ئەو هەوڵانەدا و هەر لێکۆڵەرێك و بەپێی پسپۆڕێتیی خۆی، پێناسەی کردووە و لایەنە شاراوەکانی ڕوون کردووەتەوە.

لەبەر پەرەسەندنی خێرای بوارەکانی زانست و تەکنەلۆژیا... و، گەشەکردنی خێرای هاوبەشی نێودەوڵەتی لەبواری پیشەسازیی و بازرگانی و....هتد. بۆ هەموو ئەو پێشکەوتنە خێرایانە، وا پێویست دەکات، بۆ هەر چەمکێکی ئەو بوارانە زاراوە دابنرێ و، لێکۆڵینەوە و کاری یەکخستنی بۆبکرێت، ئەمەش بووە بەهۆی سەرهەڵدانی زانستێك بەناوی (زانستی زاراوەسازیی) کە ئەم کارە ئەنجام بدات و لە نێوان چەندین زانستی تردا هاوبەشی ئەو کارە بکات. بۆیە زاراوەسازیی: ئەو زانستەیە کە لە پێوەندی نێوان چەمکە زانستییەکان و زاراوەکانی زمان، کە ئەو چەمکانە دەردەبڕن، دەکۆڵێتەوە[1] [*]. هەروەها ئەم زانستە هاوبەشە لە نێوان

---

[1] د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، سلسلة الموسوعة الصغيرة (١٦٩) دائرة الشؤون الثقافية والنشر، بغداد، ١٩٨٥، ل١٧-١٨.

[*] هەروەها بۆ پێناسەی زاراوەسازی بڕوانە:

زانستەکانی زمان و ژیربێژی و ڕاگەیاندن و زانستەکانی تر. ئەم زانستە، زانستێکی سەربەخۆ نییە، چونکە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەو چەمك و زاراوانەی کە دەیەوێت لێیان بدوێ، پەنا دەباتە بەر چەند زانستێك.

دیسانەوە سەبارەت بە پێناسە و چەمکی زانستی زاراوەسازیی، وتراوە: ئەو زاراوانەن تایبەتن بە بوارێك لە بوارەکانی زانیاری (معرفة)، وەك

---

أ- د.ايناس كمال الحديدي، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث، الطبعة الاولى، دار الوفاء لدنيا الطباعة والنشر، الاسكندرية – مصر، ٢٠٠٦، ل ٢٩-٣٠.

ب- ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا، سلێمانی،٢٠٠٧، ل١٧.

پ- ئەنتەرنێت: منتدى اللسانيات: منتدى المصطلح اللسانى /د.محمد احمد، المصطلح العلمي بين السيرورة والاندثار.

ت- ئەنترنێت، المواصفات القياسية العربية. (کۆمەڵە زاراوەیەکی ڕێکخراوە لە کێڵگەیەکی بابەتی دیاریکراو، واتاکانیان پێناسە کراوە و بووەتە چەمکێکی گشتی لە کێڵگەی پێوەندی دار).

ج- محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوە دانان لە زمانی کوردیدا، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٤٠. ئەم باسەشی لە گۆڤاری ((نووسەری نوێ))، ژمارە (١٩) ، ل ٨٨-١٢٣، هەولێر، ٢٠٠١ بڵاوکردۆتەوە =

چ. جەمال عەبدول، زاراوەسازی و زانستاندنی زمانی کوردی، گۆڤاری ئەکادیمی کوردی، ژمارە (٧)، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ١٦٦. هەمان پێناسەو باسیشی لە گۆڤاری (وەشت)ی ژمارە (١)، ساڵی یەکەم، کانوونی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ٨. بڵاوکردۆتەوە...هتد.

زاراوەکانی دەنگسازی[1]. دەشێت بووترێت: ئەو بوارە زانیارییەیە کە پێکهاتەی چەمکەکان و ناونانیان، چ لە بوارێکی تایبەتی، یان لە گشت ئەو بوارانەی هەیە چارەسەر دەکات[2] و زانستی زاراوەسازی (Terminology)دادەنرێت بەیەکێك لە: چەمکە تازەکانی زانستی زمانناسیی هاوچەرخ و ئامانجی دانانی دەستوور چەسپاندن و کارییە، بۆ زاراوە زانستییە نوێیەکان[3]، لەبەرئەوەی پێکهاتەی زاراوە و چۆنێتی خۆنواندنی، بنیاتی زانیاری لە خۆدەگرێت و باشتر وایە لەو ڕوانگەیەوە سەیر بکرێت، کە بوارێکی فراوانە، چونکە بە مەنتیق و زانستی ڕاگەیاندن و پۆلێنکردن، یان بە (ئینفۆتێرم – infoterm) ناسراوە[*] بەندە.

زاراوەسازیش وەك زانستێك، بە لقێك لەلقەکانی زانستی زمانناسی پراکتیکی دادەنرێت، چونکە لە ڕووی ڕوانگەی بنیاتنانەوە لە ڕوانگەی گشتی توێژینەوەکانی زمانەوانی بنەڕەتی جیاوازە، بەڵام لەگەڵ ئامانجە

---

(1) د. محمد علي الخولي ، معجم علم اللغة النظري، انكليزي – عربى، مكتبة لبنان، لبنان، ١٩٩١، ص ٢٨٥.

(2) مجلة ((اللسان العربي))، معجم مفردات علم المصطلح، العدد الثاني والعشرون، جامعة الدول العربية، ١٩٨٤، ص ٢٠٧.

(3) سعد القحطاني، قضايا في المصطلح العربي، جامعة الدول العربية، مجلة (الفيصل)، العدد (٣٠٩)، الرياض، مايو/يوليو ٢٠٠٣، ل ١٥.

(*) ئینفۆتێرم (انفوتیرم – infoterm) – (بنکەی زانراوی نێودەوڵەتی زاراوەکان) ە، کە لە بەهاری ساڵی ١٩٧١ لە نێوان یونسکۆ و حکومەتی نەمسایی لە ڤیەننا دامەزرا.

زمانەوانییە پراکتیکییەکاندا یەك دەگریت و، لە پێوەندیی نێوان چەمکە زانستییەکان و ئەو زاراوانەی زمان کە ئەو واتایە دەگەیەنن و لە پێوەندیی زاراوە و بنەڕەت و واتاکەی و چۆنێتی دانانی و جۆری بەکارهێنان و یەکخستنی هاوواتاکان و تۆمارکردن و ڕاستکردنەوەی زاراوەی هەڵە و نارێك و دانانی کورتە و هێما بۆ زاراوەکان دەکۆڵێتەوە[1]. ئەم زانستەش، وەك وتمان، بۆ گوزارشتکردن لەو زاراوانەی دەریان دەبڕێت، چەندین زانستی تر بەشداری لەگەڵ دەکەن، ئەویش بەهۆی داهێنانی بێ ژمار و شۆڕشی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا لە پەرەسەندنی بەردەوامدایە، لەبەر گرنگی ئاسانکردنی پێکەوەگەیاندن و دابینکردنی هاوکاریی نێودەوڵەتی لە جیهاندا و ڕۆڵی لە پەرەپێدانی باری کۆمەلایەتی و فێرکردن، لە وڵاتە پێشکەوتووەکان بایەخی پێویستی پێ دەدرێت و گەلێ مەڵبەند و بانکی تایبەتی بۆ تۆمارکردنی زاراوەکان کراوەتەوە، هەروەها لە زانکۆکانیشدا بەشی تایبەتی بۆ دیاریکراوە و، مامۆستای پسپۆڕی بۆ تەرخان کراوە...

زۆربەی ئەوانەی باسی زاراوەسازییان کردووە، لەسەر ئەوە کۆکن، کە زاراوەسازیی وەك زانستێك: بایەخ بە پێوەندیی نێوان چەمکە زانستییەکان و زاراوەکانی زمانەوانی دەدات و لێیان دەکۆڵێتەوە و، گوزارشت و دەربڕینیان لەسەر دەکات. بۆیە بەلای ئێمەشەوە گونجاوترین و پوختەترین پێناسە ئەوەیە: ئەو زانستەیە لە پێوەندیی نێوان چەمکە زانستییەکان و

---

[1] عەبدولڕەحمان عوسمان، زاراوەزانی و زاراوەی زانستی کوردی، گۆڤاری (بانە ڕۆژ)، ژمارە (٢١)، کەرکوك، ٢٠٠٥، ل ٦٣.

زاراوەکانی زمان دەکۆڵێتەوە و، گوزارشتیان لێ دەکات و، ناویان بۆ دادەنێت.

لە زانستی زاراوەسازیدا دەکرێت لە سێ ڕەهەندەوە لێی بکۆڵرێتەوە:-

- ڕەهەندی درك پێکردن.
- ڕەهەندی زمانەوانی.
- ڕەهەندی گەیاندن.

ڕەهەندی دەرك پێکردن، لەسەر بنەمای تیۆری بناوانیی – نظرية المرجعية – واتا لێکۆڵینەوەی نەژادی فەرهەنگیی زاراوەکە – دەکرێت، کە دانانان بەوەی، لە نێوان (وشە) و (زاراوە)دا جیاوازیی هەیە و ئەمیش بە بنەمای جیاکردنەوەی نێوان زانستی زاراوەسازیی و زانستی فەرهەنگسازیی دادەنرێت. بەڵام ڕەهەندی زمانەوانی دەبێت ڕوخساری زاراوەکە، یان بنەماکەی – تیۆری و پراکتیکی – بگرێتەوە، هەروەها توێژینەوەی کۆمەڵێك لە تایبەتییەکانی زاراوە کە ئامانجی تایبەتی خۆیان هەیە، بەڵام ڕەهەندی گەیاندن زانستی زاراوەسازی دەخاتە نێو بواری گەیاندنی جیهانی و بڕی کاریگەرییەتی لەسەر بەکارهێنانی زاراوەیی. بایەخ بەم زانستە دەدات بەوەی کە زانستێکی پراکتیکییە، بەتایبەتی لە ڕوانگەی کاریگەری پێوانەییەکانی لەسەر گۆڕینەوەی گەیاندن، لەگەڵ چارەسەرکردنی لایەنی پێوانەیی لە زانستی زاراوەسازیدا[1].

---

(1) iReview of aspects of terminology , what is terminology , Internet http. // corol uni – bilefeld.de / eagles/ wp٥ / termdeliv ٩٧ / node ٥ ,. htm/.

گومانی تێدا نییه (ڕەهەندی گەیاندن) زۆر بەشداری لە بڵاوبوونەوە و نێودەوڵەتیکردنی زاراوە دەکات ( internationalization of terms) کە کارە زانستییەکان لە سەرەتای سییەکانەوە ڕوویان تێکردووە. لەمانەوە دەردەکەوێت، زانستی زاراوەسازیی لە پەرەسەندنێکی بەردەوامدایە و ناتوانرێت ڕێی پێ بگیرێ و سنوور بۆ پەلهاویشتنی دابنرێت، بەڵکو دەبێت تێکەڵیی و تێکهەڵچوونێکی بەردەوامی لەگەڵ گۆڕانە زانستییە جیهانیەکاندا هەبێت، چونکە کاریگەریی لەسەریان دەبێت و، هەربەو شێوە کاریگەریی دەکرێتە سەر، بەڵام گرنگترین خاڵ کەلای توێژەرەوەی زانستی زاراوەسازی بایەخی پێ بدرێت، چەمکەکانە کە گرنگییەکی زۆریان هەیە، چونکە (واتا) لە چەمکەوە بۆزاراوە دەردەچێت، لێرەوە کارکردن لە زانستی زاراوەسازیدا پشت بە چەمکەکان و دیاریکردنیان دەبەستێت.

دەشێت چەمك concept بەوە پێناسە بکرێت کە: یەکەیەکی بیرە Aunit of Thought لە جیاکردنەوەی کۆمەڵێك لە شتە بەرجەستەییەکان[1] objects[*] ئەویش لەسەربنەمای تایبەتییەتی

---

[1] د. ايناس كمال الحديدى، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث، ل ٣٥.

[*] الموضوع، objects یەکێکە لەزاراوەکانی زاراوەسازی، بەواتای هەر پارچەیەك لە جیهانی دەرەوە، یان ناوەوە، کە ئەو پارچەیە بتوانرێت

گشتی[۲] پێکدێت. گشت چەمکێکیش ئاماژە بۆ ژێدەرێك یان چەند ژێدەرێك دەکات و، کۆی ژێدەرەکانیش، کە چەمکەکە هێمای بۆ دەکات، ناودەنرێت جۆر[**] ((Class – پۆل)).

ئەو ژێدەرانەی (الموضوعات – objects) کە چەمکەکان دەیاننوێنن لەوانەیە شتێکی بەرجەستەیی بێت، وەك (ئامێر...) یان نابەرجەستەیی بێت وەك (سیحر یان موگناتیس...) هەروەها چەمك لەوانەیە ژێدەرێکی تاك و (individual object) سەربەخۆ بێت و نەژمێردرێت، ئەمیش دابەش دەبێتە سەر بەرجەستە، وەك (ئۆتۆمبیلی تایبەتی، کتێبخانەکەم...) و نابەرجەستەیی وەك (شعورێکی دیاریکراو کە مرۆڤ لە تاقیکردنەوەیەکدا تێیدا ژیابێت...) لەگەڵ ئەوەشدا چەمکی گشتی (general concepts) دەبینین، بریتییە لە شتی بەرجەستەی گشتی (NonIndividual object) بەجیاکردنەوە فراوان دەبێت و، لە ژمارەیەك کەس یان شت کە خەسڵەتی دیار و هاوبەشیان هەیە پێکدێت، وەك (ئاژەڵ، کتێب،...).

---

هەستی پێ بکرێت چ بەهەست یان لە ڕێگەی عەقڵەوە (perceivable) یان دەتوانرێت وێنەیەکی هۆشەکی پێ بدەیت (Iso ۱۰۸۷ , p. ۱).

[۲] بڕوانە: د. ایناس کمال الحدیدی، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث، ل ۳۵.

[**] ((Class لە (معجم علم اللغة النظري) بەم شێوەیە باسکراوە: (جۆرێکە لە وشە لەبواری وشەسازیدا یان لەبواری ئەرکدا **functional Class** , **morphologicasl Calass**)) . بڕوانە: د.محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظری،ل٤٢.

بەم شێوەیە چەمکەکان تەنیا ناچنە سەر گیاندار و شتەکان (کە بەناو دەریان دەبڕێت)، بەڵکو لەمەش ڕەت دەبێت و پیاهەڵدان و کارکردن و شێوە و پێوەندیی دەگرێتەخۆ.

ئەگەر چەمکەکان لەسەر بیرکردنەوە بنیات بنرێن، ئەوا دەچنە ژێر ڕکێفی تاقیکردنەوەی تاکی و تایبەتی ئەو کەسانەی خاوەنی ئاستی ڕۆشنبیریی و کۆمەڵایەتی جیاواز و جۆربەجۆرن. لەلایەکی تریشەوە هیچ کاتێك تاکە بیرۆکەیەك بەتەنیا و سەربەخۆ دەرناکەوێت، بەڵکو هەموو کاتێك پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، بە چەمکێکی تری دەبەستێتەوە کە بەشداری لەگەڵ دەکات، یان لە تایبەتمەندێتیدا وەك ئەوە (characteristics of concept) لەو کۆمەڵە تایبەتمەندییانەی کە چەمکیان لێ پێکدێت، ئاکامی ناوەرۆکی چەمك و مەبەستەکەی دێتە دیی[1].

جا ئەگەر چەمك ئەو گرنگییەی لە زانستی زاراوەسازیدا هەبێت و یەکەیەکی بنەڕەتی بێت، بوونی ئەوە هەڵدەگرێت کە پێویستی بە پێناسە بێت (definition) ئەمەش لە زانستی زاراوەسازیدا کرۆکی ڕێبازی توێژینەوەیە و لەڕێگەیەوە ڕووخساری هەموو چەمکەکە و سیماکانی دیاری دەکرێن. کەواتە پێناسەکردن پەسندی چەمکەکەیە، بەشێوەیەك

---

[1] بڕوانە: د.علي القاسمي، علم المصطلح بين علم المنطق و علم اللغة: العناصر المنطقية والوجودية في علم المصطلح، مجلة ((اللسان العربي))، العدد (الثلاثون)، الرباط، سنة ١٩٨٨، ص ٨٧، ٨٩.

کەوای لێ دەکات لە چەمکەکانی تر جیاواز بێت، هەرچەندە سەر بە یەك پێڕەویش بن[1].

ڕێگاکانی پێناسەکردن زۆرن، هەندێ لەوانە بەکورتی ڕوون دەکەینەوە:

١- دیاریکردن: Determination

لەوانەیە ئەم پێناسەیە لە هەموویان بڵاوتربێت، کە پشت بە پەسندکردنی چەمك دەبەستێت، پەسندکردنێکی وا کە ڕوونی بکاتەوە و واتاکەی دەربخات و وای لێ بکات لە هیتر جیاواز بێت.

٢- بەستنەوە: conjunction

چەمکێك بە چەمکێکی دیکەی ناسراو دەبەستێتەوە، کە لەو ڕێگەیەوە پێناسەی دەکات و دەیناسێنێت.

٣- جیابوونەوە یان وەخۆگرتنی دژیەك: Disjunction

زاراوەسازان بە (وەخۆگرتنی لۆجیکی) ناوی دەبن، کە درێژەپێدانی کۆی ژمارەیەك چەمکە – بەواتای گشت ئەو جۆرانەی وێنا دەکرێت بۆ هەرچەمکێك و، سەرەنجام بریتییە لە ڕەگەزی چەمکە بنەڕەتییەکان کە چەند جۆرێکی دەستکەوتوون و بە زۆری ئەو جۆرانە دژی یەکن، بەڵام لەڕووی لۆجیکەوە پێکەوە کۆکن و وەکو یەکگرتنی هەردوو جۆری منداڵ و ڕووەك لە ڕەگەزی منداڵانەدا.

٤- تێکەڵکردن: Integration

---

[1] Iso, ١٠٨٧, p. ٤.

ئەمەش پشت بەوە دەبەستێت، کە پێناسەکراو بە چەمکێکی بڵاوتر لەخۆی دەگەیەنێت، یان لەگەڵی تێکەڵ دەکات، کە خۆی و چەند چەمکێکی تر دەگرێتەوە[1]...

[1]Rewiew of aspects of Terminology , Definition , Internet. http:// coral , lili. uni – Bielefeld./ eagle ٥ / wp٥ / termdeliv ٩٧ / node ٥٩. htmi.

## کورتە مێژوویەکی زانستی زاراوەسازی

ئەمڕۆ زاراوەسازیی، بە زانستێکی نوێ دەژمێررێت، کە گەشەسەندنێکی خێرای بە خۆوە دیوە، ئەویش لەبەر پێشکەوتنی زانیاریی مرۆڤایەتی لەگشت بوارەکانی ژیاندا و گۆڕینەوەی زانیاری لە نێوان گشت وڵاتانی دنیادا. واتە ئێستاش ئەم زانستە ڕۆژ بە ڕۆژ پێشدەکەوێت و پەرەدەسێنێ و بایەخی زیاتری پێدەدرێت، چونکە سەرجەم بوارەکانی ژیانی مرۆڤایەتی، پێویستیان بە زاراوە دانان هەیە و، ئەم پەرەسەندنەش تا ڕادەیەکی زۆر پەنا بە گۆڕینەوەی زانیاری دەبات. لەلایەکی تریشەوە بووەتە هۆی گرفتی دۆزینەوەی زاراوە، چونکە ڕۆژانە نزیکەی (٥٠ — ٦٠) زاراوەیەك دەردەچێت و دەبێتە هۆی نایەکسانی لە نێوان ژمارەی چەمکە زانستییەکان و ژمارەی ئەو زاراوانەی کە دەریدەبڕن.

هەوڵی زانایان لەسەدەی نۆزدەیەمەوە لەبارەی ئەم زانستە، دەستی پێکرد، بەتایبەتی زانایانی زیندەوەرزانی و کیمیا کە لە ئەورووپادا دەستیان بە یەکخستنی دانانی زاراوە لەسەرئاستی جیهان کرد. ئەم هەوڵانەش لەسەرخۆ پەرەیانسەند و لە نێوان ساڵانی (١٩٠٦— ١٩٢٨)دا بە شەش زمان فەرهەنگی وێنەداری (شلۆمان) بۆ زاراوە تەکنیکییەکان دەرچوو. گرنگیی ئەم فەرهەنگە لەوەدایە، کە لەسەر دەستی تیمێکی

نێودەوڵەتی دانراوە، لەسەر ڕیزبەندی ئەلف و بێ ڕێك نەخراوە، بەڵكو لەسەر بنچینەی چەمكەكان و پێوەندیی نێوانیان ڕیزكراوە، كە پۆلێنی چەمكەكان لە ڕوونكردنەوەی واتا و شیكردنەوەی زاراوەكە بەشداری دەكات[1][2] لە لایەكی تریشەوە پشتبەستن بەم سیستەمە بۆ ڕیزكردنی زاراوەكان، دەبێتە ڕەنگدانەوەی گرنگیی چەمكەكان لەكاتی باسكردنی زاراوە و واتاكانیان و واتاكان لێرەدا چەمكن و لە ڕوانگەی واتا (المدلول) یان چەمك بۆ ناولێنراو (الدال) دەچن، كە لە واتاكانی یەكەی فەرهەنگی لە واتاوە بۆ ناولێنراو دەچن جیاوازە[3]. هەروەها ئەم ڕیزبەندە لەگەڵ یەكخستنی پێوانەیی جیهانی دەگونجێت، چونكە ئەلفوبێی (ڕیزبوونی پیتەكان) لەزمانێكەوە بۆ زمانێكی تر جیاوازە[4] لە ساڵی (١٩٣١) كتێبـی (یەكخستنی نێودەوڵەتی زمانی ئەندازە) بەتایبەتی (ئەندازەی كارەبایی) دەرچوو، كە پرۆفیسۆر (فۆستەر- wuster) مامۆستا لە زانكۆی ڤییەنا، لە ساڵی (١٩٧٧) كۆچی دوایی كردووە دایـنابوو. دوای

---

[1] د. على القاسمى، مقدمة في علم المصطلح، الموسوعة الصغيرة ١٦٩، دائرة الشؤون الثقافية والنشر، بغداد، ١٩٨٥، ص ١١.

[2] د. علي القاسمي، المصطلحية، النظرية العامة لوضع المصطلحات وتوحيدها وتوثيقها، مجلة ((اللسان العربي))، المجلد ١٨، الجزء ١، الرباط، ١٩٨٠، ص ٨.

[3] د. ايناس كمال الحديدي، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث، دار الوفاء لدنيا الطباعة والنشر، الطبعة الاولى، الاسكندرية – مصر، ٢٠٠٦، ص ٢١.

[4] هەمان سەرچاوە، ل ٢١.

ئەوەی چەندین بنچینەی پتەوی بۆ ئەم زانستە نوێیە دانا. زۆربەی زمانەوانان و ئەندازیاران، ئەم کتێبە بە سەرچاوەیەکی گرنگی ئەم بابەتە دادەنێن[1].

(فوستەر – wuster) خوێندنی ئەندازیاریی کارەبا لە زانکۆی زانستە پراکتیییەکان لە بەرلین تەواوکرد، بۆ ئەوەی بتوانێ نامەیەك بنووسێ وەك ئەنجامێك بۆ دانانی فەرهەنگێکی تیکڕایی بایەخ بە زمان و تەکنیکی بدات، لە توێژینەوەکەیدا بەتایبەتی کەوتە ژێر کاریگەریی بوونی بە زاراوەکانی زمانی ئیسپیرانتو[*](الاسبرانتو) کە فەرهەنگێکی تیکڕایی چوار بەشی گرتەخۆ. فۆستەر هەستی بەوەکرد، کە لە تەکنیکیدا گیروگرفتی زمان هەیە و وەك بەرەنگاربوونەوەیەکە بۆ ئەندازیارێکی تازەکار لە ساڵی (١٩٣١)دا بڕوانامەی دکتۆراکەی بەناونیشانی (یەکخستنی نێودەوڵەتی بۆ زمانی تەکنیکی) ( international standardization of languge in teachnology) تەواوکرد، کە بایەخی بە ناوچەی سنووری نێوان تەکنیکی و زمانەکان دا[2] ئەمەش لەو زانیارییەوە کاریگەریی گرت، کە لە بارەی بنیاتی فەرهەنگی بەراورد بۆ

---

(١) د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ص ١١ – ١٢.

(*) زمانێکی دەستکردە لەسەر بنچینەی وشە هاوبەشەکانی زمانە ئەورووپییە سەرەکییەکان دامەزراوە.

(٢) د. ايناس كمال الحديدي، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث، ل ٢٢.

ژمارەیەك لە زمانەکان وەرگرت و پاشان نامەی دکتۆراکەی لەساڵی (١٩٣١)دا، بوو بەکتێب، تێیدا هەندێ لە ئەندازیاران و زمانەوانانی بەناوبانگ لە زۆرینەی وڵاتەکان، بەتایبەتی ئەڵمانیا یارمەتییاندا، لەوانەش (دریزین – drezen) پسپۆڕی دینامیکایە لە بواری یەکخستنی زاراوەیی، بەتایبەتی یەکخستنی زاراوەی جیهانی ئەم کتێبەش لەو ڕوانگەیەوە هات، کە ببێتە بنەمایەك بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی زانستی زاراوەسازیی جیهانی، سەرەتا بە بەسەرکردنەوەیەکی (استقصاء) تێکڕایی بنیاتی فەرهەنگی ژمارەیەك لە زمانەکانی ئەورووپی کرد و پاشانیش بەسەرکردنەوەیەکی بەکارهێنانی زمان بۆ بیستوشەش دەزگای پێوانەیی، فۆستەر تەنها بە لایەنە تەکنیکییەکە نەوەستاوە وەك گیروگرفتێك، بەڵکو زۆرتر لەوە ڕۆیشتووە و بۆ زۆرتر لەو کارانەی، کە پێوەندی بە توانستی وەرگرتنی زمان و بەکارهێنانیان لە کۆنگرە و چاوپێکەوتنە جیهانییەکان، هەروەها مامەڵەکردنی لەگەڵ گیروگرفتی زمانی دایك و زمانی دووەم. توێژینەوەکەشی بەگشت بوارەکانییەوە ئەنجامی پەیدابوونی زمانێکی جیهانی بوو، کە لە سەر ڕێبازەکانی زانستی زاراوەسازی بنیات بنرێت. پاشان ئەم هەوڵانە وەك کارێکی بەکۆمەڵ پەرەیان سەند، کە لەسەر بنەمای هاوبەشیکردن ئەنجام دەدرێن. سەرەتا لە ساڵی (١٩٣٦) لەسەر داوای یەکێتی سۆڤیەت (لیژنەی تەکنیکی بۆ زاراوەکان) لە ئەکادیمیای زانستەکانی سوڤیەت پێکهێنرا. لە ژێر سایەی (یەکێتی جیهانی کۆمەڵەکان بۆ پێوانە نیشتمانییەکان

International federation of National standaraizing ) [1]ISA Asociations) دوای دەرچوونی کتێبەکەی فۆستەر پێنج وەرگێڕ ئەو کتێبەیان وەرگێڕا، یەکێ لەوانە (دریزین – Drezen) بوو لە نووسینەکانی (دریزین)دا کە لە یەکخستنی چەمکەکان و هێما و زاراوە زانستیی و تەکنیکییەکاندا خۆیان دەنواند، تەبایی و تێکگەیشتن لە نێوان فۆستەر و دریزیندا دەبینرا، لە ساڵی (١٩٣٤) پاشان (بەجیهانیکردنی زانستی زاراوەسازیی تەکنیکی و زانستی) لەساڵی ١٩٣٦[1] دریزین ڕاپۆرتێکی لە بارەی کتێبەکەی فۆستەر ئامادەکرد، لە (٨٤) لاپەڕە پێك هاتبوو، لەژێر سایەی ئەکادیمیای زانستەکانی سۆڤێتی، کە پێشنیازی دامەزراندنی لیژنەی زاراوەکان ٣٧ ISA کرد، سەرەتای دەستبەکارکردن بەو پێشنیارە لە کۆبوونەوەی یەکێتی جیهانی ISA بوو، کە لە ستۆکهۆلم لەساڵی (١٩٣٤)دا بەسترا، دواتر لیژنەکە لە ساڵی(١٩٣٦) دامەزرێنرا و یەکەم کۆبوونەوەی خۆی لە بۆدابست لە هەمان ساڵ بەست، دوای ئەوە کۆبوونەوەکانی لیژنەکە تا گەیشتە سێ کۆبوونەوە بەردەوام بوون، یەکەمیان لە پاریس ساڵی (١٩٣٧) و دووەمیان لە بەرلین ساڵی (١٩٣٨) و سێیەمیانیش لە هلسنکی ساڵی (١٩٣٩)[2]پاشان لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی لیژنەیەکی نوێ

---

[1] د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ص ١٢.

[1] د. ايناس كمال، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث، ل ٢٣.

[2] هەمان سەرچاوە، ل ٢٣.

جێگەی (لیژنەی تەکنیکی زاراوەکان)ی گرتەوە، بەناوی (لیژنەی تەکنیکی ٣٧)ی تایبەتکار بە دانانی زاراوە و یەکخستنیان، کە بەشێکە لە (ڕێکخراوی جیهانی یەکخستنی پێوانەیی ISO) کە جنێڤ بۆتە بارەگای ئەم لیژنەیە و کۆششێکی زۆریان ئەنجامداوە لە بواری یەکخستنی بنەماکانی دانانی زاراوەدا. یەکێك لە پێشەنگە گەورەکانی بواری زاراوەسازی، کە شارەزایەکی گەورەی یۆنسکۆیە،(ئەدۆین هۆلمسترۆم — HOLMSTROM)ە، ئەم ڕێکخراوە جیهانییەی بۆ بنیاتی (فەرمانگەی زاراوەی نێودەوڵەتی) هاندا و بودجەی دارایی پێویست دابین بکات بۆ بڵاوکردنەوەی بیبلیۆگرافیایەك بە دوو بەرگ بەناونیشانی فەرهەنگە تایبەتمەندەکان لە زانست و تەکنەلۆژیادا، لەم دواییانەدا چاپێکی زێدەکراوی نوێی دەرچوو[1]، وەك کارێکی پێویست لە پێناو بەرزکردنەوەی ڕێژەی توانستی زمانەوانی لە کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان — هەڵبژاردنی زمانە سەرەکییەکان یان پێشکەشکردنی زمانی دووەم — لەپاڵ زمانی دایك — کە زمانێکی جیهانییە دەتوانرێت وەك زمانێکی بیانی بەکاربهێنرێت و ئەو زمانە بەکارهاتووەش لە بەیەکەوە گەیاندنی نێودەوڵەتی، زمانی لاتینی بوو، کە بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە لەسەدەی هەژدەیەمدا بەکارهات، تا هاتنی (فۆستەر) کە لە کتێبەکەیدا (بنیاتی فەرهەنگی) ئاماژەی بۆ بیستوشەش زمان کردووە، لەوانە زمانە دەستکردەکان، کە دەرکی بەگرنگیی بۆ زانست و تەکنەلۆژی کردووە، پاشان لە سیمایەکاندا هاوبەشی لە نێوان خۆرئاوا و یەکێتی سۆڤیەت لە

---

[1] د.علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ص ١٢ — ١٣.

سایەی هەردوو لیژنەی (IEC)[*] و (ISA) دەرکەوت، تا لە سەدەی ڕابردوو بنەمای تەرخانکراوی زانستی ئاژەڵ و زانستی ڕووەك و کیمیا داڕێژرا، لیژنەی (ISA۳۷) بنەمای زاراوەی گشتی، کە گونجاوبێت و بۆ گشت بوارەکان لە زۆرینەی زمانەکاندا بەکاربێت دامەزراند، لەو هەوڵانە و لەو پێناوەدا زانستی زاراوەیی هاتە کایەوە و قوتابخانەی پراغ و قوتابخانەی سۆڤییەت لەو سەردەمەدا پەرەیان سەند.

دواتر لەساڵی (۱۹۳۸)دا لیژنەی زاراوەکان (ISA) بڕیارێکی دا بەوەی کەوا پێویستە پلانێك بۆ دانانی دەستوورێکی ڕێکوپێك، بۆ درووستکردنی کۆدەوشە (code – words) دابنرێت لە هەمان کاتیشدا ئەم دەستوورانە بریتین لە جۆرێکی کلیلەکانی زاراوەی جیهان، کە هەریەکە تایبەتە بە باسێکەوە[1] و لە ڕێی ئەو دەستوورانە توانرا دەست بکرێت بە درووستکردنی کۆدە وشەی ڕێکوپێك و وردی ئاراستەکراو لە گشت بوارەکانی زانیاری جیاوازدا. لیستێك لە ڕەگی وشە (Roots) و

---

(*) (IEC) (INTERNATIONAL ELECTROTECHNICAL COMMISSION) ئەو لیژنەیە ساڵی ۱۹۰٦ بۆ ڕێگە خۆشکردن و کارکردنی لە بواری زانستی زاراوەسازی جیهان دامەزراوە، سەرەڕای ئەوەی کە بە خێرایی کارەکانی نەچوونە سەر، بەڵام لە ماوەی بیست وپێنج ساڵدا توانرا نزیکەی (۱۰۰) چەمك یەك بخرێت، تا دەست بە چارەسەری گیروگرفتەکانی زمان کرا لەسەر دەستی ئەندازیارانی ئەڵمانی و سۆڤیەت وەك فۆستەر و دریزین و لۆتە – LOTTE

[1] د.ایناس کمال الحدیدی، المصطلحات النحویة في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحدیث، ل۲٤.

گیرەك (Affixes)ی بەکارهاتوو لە درووستکردنی کۆدەوشەیی خرایە سەر ئەو دەستوورانە. بۆیە پلانێك بۆ کاری کلیلی زاراوەکان دانرا ئەویش لە نەمسا لە نێوان سالآنی (١٩٤٧) و (١٩٥٤) ئەم کارەش نزیکەی پێنج سەد (زارك- مدخل)ی گرتبووەخۆ، کە لە چەند بوارێکی ناسراودا دووبارە دەبنەوە، مەبەست لەم کارەش ئەوەبوو، ببێتە بنەمایەك بۆ خزمەتکردنی گفتوگۆی جیهانییەکان سەبارەت بە بابەتێك (subject) [١] [*] هەروەها لە سالّی (١٩٥٢) لیژنەیەکی تر بە ناوی لیژنەی تەکنیکی: ISO –TC ٣٧ درووست بوو.

The committee international organization for ) standardization) کە بەشێکە لە ڕێکخراوی جیهانی یەکخستنی پێوانەیی(ISO) و جنێف بووەتە بارەگای ئەم لیژنەیە و پەیمانگای نەمساوی پێوانەیی لە ڤییەنا سەرپەرشتی ئەم (لیژنەی تەکنیکی ٣٧)ە دەکات و دوای خۆئامادەکردنێکی دوور و درێژ پێشنیازەکە بلآوبووەوە (ISO ٨٦٠)[**] سالّی(١٩٦٨) لە بارەی یەکخستنی نێودەولّەتی

---

[١] هەمان سەرچاوە، ل ٢٥.

[*] (subject) لە زاراوەکانی زاراوەسازییە کە گوزارشت لە هەر بوارێك لە بوارەکانی بیر یان زانیاری مرۆڤایەتی دەکات. لەئاکامی ئەو ئامانجانەی کە هەیەتی و ئەو بیرو ڕایانەی پێوەندە پێوەی هەست بە سنوور و چوار چێوەکەی دەکرێ (ISO١٠٨٧.P.١)

[**] ڕێکخراوی ئیزۆ (الایزو – ISO) ڕێکخراوێکی یەکگرتووی جیهانییە لەچەند ئەندامێك پێك دێت کە نوێنەرایەتی (١٣٠) ولآت دەکەن بنکەیەکی ناحکومییە و لە سالّی (١٩٤٧) دامەزراوە، بۆ ئەوەی بەکاری هاندانی

زاراوەکان و چەمکەکان[1][2] ئەم لیژنەیەش هەنگاوی گرنگ و روونی لە بواری یەکخستنی ڕێبازەکانی دانانی زاراوەکان نا و ئەوەی لەم بارەیەشەوە، کە ڕۆڵی گرنگی بینی لە کاری ئەم لیژنەیە (ئەدۆین هۆلمستڕۆم Holmstrom) بوو، تا گەیشتە دامەزراندنی (بنکەی زانیاری نێودەولەتی زاراوەکان infoterm) هەروەها دەتوانین (ویستەر ١٩٥٥) و (سکولمان ١٩٧٠) بە پێشەنگی ئەو زانایانە دابنێین کە یارمەتی دامەزراندنی زانستی زاراوەسازی هاوچەرخیان دا، هەروەها (هوم ستوورم - ١٩٧٠) بەیەکەم کەس دادەنرێت کە کاری لە دامەزراندنی زانستی زاراوەسازیدا کرد – بە کارێکی سیاسی دانا – ئەوکاتەی لە ڕێکخراوی یونسکۆ کاری دەکرد و ئێستا پێی دەوترێت ئەنفۆتێرم – Infoterm [3].

لە ساڵی (١٩٧١) بە هاوکاری نێوان یۆنسکۆ و حکومەتی نەمسایی ئەو بنکەیە دامەزرا. پرۆفیسۆر (هەڵمۆت فلبر - Felber) مامۆستای زاراوەسازی لە زانکۆی ڤییەنا، بە چالاکی فراوان لەو بوارەدا ناسراوە و سەرپەرشتی دەکات[4]، ئەم بنکەیەش بەردەوام بوو لە بەستنی کۆڕی جیهانی لەمەڕ گیروگرفتە تیۆریی و ڕێبازەکانی زاراوەسازیدا و گیروگرفتی

---

پەرەسەندنی یەکخستنی پێوانەیی و ئەو چالاکییانەی پێوەندی پێوەی هەیە لە سەرئاستی جیهانی جێ بەجێ بکات.

[1] د. علي القاسمی، مقدمة في علم المصطلح، ص ١٢.

[2] د. ايناس كمال، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث، ل ٢٧.

[3] سعد القحطاني، قضايا في المصطلح العربي، مجلة (الفيصل)، ل١١.

[4] د.علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ل١٣-١٤.

هاوواتا و پێناسەکانی زاراوەسازی و چەندین باسی تر لە باسەکانی زانستی زاراوەسازیدا. ئەم بنکەیە چەندین کۆڕ و سیمیناری جیهانی بۆ ئەم مەبەستە سازکرد، یەکێ لەوانە کۆڕێکی جیهانییە لەبارەی هاوکاری نێودەوڵەتی لە مەیدانی زاراوەکاندا، کە لە ڤییەنا لە ساڵی (١٩٧٥) بەسترا[١] لە ئاکامی ئەم سیمینارەدا، بنکەکە ڕێبەرێکی بەناوی ڕێکخراوە بەرکارەکان لە بواری زاراوە و چالاکییەکانیاندا دانا.

ئەم بنکەیە بەهاوکاری ئەکادیمیای زانستی سۆڤییەتی – بنکەیەکی زانستیی نێودەوڵەتییە بۆ زاراوەکانی (انفۆتێرم – infoterm) لە مۆسکۆ دانا، سەبارەت بە کێشە تیۆری و پرۆگرامییەکانی زاراوە. هەروەها بنکەکە لە ڤییەنا لە (٢٧-٣٠) تشرینی دووەمی (١٩٧٩)دا سیمینارێکی بۆ لێکۆڵینەوە لە فەرهەنگنووسی و پێوەندی زاراوەسازی بە زانستەکانی دیکەوە و پێویستی گەشەپێدانی بانکی زاراوەکان بە تایبەتی لە بوارە دیاریکراوەکاندا سازکرد[٢]، کۆڕەکەش لە کۆتایی کۆبوونەوەکانیدا پێشنیازی پتەوکردنی هاوبەشی گۆڕینەوەی بیروڕا لەسەر هەردوو ئاستی نیشتمانی و جیهانی کرد بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی تیۆری و پرۆگرامی...هتد. دوایەمین کۆبوونەوە لەبارەی زاراوەسازی (سیمینارێکی جیهانی لەبارەی گیروگرفتەکانی هاوواتایی و پێناسەکانی زاراوەسازی، کە لە (کۆبیك) لە کەنەدا لە حوزەیرانی (١٩٨٢) بەسترا – هەروەها سیمینارێکی تایبەت بە زاراوەسازی لە کۆنگرەی جیهانی فەرهەنگسازیدا

---

[١] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل١٣.

[٢] د.علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ل١٥-١٦.

له زانکۆی (ئەکستەر) لەئەیلولی (١٩٨٣)دا پێشکەش کرا[1]. بۆیە گۆڕان و پێشکەوتنی خێرا لە زانست و تەکنەلۆژیا، هۆیەکی سەرەکی بوون بۆ زێدەبوونی چەمکەکان تا ئەو ئاستەی وشەکانی زمان بەشیان نەکات، لەبەرئەوە پێویست دەکات بە دوای شێوازی چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتەدا بگەڕێین و بە شێوەیەکی زانستیانە هەوڵی دۆزینەوە و هەڵبژاردنی دانانی زاراوەی نوێ بدەین، کە بە وردی ئەو چەمکانە دەرببڕن، لەبەرئەمە زانستی زاراوەسازی سەری هەڵدا، کە زانستێکی هاوبەشە لە نێوان زمانناسیی و ژیربێژی و... بوارە تایبەتمەندییەکانی زانست بایەخ بە سێ لایەن دەدات:

١- پێوەندیی نێوان چەمکە ئاوێتەکانی (ڕەگەز، جۆر، گشت، پاژ) کە وێنەی پێڕەوی چەمکەکان پێکدێنێت و بۆ دانانی ئەو زاراوەیەی لە زانستێك دەریدەبڕێت بنچینەیە.

٢- لە زاراوەکانی زمان دەکۆڵێتەوە و پێوەندی نێوانیان و ئامرازی دانانیان و پێڕەوی نواندنیان لە پێکهاتەی زانستێك لە زانستەکاندا — بەو واتایە زانستی زاراوەکان لقێکە لە لقەکانی زانستی وشەڕۆنان و زانستی گۆڕانی هێمای وشەکان (Semasiology).

٣- زاراوەسازی لە ڕێبازە گشتییەکانی، دەگاتە پێکهێنانی زمانی زانستی و تەکنیکی، بێ لەبەرچاوگرتنی بە جێهێنانی لە زمانێکی

---

[1] د.علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ل١٦-١٧.

سروشتی دیاریکراودا دەکۆڵێتەوە[1]. ئەمە دەربارەی گرنگترین قۆناغە مێژووییەکانی سەرهەڵدانی زانستی زاراوەسازی و پەرەسەندنی، تا بووە زانستێك کە هاوشان لەگەڵ ئەو گەشەسەندنەی ئێستا بەرپابووە لە گشت بوارەکانی زانست و تەکنەلۆژیادا و لەگەڵ داواکارییەکانی ئەم سەدەیەدا دەربکەوێت و ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ بکات، کە هەردەم پێویستی بە ڕێگای تازە دەبێت بۆ کۆکردنەوەی زاراوەی زانستی و چارەسەرکردنیان و ڕێکخستن و یەکخستنیان.

---

[1] محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی کوردیدا، ل٤٦-٤٧.

# کورتە مێژوویەکی زاراوەسازیی کوردی

زاراوەسازی وەك زانستێك، لە نێو گەلی کورددا، زانستێکە، بایەخێکی زۆری پێ نەدراوە و، مێژوویێکی دێرینی نییە و زۆر کەم وتار و باسی لە بارەوە نووسراون و، کاری زانستیی کەمی بۆکراوە و، ئەوەی کراوە و نووسراویشە، زۆربەیان وەرگێڕانە لە زمانەکانی ترەوە، چونکە زۆر ڕوون و دیارە کە هەتاکو ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی بەزمانی کوردی لە بارەی زاراوە و زاراوەسازییەوە نە نووسراوە و ئەوەی لەم ڕووەوە بەردەست بکەوێت، چەند لیستەو نامیلکەیەکی پرژوبلاون، کە دانەرەکانیان لەو ساڵانەی کاریان تێداکردووە، بەبێ ڕێبازێکی زانستیی بۆ تۆمارکردنی زاراوەی جۆربەجۆر دایان ناون[1] وەك هەموو میللەتێك هەر کەم تەرخەمی و لاوازی و دواکەوتووییەك لە هەربوارێکدا هۆی خۆی هەیە و بەپێی کات و بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریی چینەکانی کۆمەڵ دەست بەسەریدا دەگیرێت و، بەرەو نەمان دەچێت، ئێمەی کورد لە هیچ ڕوویەکەوە بۆمان نەلواوە بتوانین بایی پێویست، بگرە دەیەکی پێویست، ئامادەی زاراوەسازیی بین. سۆز وا دەکات لێرە و لەوێ مێرخاسێکی کورد بە ئەرکی ماددیی و بە ڕادەی لێهاتوویی خۆی، خەریکی

---

(١) د. کامل حسن البصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە ، ل ٣– ٤.

گرتنی بەشێکی ئەو کەلێنە زلەی زاراوەی کوردیی بێت[٢]، بێ گومان هەوڵنەدان و دواکەوتوویی کوردیش لە بارەی زانستی زاراوەسازیدا، وەنەبێت لە خۆڕابێت، بەڵکو هۆکاری زۆرە و وەنەبێ هەر گەلی کوردیش وابێت، بەڵکو زۆرینەی گەلان لەم بوارەی زانست هەمان گیروگرفتیان هەیە، بۆیە بابەتی زمان لە ململانێی ئابووریی و ڕامیاری و نەتەوایەتیدا بوو بە کێشەیەکی زیندوو و ئەرکی چەکی مان و نەمان دەگێڕێ، هۆکاری ئابووری، نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی ڕۆڵێکی گرنگ لە سستبوون و بەرەوپێشچوونیدا دەبینێ[٣]، وەك هەر زمانێکی دیکە، زاراوە لە دێرزەمانەوە لە زمانی کوردیشدا هەبووە و بە پێشکەوتنی زمانی کوردییەوە پەیوەست بووە و شتی وای لەسەر نووسراوە. هەروەها هۆکاری ئایینیش تا ئاستێکی زۆر کاریگەریی لەسەر زمان لەنێو هەموو چین و توێژەکان هەیە، خەڵکانێکی زۆر بەشێوەیەکی ئاسایی لەخۆڕا بەسەریاندا زاڵبووە، تاسەر ئێسك کاری تێکردوون و دەروێشانە ئامادەن هەموو وشە و زاراوەیەکی کوردی بکەن بە قوربانی گۆڕەپانی بەردەرگای بەهەشت بێ ئەوەی لە ڕاستی کێشەکە بگەن[١].

زاراوە لە زمانی کوردیدا بە ڕێگایەکی نا هەمواری پێشکەوتندا تێپەڕیوە و هەمیشە لە کێشەدا بووە، بەڵام هیچی لەبارەوە نەنووسراوە و لێی نەکۆڵدراوەتەوە. مێژووی زاراوە لە زمانی کوردیدا بە مێژووی پێشکەوتنی

---

(٢) مسعود محمد، زاراوەسازی پێوانە، ل٨.

(٣) عەبدولڕەحمان عوسمان، زاراوەزانی و زاراوەی زانستی کوردی، گۆڤاری ((بانە ڕۆژ))، ژمارە (٢١)، ل ٦٢.

[١] هەمان سەرچاوە، ل ٦٢.

زمانی کوردییەوە پەیوەستە[٢]، بۆ ئەمە ئەگەر سەیری کاری فەرهەنگنووسیی کوردی بکەین، ئەوە کێشەی زاراوەی کوردی دەبینین. بە وێنە لە (نەوبەهار)ی ئەحمەدی خانی و (ئەحمەدیی)ی شێخ مەعروفی نۆدێیی و (الهدية الحميدية في اللغة الكردية)ی یوسف ضياء الدين خالیدی پاشا و... دا گەلێك زاراوەی وەها تۆمارکراون کە تائێستا سەرچاوەن و پەنایان بۆ دەبەین[٣] شێخ مەعروف نۆدێیی هەندێ وشەی وەك (پشتیر)ی بەرانبەر بە (اصطبل) و، (شاگرد) ی بەرانبەر بە (تلميذ) و، (نەوە) ی بەرانبەر بە (حفيد) و،..... هتد داناوە و بەکارهێناوە، ئەو کێشەی زاراوەی ئەو دەمەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە[١]، لەم ساڵانەی دواییشدا مامۆستایان (گیو موکریانی و مەردۆخ و شێخ محەممەدی خاڵ و تۆفیق وەهبی و قەناتی کوردۆ...هتد، لە فەرهەنگەکانیاندا گەلێك زاراوەی کوردییان تۆمار کردووە، بەوەدا پێشکەوتن و گەشەکردنی زاراوەی کوردیمان بۆ دەردەکەوێ[٢]. بە وێنە مامۆستا گیوی موکریانی وشەی (هەندەران)ی بۆ (خارجية) و (شارەوانی) بۆ (بلدية) داناوە. مامۆستا مەردۆخ (پاژ)ی بۆ (جزء) و (ڕژد)ی بۆ (حريص) بەکارهێناوە. مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ (پەیجور)ی بۆ (تحقيق الشرطة) و (وەرزش)ی بۆ (رياضة) تۆمارکردووە، مامۆستا تۆفیق وەهبی (پار)ی بۆ (فصل الكتاب) و

---

[٢] ڕۆژان نووری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل١٤.

[٣] ئەنجومەنی کۆڕ، لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٥، ل ٤٩٨.

[١] هەمان سەرچاوە، ل٤٩٨.

[٢] هەمان سەرچاوە، ل٤٩٨ — ٤٩٩.

(دادخواز) ی بۆ (مشتکی) گوتووە. مامۆستا قەناتی کوردۆ (بەرەڤان)ی بۆ(حکم) و (فێرگە)ی بۆ (مدرسة) نووسیوە... هتد[٣].

هۆی نەبوونی نووسینێکی وا لەسەر زانستی زاراوەسازیی لەلای کورد، کە بتوانرێت بەشێوەیەکی تیۆری ڕێڕەوێك بێت بۆ چۆنێتی دانان و وەرگێڕان و داڕشتنی زاراوە، بەڵام شارەزابوون و پسپۆڕی پەیداکردن لە بواری پڕاکتیکدا دەبێتە هۆی سەرکەوتنی. لەسەردەمی سستی و لاوازی زمانی کوردی بەرانبەر بە زاراوە لە ساڵەکانی پێشووی ئەم سەدەیەدا، چەندان وشەی عەرەبی وەك (حج، زکاة،... هتد) و فارسی (پەیوەندیی، پوزشت،... هتد) و تورکی وەك (قاپی، قەرە،... هتد). لەناو زمانی کوردیدا دەبینرێن، بەڵام لەگەڵ پێشکەوتن و پەرەسەندنی ژیانی سیاسی و ئابووری و زانستیدا، زاراوە پەرەی سەند و پێویستی بەوە کرد کە گرنگی پێ بدرێ و لێی بکۆڵرێتەوە و وشەی جوان و ڕاست و گونجاو و لەبارو ڕەسەنی کوردی بدۆزرێنەوە و، دابنرێن و، دابڕێژرێن و دابتاشرێن[١]، گەلی کوردیش وەك هەر گەلێکی تر لە ئەنجامی پێشکەوتن لە گشت بوارەکانی زانستدا، پێویستی بەگەلێ زاراوەی کوردی دەبێت و کاتێك کتێبەکانی خوێندن کران بە کوردیی پێویستی وەرگێڕانی ئەو زاراوانە هاتە کایەوە، بۆیە کاتێك خوێندن لە عێراقدا بوو بەکوردیی، گەلێك زاراوەی زانستی دۆزرانەوە و زیندووکرانەوە و، گەلێکی تریش تازە داڕێژراون و داتاشراون. پاش ئەم ڕوونکردنەوە کەمە دەتوانین مێژووی سەرهەڵدانی

---

[٣] هەمان سەرچاوە، ل ٤٩٩ .

[١] ئەنجومەنی کۆڕ، لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٥، ل ٤٩٩– ٥٠٠.

زاراوەسازیی کوردیی بگەڕێنینەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم. د. جمال نەبەز لەم بارەیەوە دەڵێت: یەکەمین هەوڵدان بۆ دانانی زاراوەی زانستی بۆ زمانی کوردی لە ساڵانی (١٩٥٢– ١٩٥٣)دا، دراوە[٢]. یەکەمین هەوڵدان بەکردەوە ئەوْ فەرهەنگۆکە زانستانەیە، کە بۆ کتێبی (سەرەتای میکانیك و خۆماڵەکانی مادە) لە (١٩٥٧)دا تەواو بووە و لە بەهاری ساڵی (١٩٦٠)دا، کەوتۆتە بەردەست خوێنەرەوە هەر پاش ئەمەش بەماوەیەکی کورت نامیلکەی (هەندێك زاراوەی زانستی) خراوەتە بازێڕەوە بەڵام مێژووی دانان و داڕشتن و دۆزینەوە و هەڵبژاردن و وەرگێڕانی زاراوە لە زمانی کوردیدا، بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە، تا لە ساڵانی (٦٠) ئەم کارە بەشێوەیەکی سست و سادە و ساکاربوو، بەرهەمی ئەم دەورە بریتییە لە: فەرهەنگۆکەی ڤ. نیکتین، کە لەساڵی ١٩١٦ لە ورمێ بڵاوی کردەوە، فەرهەنگۆکی زاراوەی زانستی ئەرمەنی – کوردی، کە لە ساڵی ١٩٣٥ز لە یەریڤان چاپکراوە، لیستەی ئەو زاراوە کۆمەڵایەتی و سیاسیانەی جەلادەت عالی بەدرخان لە بەشێکی تایبەتی گۆڤاری (هاوار)دا، لە ژێر ناوی (فەرهەنگۆك)دا تۆماری کردوون، ئەو زاراوانەی مامۆستا عەلائەددین سەجادی لە گۆڤاری (نزار)دا، ئەو زاراوانەی تۆفیق وەهبی لە گۆڤاری (گەلاوێژ) و هەروەها ئەو زاراوانەی کە لە گۆڤارەکانی (گەلاوێژ، ژین، دەنگی گێتی تازە، هەتاو،...)دا، خراونەتە بەرچاو خوێندەواران، واتا، دوای سەرەتای سەدەی بیستەم، تا نزیکەی ساڵی

---

[٢] د. جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، ژمارە (٢٢)، ل ٩٥.

پەنجاکانی هەمان سەدە، کاری زاراوەسازیی شتێکی وای بەخۆیەوە نەدی و، گۆڕانێکی وای تێدا دەرنەکەوت، تا خولی دووەم کە لە شۆڕشی چواردەی تەممووزەوە دەست پێدەکات و پەرەدەستێنێ. کاتێك خوێندن لە زۆربەی خوێندنگاکانی کوردستان کرایە کوردیی، پێویستی زاراوەی زانستی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی و پەروەردەیی و چەندین بواری دیکە هاتە پێشەوە، بەم بۆنەیەوە مامۆستایانی کوردستان چەند لیژنەیەکیان پێکهێنا و کۆمەڵێك زاراوەی پێویستیان دانا و، لە گۆڤاری (ڕۆژی نویٚ)دا بڵاویان کردەوە[1]، ئەم کارەش بێگومان لە سنووری قوتابخانە دەردەچێت و، فراوانتر دەبێت و، چەندین پسپۆری دڵسۆز و هەندێ دامودەزگای کوردی و لیژنەی تایبەتی خۆیان بە دانانی فەرهەنگ و زاراوە درووست کردن خەریك کرد. بەرهەمی ئەو خولە بریتییە لەو زاراوە زانستیانەی لەلایەن چەند لیژنەیەکی تایبەتی جیاوازەوە دانراون و داڕێژراون و لە چەند ژمارەیەکی گۆڤاری (ڕۆژی نویٚ)ی ساڵی ١٩٦٠ دا بڵاوکراونەتەوە.... دوابەدوای ئەم زاراوانە لەلایەن نەقابەی مامۆستایانی سلێمانییەوە فەرهەنگۆکی زاراوەی زانستی دەرچوو.

ساڵی ١٩٦٠ مامۆستا جمال نەبەز لەژێر ناوی (هەندێك زاراوەی زانستی)دا، فەرهەنگۆکێکی لە چاپدا، لە ساڵی ١٩٦٠-١٩٦١ یشدا بە ڕۆنیۆ سەد نوسخەیەکی لەژێر ناوی (فەرهەنگۆکی زانستی)دا بڵاوکردەوە، یەکەم _ نزیکەی سێ سەد، و دووەم _ دەوروبەری سێ هەزار زاراوەیەك

[1] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل ١٥.

دەبێت[1]، لە دوای ئەم کارانە بۆ ماوەی دە ساڵێك هیچ کارێکی وا بەئەنجام نەگەیەندرا و هیچ بەرهەمێکی لەم شێوەیە دەرنەچوو، تامۆرکردنی بەیانی یانزەی ئازار، کە جموجووڵێکی بەرچاوی لەم بوارەدا بەرچاوکرد. لە ساڵی١٩٧١، لەلایەن لیژنەیەکی تایبەتییەوە (فەرهەنگۆکی زاراوەی پارێزگای سلێمانی) لە چاپ درا. ئەم فەرهەنگۆکە نزیکەی (١٤٠٠) وشەیەك دەبێت، کە ژمارەیەك لە زانا و مامۆستای بەتوانای کورد بەشداریی و هاوبەشییان لە دەرچوونیدا کردووە. فەرهەنگۆکەکەش بریتییە لە کۆمەڵێك وشە و زاراوەی عەرەبی – کوردی، کە بۆ مەبەستی نووسین لە دامودەزگاکانی فەرمانیدا دانراون. (بەڕێوەبەرێتی گشتی خوێندنی کوردیی) لە ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٧٢ی گۆڤاری (پەروەردە و زانست)ی خۆیدا، کە ١٩٦ لاپەڕەیە[1] بڵاویکردۆتەوە، بریتییە لەو زاراوانەی بۆ خوێندنگە و قوتابخانەکان پێویستن...، هەروەها بەرهەمەکانی مامۆستا (کەمال جەلال غەریب) بەناوی (فەرهەنگی زانیاری) ساڵی ١٩٧٤ لەم بوارەدا ڕۆڵێکی بەرچاویان هەیە.

لەم بارەیەشەوە نابێت هەوڵی گەورە و مەزنی کۆڕی زانیاریی کورد لە سەرەتای دامەزراندنییەوە تاکو ماوەیەکی زۆری بێ وچان، لە دانانی زاراوە بەشێوەیەکی زانستی و فراوان لەبیر بکرێت، گرنگیی بەم مەسەلەیە داوە و ڕێبازێکی زانستی دیاری کردووە، بۆ ئەوەی لەسنووری تواناندا بتوانێت بەرهەمێکی ڕێك و گونجاو بخاتە بەردەست. ئەوەبوو توانی لە چەندین ژمارەی

---

[1] گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (دووەم)، بەشی (دووەم) ، ل ١٦٧–١٦٨.

[1] گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (دووەم)، بەشی (دووەم) ، ل ١٦٨.

گۆڤاری کۆڕدا باسی دانان و جۆراوجۆریی زاراوه بکات[*]. هەوڵ و تێکۆشان و شەونخونیی زمانەوان و نووسەران و دامودەزگا و کۆڕ و.... خەڵکانی تر لەم بوارەدا بۆ پێشخستنی زاراوەسازی کوردی بەردەوام بوو و لە دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی گەلەکەمان لە ساڵی ١٩٩١ دا و لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا و ئێستاشی لەگەڵدا بێت، زاراوەدانان و بایەخ بە زاراوەسازی کوردی گوڕ و تینێکی چاکی بەخۆیەوە بینیوە و پەرەی سەندووە و بەپێی پێشکەوتنی زانست و زانیاریی و فراوان بوونی ڕاگەیاندن و ئاڵوگۆڕی زانیاری لەگەڵ میللەتانی دیکەدا، لە ڕێگەی ئینتەرنێت و فاکس و ئامرازەکانی دیکەی گەیاندنەوە. ئێستاش لە کوردستانی ئازاددا کۆڕی زانیاریی کوردستان بەهەمان ڕێچکەی کۆڕی زانیاریی کورد لە بەغدا، هەوڵ دەدات هەنگاوی باش لە دانان و دروستکردنی زاراوە و بایەخدان بە زاراوەسازیی کوردی بنێت [*] لە ڕێی

---

(*) بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٣، ل ٤١٩-٥٢٦. =

بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٤، ل ٨٩٤-٩٤١.

بەرگی دووەم، بەشی دووەم، بەغدا، ١٩٧٤، ل ١٦٦-٢١٨.

بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٥، ل ٤٩٧-٥٤٢.

بەرگی سێیەم، بەشی دووەم، بەغدا، ١٩٧٥، ل ٥٢٦-٥٥٣.

بەرگی چوارەم، بەغدا، ١٩٧٦، ل ٤٣٣-٤٧٥. =

بەرگی چوارەم، بەغدا، ١٩٧٦، لیستەی شەشەمی زاراوەکانی کۆڕ، ل ٤٧٦-٤٩٧.

(*) بڕوانە:

لیژنەی تایبەت و پسپۆڕ بە زانستی زاراوەسازی و هەروەها، وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستانیش هەر لە ڕۆژی دامەزراندنییەوە لایەنی فەرهەنگ و زاراوەی بابەتەکانی خوێندنی فەرامۆش نەکردووە، لاپەڕەکانی گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی) شایەتی ئەوەن، کە هەر لەژمارە (٤)ی ئەم گۆڤارەوە هەرجارە و کۆمەڵێك زاراوەی پێویست بە هەرسێ زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی بڵاودەکاتەوە، هەروەها (فەرهەنگی مامۆستا)شی لە چاپ داوە، کە زاراوە جۆربەجۆرەکانی هەموو بابەتەکانی خوێندنی تێدان[1].
بۆیە ئەرکی سەرشانی هەموو چینێکی کۆمەڵە بایەخ بە دانانی زاراوە و زاراوەسازیی کوردی بدات، بەتایبەتی دوای ڕزگاربوون لە ستەم و زۆرداری کە بووبووە کۆسپ لەبەردەم پێشکەوتن و پەرەسەندنی زاراوە و زاراوەسازیی، بەڵام ئێستا لەژێر سایەی ئەم ئازادیی و دیموکراسییەدا، هەموو کەسێك لە ئێمە دەتوانێت بە زمانی دایك بخوێنێت و بنووسێت کە پێشتر ئەم بوارە فراوانەی ئێستا وانەبوو، کە تاکی کورد بتوانێت گوزارشت لە هەموو شتێ بکات، چونکە دەچووە خانەی قەدەغەوە و بەتایبەتی ئەوانەی تایبەتن بەلایەنی

---

أ- زاراوەی یاسایی، ئامادەکردنی: لیژنەی زاراوە لەکۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٤، ئەم نامیلکەیە (٤٠) لاپەڕەیە.
ب- زاراوەی کارگێڕی، ئامادەکردنی: لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٤، ئەم نامیلکەیە (٤٧) لاپەڕەیە.
(١) محەمەد ئیسماعیل، ئەم هەنگاوەی لقی هەولێری یەکێتی نووسەران، هیوایەکی گەشە لەڕێی دانانی فەرهەنگی یەکگرتووی کوردی، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٩)، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ١٧-١٨.

سیاسی و باسکردن له بارەی ڕەچەڵەك و نەژادی کورد و بایەخدان بەزاراوەی کوردی و تەنانەت ناونانی منداڵ بەناوی کوردیی لە هەندێ لە شارەکانی عێراقدا، وەك کەرکووك بۆ نموونە. واتە دەشێت بڵێین، سەرهەڵدانی مێژووی زاراوەسازیی کوردی دوو قۆناغی بڕیوە:

یەکەم- قۆناغی پەیدابوونی دێرین، کە لە ناخی زمانی کوردییەوە هەڵقوڵاوە و پێگەیشتووە و چەسپیووە.

دووەم- قۆناغی دانان و سازکردنی، کە تا ئێستا بەهۆی یەکێك لەم ڕێبازانەوە سازدەکرێت: وەرگرتن، ئاوەڵواتا، لێکدان، داتاشین، دارشتن، پێوانە، وەرگێڕان. (1) (*)

---

(1) جەمال عەبدول، بەرکۆڵێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی، یەکەم چاپ، چاپخانەی (قەشەنگ)، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ١٢.

(*) هەروەها لە بارەی مێژووی زاراوەسازی کوردییەوە، بڕوانە.

أ – عبدالرزاق بیمار، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، بەغدا، ١٩٨٦، ل ٢٨٦–٢٨٧.

ب– ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل١٤–١٦.

پ– محمد وەسمان، گیروگرفتی زاراوەدانان لە زمانی کوردیدا، ل١٠–١٣ .

.......... چەندین سەرچاوەی تریش.

# تیۆرە گشتییەکانی زاراوەسازی

وەك چۆن هەموو زانستێك تیۆری گشتیی هەیە، بۆ لێدوان و پەرەسەندنی و ئەو ڕێگایانەی، دەبێت لەسەریان بڕوات بۆچوونە نێو باسەکانیانەوە و چۆنێتی باسکردنی ئەو تیۆرە گشتیانەی، کە دەبێت بەکاری بهێنێت. زانستی زاراوەسازییش بەهەمان شێوە لەسەر بنەمای ئەو تیۆرە گشتییانەدا، کە تایبەتن بەزاراوەسازی، باسەکانی خۆی کۆ دەکاتەوە و لێیان دەدوێت. وەك چۆن زانستی زمانی گشتی باس لە سروشتی زمان و سیستەمەکەی بەگشتی دەکات. بەو شێوەیەش زانستی تایبەتی زمان، باس لە زمانێکی تایبەتی دەکات بە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەوە بۆیە تیۆری گشتی زاراوەسازییش باس لە بنەما گشتییەکانی دەکات، کە سنووری دانانی زاراوە دیاری دەکەن[1] (*). ئاشکرایە یەکخستنی زاراوە زانستییەکان، هەوێنی دابینکردنی یەك زمانی زانستییە، ئەویش ڕێگا خۆشکەرە بۆ پێکهێنانی یەکێتی نەتەوەیی، بۆ جێبەجێکردنی ئەم پڕۆسەیە پێویستە:

---

[1] د. علی القاسمی، مقدمة في علم المصطلح، بغداد، ١٩٨٥، ل ١٩– ٢٠.

(*) هەروەها لەبارەی هەمان باسەوە، بڕوانە:

– محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوە دانان لە زمانی کوردیدا، ل ٤١– ٤٢.

١- (تیۆری گشتی زاراوەسازی) بنەماکانی زاراوەسازی زانست و تەکنەلۆژی بەزمانی کوردی بخوێندرێت.

٢- درووستکردنی بانکی زاراوە، وەك دەزگایەکی سەربەخۆ.

٣- دامەزراندنی کۆڕێکی زانیاری، وەك دەزگایەکی ئەکادیمی و دەسەڵاتدار.

٤- هاندانی لێکۆڵینەوە و نووسین لەمەڕ بابەتی تیۆری گشتی زاراوەسازی و تیۆری تایبەت بەزاراوەکان[٢] بۆ لێکۆڵینەوە لە سیستەمی واتاکان لە بوارە جیاجیاکانی زانست و زانیاری بۆ ئاسانکردنی دانانی زاراوە بەرانبەریان، بەم پێیە دەتوانین لە زانستی زاراوەسازیدا دووجۆرە تیۆر دیاری بکەین:

یەکەم: تیۆری گشتی.

دووەم: تیۆری تایبەتی.

زۆربەی توێژەرانی زاراوەسازیی ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە ئەنجامی توێژینەوەکانی تیۆری گشتی زاراوەسازی، وەك بنچینەی گەشەکردنی بنەما فەرهەنگییە زاراوەسازییەکان و یەکخستنیان لە بواری جیهاندا وایە.

گرنگترین بابەتەکانی توێژینەوەی تیۆری گشتی زاراوەسازی ئەمانەن: سروشتی چەمکەکان و پێکهاتن و تایبەتمەندییەکانیان و پێوەندیی نێوانیان و سروشتی پێوەندیی نێوان چەمك و شتە تایبەتمەندەکە و تەرخانکردنی زاراوە بۆ چەمك و بە پێچەوانەشەوە، بار و سروشتی

---

[٢] ڕۆژان نوری عبداللە، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل ١٧- ١٨.

زاراوەکان، بەڵام تیۆرە تایبەتەکانی زاراوەسازی، وا باسی ئەو بنەمایانە دەکەن، کە باری زاراوەیە لە بوارەکانی زانیاریی تایبەتمەندا، وەك کیمیا و زیندەوەرزانی و پزیشکی و هیی تریش[*].... چەند ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی تایبەتمەند هەریەکەیان لەبواری تایبەتی خۆیدا، بەشداری لە گەشەپێکردنی تیۆرییە تایبەتییەکانی زاراوەدا دەکەن، وەك ڕێکخراوی درووستیی جیهانی و دەستەی نێودەوڵەتیی تەکنیکە کارەباییەکان و هێشتا توێژینەوە لە تیۆرییە تایبەتییەکانی زاراوەسازی لە باری نەشونمادان. لە بارەی ئەو تیۆرانەوە، بە تایبەتی تیۆری گشتی[1]، توێژەران بایەخیان بەوەدا کە باسەکانی لێکۆڵینەوە لە تیۆری گشتی زاراوەسازی لە سێ بواری سەرەکی ئەنجام بدرێن:

---

[*] بڕوانە:

(أ) ئیبراهیم ئەمین باڵدار، زاراوە و زمان لە کاروانی زانیاریی ئەمڕۆدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٢)، بەغدا، ١٩٨٦، ل ٢١٦.

(ب) جەمال عەبدول، بیردۆزی گشتی زاراوەدانان و یەکخستن و تۆمارسازی....، گۆڤاری (وەشت)، ژمارە (١)، ل ٩ — ١٠. =

(پ) جەمال عەبدول، زاراوەسازی و زانستاندنی زمانی کوردی، گۆڤاری ئەکادیمی کوردی، ژمارە (٧)، ل ١٦٨— ١٦٩.

(ت) محەمەد وەسمان ، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان...، ل٤١ — ٤٢.

(ج) د. ایناس کمال الحدیدی، المصطلحات النحویة في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحدیث، ل ٣٠.

[1] جەمال عەبدول، زاراوەسازی و زانستاندنی زمانی کوردی، گۆڤاری ئەکادیمی کوردی، ژمارە (٧)، ل ١٦٩.

١- واتاسازی -Sematics

٢- لیکسیکۆلۆژی - lexicology

٣- وشەسازی - Morphology

ئەگەر ئەم دیاریکردنە لە زاراوەسازییەوە نزیك بێت، دەبێت بوارە سەرەکییەکانی لەگەڵ بوار و زانستی تردا، چ لەگەڵ ژیربێژی و چ تیۆری زانیاری و یەکخستن (واتە توێژینەوەی بەڵگەنامەیی) و هەروەها پۆلێنکردنیش[1] (Classification) یەك بگرێتەوە، بۆیە لێرەدا دەتوانین زانستی زاراوەسازی بکەینە دوو لقەوە:

١- زانستی زاراوەسازیی گشتی.

٢- زانستی زاراوەسازیی تایبەتی[2].

یەکەمیان بریتییە لە: سروشتی چەمکەکان و تایبەتمەندی و پێوەندییەکان و ئەو پێڕەوانەی کە چەمکەکان لێیان دەدوێن، سروشتی زاراوەکان و پێکهاتەکانیان و نیشانە و هێماکان و جۆری وشە و زاراوەکان...، هەروەها بریتییە لە یەکخستنی زاراوەکان و... هتد، دووەمیان بریتییە لە: دەستووری تایبەتی زاراوەکان لە زمانێکدا، مەبەست لە زاراوەی زانستی لە بوارێکدا و ئەو تایبەتمەندی و بارودۆخانەی کە هەیەتی، ئەوەیە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە زانستی

---

[1] د. مولاي علی بوخاتم، مصطلحات النقد العربي السيماءوي الاشكالية والاصول والامتداد، منشورات اتحاد الكتاب العرب، دمشق – ٢٠٠٥، ل ١٥.

[2] د. محمود فهمي الحجازي، الآسس اللغوية لعلم المصطلح، مكتبة غريب، القاهرة،١٩٩٣، ص ٢٠.

زاراوەسازی بە تایبەتی خزمەتی زانستی زاراوەسازی گشتی بکات. لە ئاکامی لێدوان و باسکردن لە تیۆرە گشتی و تایبەتیەکانی زانستی زاراوەسازی، دەتوانرێت بۆ هەر زمانێك یان دۆزینەوەی زانیاری، دووجۆر تیۆر دیاری بکرێت:

١- تیۆری دەرگا خستنە سەر پشت بەبێ مەرج، بەڵام ئەم تیۆرە دەبێت بەربەست بکرێت، چونکە بە تێپەڕبوونی کات لەوانەیە ببێتە هۆی سستی و لاوازی زمانێك.

٢- تیۆری دەرگاخستنە سەرپشت بە مەرجەوە[1]. ئەم تیۆرەش تیۆرێکی باش دەبێت، چونکە لە سەربنەمای پلاندانانە.

[1] محەمەد مەلا کەریم و کەمال جەلال غەریب، هەڵبژاردنی زاراوەی کوردی، گۆڤاری (پەروەردە و زانست)، ژمارە (٦)، ساڵی (٣) بەغداد، ١٩٧٣، ل ٣٧ – ٣٨.

# بەشی سێیەم

تەوەرەی دووەم:

١- چەمك و پێناسەی زاراوە.

٢- وشە و زاراوە.

٣- گیروگرفتە بنەڕەتییەکانی دانانی زاراوەی کوردی.

٤- مەرجەکانی زاراوەدانان.

٥- مەرجەکانی زاراوەساز.

# چەمك و پێناسەی زاراوە

لە باسکردنی زاراوەدا پێویستە (چەمك)ی دیاری بکرێت و بە وردی پێناسە بکرێت ، ئایە چەمك چییە و پێوەندیی بە زاراوەوە چییە و جیاوازی نێوانیان چییە و سەرچاوەکانی چەمك و زاراوەکان چین؟ بۆ سنووردانان و جیاکردنەوەیان یەك بەیەك لێیان دەدوێین:

## پێناسە و ڕوونکردنەوەی چەمك:

ئەگەر زاراوەکە، وشەیەك یان دەقێکی بەکارهاتووبوو لە زماندا، دەستنیشانکردنی پێناسەی چەمك و بەدەرخستنی واتاکەی، یەکێکە لەو دۆزانەی کە کارێکی ئاسان نەبێت، تەنانەت لە فەلسەفەی تازەشدا — بەوەی کە لە نەژاددا سەر بە فەرهەنگی فەلسەفییە — فەرهەنگە فەلسەفییەکانیش جیاوازییەکی زۆریان بە خۆوە بینیوە لە پرۆسەی پێناسەکردندا، گرفتەکەش زیاتر دەبوو کاتێ واتای چەمکە بەکارهاتووەکەی میانەی ژیریێژی و فەلسەفی بەراورد بکرێت لەگەڵ واتای زاراوە زۆر بەکارهاتووەکەی گشت بوارە زانستییەکاندا، بۆ پەیبردن بە واتای چەمك.

لەبەر ئەو گیروگرفتانەی تووشی زاراوە دەبوون، هەندێ لە نووسەران و زمانەوانان دان بەوەدا دەنێن، کە زانستی زاراوەسازی زانستێکی سەربەخۆی تۆکمەیە، بەوەی کە گشت زانستێك پێویستی بە کۆمەڵێك زاراوەی دیاریکراو دەبێت، بە پێی ئەمە هیچ زانستێك بێ زاراوە نابێت[1]. گشت زانستێك پێویستی بە زیاتر لەیەك بوار لەبوارەکانی زانیاریی و پێویستی بە کۆمەڵێك زاراوەی وردی دیاریکراو دەبێت، کە لە ڕێیەوە بتوانێت گوزارشت لەو چەمکانەی کە پێویستی پێ دەبن بکات، لەسەر ئەم بنەمایە زمانەوانان هەستان بە جیاوازی نێوان زاراوە (Terme) و زاراوەسازی (Terminology).

گومانی تێدا نییە زاراوە ڕۆڵێکی بنەڕەتی و چالاکی لە پێکهێنانی زانیاری، لە هەر بوارێکی ڕۆشنبیریدا هەیە، لەسەر پێی خۆی ناوەستێ و پێش ناکەوێ گەر بێت و زاراوەی واتادار و ڕوونی ئەو بەرهەمە زانیارییە ئاراستە و ڕێبەریی نەکات، بە هەمان شێوەش ڕۆشنبیریی هەر نەتەوەیەك لە نەتەوەکان تووشی نەمان و لەناوچوون و تێکشکان دەبێت لەبەر گەلێك هۆ گرنگترینیان تێکچوونی واتای زاراوەکە و زۆربوونیان و نەچەسپاندیان و یەك نەگرتنی چەمکەکانە.

زاراوە لە زمانی کوردیدا هەرچەندە لە جەمسەری هێڵە گشتییەکانی زانستی زمان و لێکۆڵینەوەی زاراوە لە زمانەکانی ئەم سەر زەمینەدا یەك دەگرێتەوە، بەڵام هاوکات کێشەی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ نموونە تا ئێستا

---

(1) د.مولاي علي بوخاتم، مصطلحات النقد العربي السيماءوي الاشكالية والاصول والامتداد، ل٥١.

چەمكی زاراوە لە زانستی زمانی كوردیدا ڕەچاو نەكراوە و شوورەی جیاكەرەوەی لە چەشنەكانی تری وشە بۆ دانەنراوە و سەرچاوەكانی هەڵهێنجاندنی دەستنیشان نەكراوە و ڕێگای پەرەسەندنی خۆی نەگرتووە و ڕێبازەكانی لە دایكبوونی نەخراونەتە بەر تیشكی لێكۆڵینەوەیەكی زانستی و ئەكادیمی[1]، پێوەری ڕاستەقینەی سەركەوتنی زاراوەیەك لەوەوە هەڵدەقوڵێ كە ئەو زاراوەیە زمانی زۆربەی كۆمەڵانی پێڕاهاتووە.

چەمك بەرەو وشەیەكی تری بەكارهاتووی كتێبەكانی ژیربێژی و فەلسەفەوە دەچێت، ئەویش (وێناكردن)ە[*]، بە واتای (پەیدابوونی وێنەی وشەیەك لە عەقڵدا)یە[2]، بە واتایەكی تر، واتاكان وێنەیەكی بیریین لە ئاكامیدا وشەكان دانراون، ئەو وێنەیەی كە لە عەقڵدا پەیدابووە لەوەی مەبەست لە وشەكەیە بە واتا ناودەبرێت، هەروەها لەوەی ئەو وشەیەی لە عەقڵدا پەیدابووە ناو دەبرێت بە چەمك.

یەكێ لەو پێناسانەی چەمك، دەڵێت: بنیاتێكی عەقڵییە، هەروەها چەمك یەكەیەكی فیكرییە بەیەكەوە بە سیمای هاوبەش بەستراوە. هەروەها پسپۆران لە بواری زانستی زاراوەسازیدا پێناسەیەكی زۆر

---

(1) د.كامل بەصیر، زاراوەی كوردی هەڵسەنگاندن و لێكۆڵینەوە، ل١١.

(*) وێناكردن: مەبەست (التصور)ە، كە بە مانای (هێنانەپێش چاو، بەبیراهاتن، ڕامان، بیرلێكردنەوە، تێڕوانین...) دێت.

(2) انترنیت / تربوي اون لاین: عبدالرحمن حللي، المفهوم والمصطلح (تعاریفه واختلافاته ومصادره).

Tarbawy on line.com –mafahim ١.html

گونجاویان بۆ داناوە، بەوەی کە چەمك: هێمایەکی زمانی دیاریکراوە بۆ یەك چەمك. دووپاتیشی دەکەنەوە کە لە سەر دوو بنەمای سەرەکی ڕادەوەستێ، ئەویش: (هێمای زمانی) و (چەمك) کە فیلبەر (FELBER) بەم شێوەیە پێناسەی دەکات و دەڵێت: بریتییە لە بنیاتێکی عەقڵی – فیکری، لە شتێکی دیاریکراو داڕێژراوە. بە کورتی وێنەی هزریی (فیکری) شتێکە لە جیهانی دەرەوە و ناوەوەدا هەیە و بۆ ئەوەی بگەینە ئەو بنیاتە ئاوەزییەی هێمای بۆ دادەنرێت، بۆ ئەوەی گوزارشتی لێ بکات.

١- زانایانی زاراوەسازیی بایەخیان بە دیاریکردنی مەبەست لە (هێمای زمانی) کە گوزارشت لە چەمك دەکات داوە و جیاوازیی نێوان سێ جۆر لە هێما زمانییەکانیان کردووە[١].

لێرەدا پێوەندیەکی ژیربێژی لە نێوان زاراوە و چەمکدا هەیە، ئەم پێوەندییەش ڕێکخەرە، بەڵام ئەو پێوەندییە لە نێوان ناو و ناونراودا نییە، بۆ نموونە ئەگەر ویستمان زاراوەیەکی وەك (گەیەنەر) بۆ ئامێرێك دابنێین و ببێتە زاراوە، پێویستە ئەو ئامێرە کاری ئەوەی ببێت یان تایبەتمەندیی گەیاندنی هەبێت، ئەمەش پێوەندییەکی ژیربێژییە کە دەبێت لە نێوان زاراوە و چەمکەکەدا هەبێت، بەڵام ناو، لەوانەیە ناوی یەکێك بنێین (سالار)، لە واقیعیشدا (سالار) نەبێت.

---

(١) انترنيت: صوت العربية www.alarabiyah.ws/section.php?getsectionid=٣٠د.علي توفيق الحمد، في المصطلح العربي (قراءة في شروطه وتوحيده).

له ڕوانگەی ئەوەی باسکرا له بارەی چەمك و پێناسه جۆر بەجۆرەکانییەوە دەتوانرێت تێبینی ئەوە بکرێت، که چەمك له بنیاتی زانیاریی و دەرك پێکردنی جیهانی دەوروبەر بەکاردێت و ئەو ڕێبازە فیکرییه جۆربەجۆرانەش پێناسەی جیاوازیان بۆ چەمك دانا. لەوەوە قورسی دیاریکردنی پێناسەی چەمکمان بۆ دەردەکەوێت، بەڵکو ئێستا پێناسەیەکی گونجاوی پێویست که هەموو لایەنەکانی لەخۆ بگرێت له ژێر دەست نییه.

دیاریکردنی چەمك و بەرهەمهێنانی به گشتی پێوەنده، به ڕۆشنبیری و زانیارییەوە، چ پێوەندبێت به زانسته ڕۆشنبیرییەکان یان زانسته سروشتییەکان، که ئەمیش پێوەندیەکی بەهێزی به هێما و زمان و بواری واتایی و زۆربەی زۆری ئەو لایەنانەی بەشداری له درووستکردنی دەکەن هەیه[1]. گۆڕان و پێشکەوتنی خێرای زانست، هۆیەکی سەرەکی بوو بۆ زیادبوونی چەمك و واتاکان، تاوەکو ژیان بەرەو پێشتر بڕوات واتاکان بەربڵاوتر دەبن، بەئەندازەیەك که وشەکانی زمان بەشیان ناکەن، لەبەرئەوە پێویست دەکات به دوای شێوازی چاککردنی ئەم کێشەیەدا بگەڕێین و به شێوەیەکی زانستییانه هەوڵی دانان و هەڵبژاردنی زاراوەی نوێ بدەین که به وردی ئەو چەمکانه دەربڕن.[2]

---

[1] انترنيت: تربوي اون لاين on line.com المفهوم والمصطلح (تعاريفه واختلافاته ومصادره).

[2] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل١٧.

چەمکیش دوای جیابوونەوەی لە بوارە فەلسەفییەکەی ئالۆزتربوو، بۆ ئەوەی لە میانەی جیاوازییەکانی تردا بەکاربێت، لەوانە (زانستە زمانەوانییەکان و فەلسەفییەکان و ئەو زانستانەی تر، کە پێوەندییان پێوەی هەیە) تا وای لێ هات چەمك وەك هاوواتا لەگەڵ زاراوەدا بەکاردەهات، ئەمەش وامان لێ دەکات بۆ دەرکپێکردنی و پێوەندی بەچەمکەوە لە واتای زاراوە بکۆڵینەوە.

لەوانەیە چەمك و سیستەمەکانی لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر جیاوازبێت و زۆر پێویستە لەگشت زمانەکاندا هەمان شت بن، واتای زاراوە یان چەمك کە دەردەبڕدرێت لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر جیاوازە، ئەم دیاردە زانستییە یەکێکە لە گیروگرفتەکانی پێش پرۆسەکە، یان کاری گەیاندن یان گۆڕینەوەی زانیاری لەسەر هەردوو ئاستی نەتەوەیی و جیهانی[1]، بۆیە لێرەدا پێویست بوو زاراوەکان یەك بخرێن، یەکخستنێکی پێوانەیی لە سەر بنەمای ڕێککەوتن لەسەر چەمکەکان و سیستەمەکانی بنیاتنرابێت (بە واتایەکی تر لەسەر واتاکان و بوارە واتاییەکان) لەبەر ئەمە پسپۆران لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردی واتا جیاوازەکانی چەمك و سیستەمی چەمکەکان لە زمانە جیاوازەکاندا دەکەن.

بایەخدانی زاراوەسازیی بە چەمك و هۆیەکان، یەکەم هەنگاوی دانانی زاراوەمان بۆ دەردەخات، کە کۆکردنەوەی چەمکەکان و ڕێکخستنیان لە کۆمەڵەیەکی خاوەن پێوەندییەکی هاوشانە، پاشان دەبێت لە چەمك بگەین، بە تایبەتمەندییەکانی و سیما جۆراوجۆرە ڕاستی و ناڕاستییەکانی

---

(1) د.علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ل٣٤.

و هەروەها پێوەندی ئەم چەمکە بە چەمکەکانی ترەوە لەهەمان ئەو کۆمەڵەی کە لێیەتی و دەستنیشانکردنی جێگەکەی و پاشان هەوڵدەدەین بۆ پێشنیازکردنی زاراوەیەکی گونجاو بۆی، کە پێوەندییەکی واتایی بەو زاراوانەوە هەبێت و پاشان هەنگاوێکی پێویست لە نێوان بایەخدان بە چەمکی تازە و پێشنیازکردنی هێمایەکی زمانی بۆی، ئەویش دانانی پێناسەیەکە بۆ ئەو چەمکە، کە مەبەستمان ستایشێکی وشەییە بۆی، بە بەکارهێنانی چەمکی تری کە پێش وەخت لامان ناسراوە، پێویستە لە پێناسەدا دیاریکراو و وردبێت و ئەو تایبەتمەندییانە لەخۆ بگرێت کە ئەو چەمکە هەیەتی و یارمەتی ڕوونکردنەوەی جێگەی چەمکە تازەکەی لە سیستەمێکی دیاریکراو لە چەمکەکان، کە لە یەك کۆمەڵە بەشدار دەبێت لەگەڵیدا بدات. ڕوونکردنەوەکانیش لەوانەیە سوودیان لە دیاریکردنی چەمك و ڕوونکردنەوەی زۆربێت، کە لەو مەرجانە بۆی دانران، ئەمەیە دەبێتە ژیربێژی و پێناسەکەشی پێناسەیەکی زانستی دەبێت.

جیاوازی پێناسەی زانستی لە پێناسەی زمانەوانی ئاسایی ئەوەیە: پێناسە زانستییەکان بریتین لە کۆمەڵێك چەمکی چەسپاو، بە پێچەوانەی ڕێبازە فەلسەفی و ژیربێژییەکانی سەر بە کۆمەڵێکی بەستراوی هاوشانن، بەڵام پێناسەکانی زمانەوانی لە فەرهەنگێکەوە بۆ فەرهەنگێکی تر،

لەوانەیە بەپێی تایبەتمەندیی فەرهەنگەکان و توانستی ڕۆشنبیری و ژیری[1] جیاوازبێت و سەربەستبن.

فیڵبەر (FELBER) ئەوەی پیشاندا کە وردیی زاراوەکان پشت بە هێما زمانییەکان نابەستێ، بەڵکو بە چەمکەکان لە (فیزساکر- Weizsacker)ەوە، وەرگیراوە و شیکردنەوەی ئەم دەستەواژەیەی سەرەوەی کردووە بەوەی، کە: تێگەیشتنی سەرکەوتوو لە زماندا پشت بە وردێتی زمان نابەستێت، بەڵکو پشت بە وردێتی ڕێکخستنی چەمکی شتەکان کە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەین دەبەستێ[1]. دەبێت ئەمە لەبیر نەکەین کە کاری زاراوەسازیی یان دانانی زاراوەکان پێویستە هەموو کات لە چەمکەکانەوە دەست پێ بکات، وەك باسکرا، پاشان پێناسە دواتر هێمای زمانی (زاراوە)، بۆ هەموو چەمکێك زاراوەیەك دابنرێت و لەگەڵ زاراوەی تر تێکەڵ نەکرێ و گونجان و تێگەیشتن لە توانستدا بێت کاتێ کە یەك زاراوە بۆ یەك چەمك دابنرێت و بە پێچەوانەوەش...

ئەرکی پسپۆر لە زانستدا مامەڵەکردن لەگەڵ چەمکەکان و ڕوونکردنەوە و پێناسەکردنیانە و ئەرکی زمانەوانیش هەڵبژاردنی زاراوەکانە (وشە یان هێمای زمانین) بە پێی دەستوورەکانی دانان کە لە زمانەکان و زانستی زاراوەسازیی تیۆری ناسراوە، پاشان ستایشکردنی

---

[1] انترنت: د.علي توفيق الحمد، في المصطلح العربي قراءة في شروطه وتوحيده.

[1] انترنيت: د.علي توفيق الحمد، في المصطلح العربي قراءة في شروطه وتوحيده.

بەکارهێنانی ئەو وشانە، پاشان ڕۆڵی زاراوەسازی پسپۆر لە زانستی زاراوەسازیدا دێت، کە ئەوانەی باسکران، بەسەر دەکاتەوە و بڕیاری زاراوەیەکی گونجاو و ڕێکوپێکی بۆ دەدات، بۆ بەکارهێنان بە پێی ئەو ڕێبازانەی کە زانستی زاراوەسازی و پێوانەیی بڕیاریان لەسەر داوە، بەمەش وردبینی و واتا لە بواری زانستی و زمان و ژیربێژی بۆ زاراوەکانمان دابین دەکەین.

پرۆسەی پێوانەیی زاراوە لە زانستی زاراوەسازیدا، بە دوو لایەن بە ئەنجام دەگەیێنرێت: لایەنی ژیربێژی و لایەنی زمانەوانی، لایەنی ژیربێژی، چەمکەکان دەگرێتەخۆ (وێناکردنە ئاوەزییەکان) بە پێوانەیی و یەکخستن، لایەنی زمانەوانیش بریتییە لە ڕێگاکانی دانانی زاراوە و لێکۆڵینەوەی بنیاتی زاراوەی ئینگلیزی، ئەگەر بۆ ئەو چەمکە تازەیە زاراوەیەکی ئینگلیزی هەبێت لەوانەیە ببێتە ڕێگە خۆشکەر و یارمەتیدانێك بۆ پێشنیارکردنی زاراوەیەکی گونجاو بەرانبەری[1]. لەمەڕ چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ چەمکی جیاوازدا و دانانی زاراوەی گونجاوی یەکگرتوو و بڵاوکردنەوەیان... هتد. ئەو چەمکانەش دەتوانرێت لەسەر سێ شێوەبن کە ئەمانەن:

**یەکەم:** چەمك هەیە پێمان گەیشتووە، کەرەستەکانی لە لامان ناسراوە و بڵاوە، ئەمیش دوو بەشە:

---

[1] د.محمد حلمي هليل، خطوات نحو تقييس المصطلح اللساني في الوطن العربي، بحث مقدم الى الندوة (التقييس والتوحيد المصطلحيان في النظرية والتطبيق)، تونس، ١٣-١٧ مارس ١٩٨٩، ل١٠.

١- چەمك كە زاراوەی كوردی هەیە و ئەمیش دوو بەشە لە ڕووی ژمارەی ئەو زاراوانەی بۆ بەڵگەهێنانەوە دانراون:

أ- چەمكێك كە یەك زاراوەی كوردیی هەبێت، ئەم زاراوەیەش لە لای گشت كەسێك بڵاو و ناسراوە، یان وەرگیراوە یان لە زمانێكی ترەوە هاتۆتە نێو زمانی كوردی، یان كوردییەكی پەتییە یان وشەیەكی گشتییە.

ب- چەمكێك كە ژمارەیەك لە زاراوەی كوردی یان وەرگیراوی هاوواتای هەبێت، ئەو زاراوانەش بۆ ئەوەی لە هاوواتا ڕزگارمان بێت پێویستیان بە چارەسەر هەیە.

٢- چەمكێك كە هێشتا زاراوەی بڵاو و ناسراوی نەبێت، وەك (ڤیدیۆ، دی ڤی دی،...) ئەم جۆرەش بە دانانی لە ژێر دەستی لیژنەی زانیاری و هونەری تایبەت، بۆ دانانی زاراوەی كوردی بۆیان دەبێت زوو چارەسەر بكرێت.

**دووەم:** چەمكێك تازە لە دەرەوە دانراوە یان تازە دانراوە و كەرەسە و چەمكەكانیمان هێشتا پێ نەگەیشتوون، ئەمیش دوو جۆری هەیە:

أ- چەمكی شتە مادییە هەست پێكراوەكان.

ب- چەمكی تیۆری مەعنەویی ڕووت، هەروەك لە بواری زانستە ڕووتەكاندا.

## سێیەم:

چەمكێك كە خۆمان و زاناكانمان لە توێژینەوە زانستییە تایبەتییەكاندا دەیدۆزینەوە.

## ڕوونکردنەوە و پێناسەی زاراوە

زاراوە وەك لە زۆربەی ئەو سەرچاوانەی ئاماژەیان بۆ کردووە، واتایەکە ئاماژە بۆ ڕێککەوتن دەکات، ئەم واتایەش ئاماژە بۆ تایبەتییەکی گرنگیی زاراوە دەکات، کە ئەویش ڕێککەوتنە لەسەر واتایەکی تایبەتی بۆ زاراوە دوای جیاوازیکردن لە واتاکەی وەك ئەوەی، زاراوەکە لە ناکۆکیدا بێت تا واتا زانستییەکەی بە شێوەیەکی ڕوون لە نێوەرۆکەکەیدا دەربکەوێت. ئەمەش بۆ تایبەتمەندی ڕێککەوتن تایبەتمەندی ڕوونی و زانستی پێدەبەخشێت.

ئەم تایبەتمەندییانە کاتێك لە وشەیەکدا کۆدەبنەوە بۆ گەیاندنی یا ئاماژەبۆکردنی واتایەکی تایبەتی کە گوێی لێدەگیرێ لە هەلومەرجی بەکارهێنانیدا تا دەبێتە زاراوە، بەڵام دووبارەبوونەوە و بەردەوامی لە مێژوودا ئەوە وا لە وشەکە دەکات ببێتە زاراوە و واتا نوێیەکەی بچەسپێنێ.

ئەوەی لە نێو زانست دۆست و هونەرمەنداندا (زاراوە)ی پێدەوترێت، چەند وشە و دەربڕینێکی تایبەتین کە بۆ گەیاندنی واتایەکی تایبەتی دانراون، یان لە ئەنجامی زۆر بەکارهێنانی لەهەر زانست و هونەرێکدا، وردەوردە واتایەکی تایبەتییان بەسەردا براوە و، شێوەی زاراوەیان وەرگرتووە. چەمکەکانی زاراوەش وەکو چەمکە زمانییەکانی وشە، یان

دانراوین – واتا، بە خواست و مەبەستێکی تایبەتی دادەنرێن، یان بە واتایەکی دیکە (دانانی)ن، و وشەیەك وردەوردە واتا و چەمکی زمانەوانی خۆی لەدەست دەدات و لە زانستێکدا ڕەوشی زاراوە بەخۆوە دەگرێت.

هەڵبەت بە شێوەیەکی گشتی، واتای زاراوەیی وشە، لەگەڵ واتای زمانەوانی وشە دەگونجێت، بۆ نموونە زاراوەی (ڕۆژوو) و (نوێژ) لە شەریعەتدا، بە واتای ئەنجامدانی کارێکی تایبەتی، یان ڕەوش و دەستوورێکی تایبەتییە، کە بەڕێز لە ڕووی زمانەوە دەست لێهەڵگرتن و دوعا دەگرنەوە، بەڵام ناکرێ بە هەموو دەست بەرزکردنەوە و نزایەك بوترێ (ڕۆژوو) و(نوێژ). ئەوە بۆ هەموو زاراوەیەك، لەوانە زاراوەکانی سۆفیگەریش، ڕاستە، وەکو چۆن بابای سۆفی لە کاتی جەزبە و حاڵ لێهاتندا چەند وشە و دەربڕینێکی بەسەر زاردا هاتووە، یان شێخە گەورەکان بە نیازی پەندداردان و ئامۆژگاربیکردنی موریدان، چەند وشە و دەربڕینێکیان وتووە، کە بەهۆی دووبارەکردنەوە و زۆر بە کارهێنانەوە وردەوردە شێوەی زاراوەیان وەرگرتووە. هەندێك شاعیرانی سۆفی مەشرەبیش بە سوود وەرگرتن لە خواستن و درکە و خوازە، چەند دەربڕینێکیان هێناونەتە کایە، کە لە شێوەی هێمادا بوون، پاشان وردەوردە شێوەی زاراوەیان بەخۆوە گرتووە.[1]

زاراوە کە گرنگییەکی زۆری لە گشت بوارەکانی زماندا هەیە نیشانەیەکی بێ گیانە و ڕەمزێکی ئامێرییە و هیچ ئەرکێك جگە لە واتا

---

[1] دکتر سید جعفر سجادی، فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی، چاپی هشتم، انتشارات طهوری، تەهران، ١٣٨٦، سراغاز، ص هفت.

بۆبەکارهێنراوەکەی بەڕێوە نابا، هەروەها هیچ کەسێك بۆی نییە بە ئارەزووی خۆی زاراوەی بێگانە وەربگرێت و داڕشتنەکەی بگۆڕێت و زمانە نەتەوایەتییەکەی پیّ پینە بکات و بەئارەزووی خۆی ماناکەی بسازێنیّ و بە زۆرە ملیّ بەسەر چەمك و تێگەیشتنێکی جیاوازدا بیسەپێنیّ[٢] و زمانەوانەکانیش بە درێژایی مێژووی زمانی مرۆڤایەتی چ یۆنانی و ڕۆمانی بن، چ عەرەب لەسەر ئەوە یەك قسەن، کە زاراوە وشەیەکە، ئەمڕۆ زاراوە لە هەموو ڕوویەکەوە، وەك زانستێکی بایەخدار لە گەلێك لە زانکۆ بە ناوبانگەکاندا دەخوێنرێت و لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر دەکرێت و کۆبوونەوەی ساڵانەی جیهانی بۆ دەگیرێت. زمانی کوردی وەك زمانێکی ڕەسەنی پوخت و پاراو، هەرچەندە لە زاراوەی زانستی مرۆڤایەتی و تەکنەلۆژیدا هێشتا فرەنەدارە، بەڵام زمانەکەی خۆی وەك زۆربەی زمانەکانی هیند و ئەوروپایی بۆ فراوانبوون و زاراوە سازکردن گەلێك لە بارە[١]. کەواتە لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ هەندیّ پێناسەی جۆراوجۆری زاراوە چ لە لای زمانەوانی کورد چ لای بێگانە بکەین.

لێرەدا دەبیّ هەوڵدەین ئاماژە بۆ پێناسەی جیاواز بکەین و بپرسین زاراوە چییە و چ نیشانەیەك لە جۆرەکانی وشە جیای دەکاتەوە؟ بۆ

---

[٢] د.کامل بەصیر، هۆنراوەی کوردی و زاراوەی کلاسیزم لە ڕەخنەسازی ئەورووپیدا، گۆڤاری (بەیان)، ژمارە (٧٥)، بەغدا، کانوونی یەکەم ١٩٨١، ل١٣.

[١] ئیبراهیم ئەمین باڵدار، زاراوە و زمان لە کاروانی زانیاری ئەمڕۆدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نویّ)، ژمارە (١١٢)، ل٢١٧.

وەڵامدانەوەی ئەمەش دەبێ پەنا بەرینە بەر زمانەکانی تر تا بزانین بە چی وەڵام دراوەتەوە؟، زانایەکی وەك (الشریف الجرجانی) کە واژەی (الاصطلاح)ی بە زمانی عەرەبی داناوە پێناسەی کردووە و دەڵێت: (الاصطلاح) واتا زاراوە – ڕێککەوتنی دەستەیەکە لە کۆمەڵانی خەڵکی دەربارەی ناونانی شتێك یاخود کارێك بە وشەیەك کە لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی تر گوازرابێتەوە. دوا بە دوای ئەم زانایە (الکفوی) لەسەر هەمان ڕێچکە هەنگاوی ناوە و پێناسەی (الاصطلاح)ی بە دووپاتکردنەوەی قسەکانی (الجرجاني) کردووە، سەرەڕای ڕوونکردنەوەیەکی نوێی لایەنەکانی پێناسەکە بە باسکردنی ئەوەی: زاراوە وشەیەکی تایبەتییە، لە بابەتێك لە بابەتەکانی زانست و زانیاری و ڕۆشنبیری و شارستانییەت و لە کاروباری ڕۆژانەدا و بەهۆی ئەوانەی پێوەندییان بەو بابەتەوە هەیە و بەکاری دەهێنن[1]، لەبەرئەوە لێرەدا دەتوانرێت هەندێ چەمك بۆ زاراوە دەستنیشان بکرێت:

١- زاراوە چەشنێکە لە وشە.

٢- زاراوە دەستەیەك لە کۆمەڵانی خەڵکی سازیدەکەن و بۆ ئیشوکاری تایبەتی خۆیان بەکاری دەهێنن.

٣- ڕێبازی سەرەکی لە ڕێبازەکانی دانان و لە دایکبوونی زاراوە، گواستنەوەی وشەیەکە لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی نوێتر، کەوابوو هەموو وشەیەك زاراوە نییە، بەڵام هەموو زاراوەیەك وشەیەکە و ئەم وشەیەش سنوورێکی تەنگەبەری هەیە، کە بە بەکارهێنانی لە لایەن کۆمەڵێك لە

---

[1] د.کامل بەصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل١٥-١٦.

خەڵکی لە کۆڕێك لە کۆڕەکانی ژیاندا شوورەی کێشراوە و لە وشەی فەرهەنگییەوە وەرگیراوە[٢][٣]، ئەمە و چەندان تایبەتمەندی تر بۆ زاراوە لە ئارادان و لە هەموو زمانێکی زیندووشدا ئەو تایبەتمەندییانە بەرچاو دەکەون، چونکە زاراوە وەك لە گشت زمانێکی زیندوودا، بەشێکی زۆری وشەکانی ئەو زمانە دەگرێتەوە، ئەم بەشەش بابەتەکانی زانست و ڕۆشنبیری و ئەدەب و هونەر و ئابووریی و سیاسەت و... هتد، دەگرێتەوە.

زاراوە بنچینەی زمانی ستانداردی نەتەوەیە، دیالێکتەکانی لێك نزیك دەکاتەوە و پێوەندییان بەهێزتر دەکات، دەبێتە هۆی پێکهێنانی یەکێتی دەربڕین و بنچینەی ئامراز و هزر و بیر و داهێنان بۆ نەوەکانی داهاتوو بە یەکگرتوویی[١]، هەروەها زاراوە بە گشتی بەوە پێناسە دەکرێت: کۆمەڵێك هێمای زمانین، لەبوارەکانی زانستی یان تەکنەلۆژی ئاماژە بۆ چەندین چەمك و شت دەکەن.

ڕێکخراوی پێوانەیی نێودەوڵەتی بەوەی پێناسە دەکات: زاراوە هێمایەکە لەسەری ڕێککەوتوون بۆ گەیاندنی چەمکێك لەچەندین دەنگی تێکبەستراو یان لە وێنەی نووسراوی ئەم دەنگانە (پیتەکان) پێکدێت. بۆیە پێویستە دوو مەرجی سەرەکی تێدابێت:

---

[٢] هەمان سەرچاوە، ل١٦-١٧.

[٣] د.کامل بەصیر، پێناسینی زاراوە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، بەغدا، ١٩٨٦، ل٢١٧.

[١] محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی کوردیدا، ل٥.

١- پێویستە هەر چەمکێك یان شتێك بە زاراوەیەکی سەربەخۆ دەرببڕدرێت.

٢- زیاتر لە یەك زاراوە بۆ چەمکێك یان شتێك دانەنرێت، بەڵام بەگشتی ئەم دوو مەرجە لە زمانی کوردیدا سەدی سەد لە زۆر زاراوەدا نەهاتۆتە دی، لەبەرئەوە زۆرجار دەبینین یەك زاراوە بۆ چەندین واتای جیاواز بەکاردێت، کە جۆرێك تەمومژی واتایی درووست دەکات، زمانناسان بەم دیاردەیە دەڵێن هاوبێژی یان هاودەنگی و هاوبەشی لە بێژەدا[1]. لە پێناسەیەکی تری زاراوەدا هاتووە: زاراڤ د ئەزمانیدا، پەیڤەکە یان ژ پەیڤەکێ پترە، دیار کرنا ڕامانەکا تایبەتی و خۆمالی ددەت، و ئارمانجەکا دیارکری دگەهینیت، لەورا (زاراڤ) ڕامانەکا دورتر کورتر ژ ڕامانا پەیڤا ئاسایە خویا دکەت، و مەودایەکە بەرفرەهتر وەردگریت و جوانیەکا باشتر ددەتێ.. هەبوونا زاراڤ دناڤ هەر ئەزمانەکی دا، نیشان و سیفەتا هیز و شیان و پێڤە هاتنێت وی ئەزمانییە و کەڤناتی و ڕەسانەیەتی وەراو و گەش و بوونا بەردەواما وی ئەزمانی دیار دکەت[2]... هەروەها لە جێگەیەکی تریشەوە لە بارەی زاراوەوە وتراوە: زاراوە وشەیەکە کۆمەڵێك پسپۆر بۆ مەبەستێکی زانستی ڕایان دەکەن بەیەك و دایدەنێن، دەشبێ بۆنە یان هاوبەشی یان وێکچوونێکی زۆر یان

---

[1] ڕۆژان نوری عبداللە، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل٢٣٤-٢٣٥.

[2] رشید فندی، زاراڤێت ئەدەبی د مەم و زینا خانی دا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، بەغدا، ١٩٨٦، ل٣٠٢.

کەم لە نێوان واتا زمانییەکەی و واتا زاراوەییەکەیدا هەبێت[٣] و لەگەڵ ئەوەشدا، (زاراوە) تەنها (شێوە)ی چەمکە زانستییە نوێیکانە و بە زۆری کرۆکی ئەو ڕاستییە زانستییە دەپێکێت، کە دەمانەوێ دەری ببڕین، بەڵام وای لێ هاتووە گرنگترین کۆسپ لە ڕێی کورداندنی خوێندنی باڵادا، دۆزینەوەی زاراوەی کوردیی ئەوتۆیە، کە لەگەڵ ئەو وشە و چەمکە زانستییە بیانیانەدا بگونجێ، چونکە زاراوە هۆی سەرەکیی درووستکردن و ڕێکخستن و گەشەپێکردنی زانستە[١].

زاراوە چەشنە وشەیەکە و گواستنەوەی وشەیەکە بۆ واتایەکی نوێتر، زاراوە وشەی فەرهەنگیی سەر زمانی خەڵکی نییە، بەڵکو وشەیەکی نوێباوە بۆ واتایەکی نوێ، لە کۆڕێکی زانستی یان ڕووناکبیری سەردەمدا سازکراوە. زاراوە واژەیەکی بابەتییە، پسپۆرەکان لەسەری ڕێککەوتوون بۆ ئەوەی واتایەکی دیاریکراوی زۆر بە وردی و ڕوونی پێ دەربڕن، بەجۆرێك لە بواری دەقە زانستییەکەدا هیچ شێواوی و ئاڵۆزییەك لە بیری خوێنەر و گوێگردا پەیدا نەکات.

خاڵێکی گرنگ بۆ ئەوەی (زاراوە) بە (وشە) بناسێنین دەبێ (ئاوەڵناوی ڕەسەن)ی بخەینە پاڵ و بڵێین: زاراوە وشەیەکی ڕەسەنە و ئەو

---

[٣] عبدالرزاق بیمار، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانەکان، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، ل٢٨٩.

هەروەها بڕوانە: عەبدولڕەحمان عوسمان، زاراوەزانی و زاراوەی زانستی کوردی، گۆڤاری (بانە ڕۆژ)، ژمارە (٢١)، ل٦٣.

[١] جەمال عەبدول، بەرکوڵێکی زانستە زاراوەسازی کوردی، ل٦.

وشەیەش بە گشتی سێ بەشە، ئامراز و ناو و فرمان، لەبەرئەوەی ئامراز و فرمان بۆ زاراوەسازی دەست نادەن، دەبێ واژەی (وشە) لە پێناسەکەدا بکەین بە (ناو) و بڵێین: زاراوە، ناوێکی ڕەسەنە[٢].

لەبەرئەوەی زاراوەسازانی کورد لە کاری زاراوە و پێناسەکردنیدا یەك ڕانین، بۆیە لەم بوارەدا دوو دیاردەی نابەجێ بەرچاو دەکەوێت:

یەکەم: بەهەڵە داتاشینی زاراوە.

دووەم: دانانی لە زاراوەیەك زۆرتر بۆ یەك واتا.

لەئەنجامدا دەگەینە ئەوەی، کە:

١- زاراوەی کوردی، ناوێکە، دەشێ (سادە) و دەشێ (ناسادە)بێت.

٢- ئەم (ناو)ە وشەیەکی کوردی ڕەسەنە.

٣- پێویستە، لە نێوان زاراوە و واتاکەی پێشووی جۆرە پێوەندییەك هەبێت.

٤- دەبێ (هەر زاراوەیەك) تەنیا بۆ یەك مەبەست دانرابێت.

٥- دەبێ (زاراوە)کە لەبەر ڕووناکیی یەکێك لە ڕێبازەکانی پەیدابوون و سازکردنی (وشە)ی کوردیدا سازکرابێت.

٦- نابێ خەڵکی ناپسپۆڕ (زاراوە) لە زماندا ساز بکەن.

٧- (زاراوە) تایبەتە بە بابەتێك یان لایەنێکی زانیاری و ژیاری و ڕووناکبیری.[١][٢]

---

[٢] جەمال عەبدول، زاراوەسازی و زانستاندنی زمانی کوردی، گۆڤاری ئەکادیمی کوردی، ژمارە (٧)، ل١٨.

کەواتە بەپێی ئەم خاڵانە، دەتوانین زاراوەی کوردی بەم جۆرە پێناسە بکەین:

زاراوە ناوێکی ڕەسەنە، لە فەرهەنگی نەتەوایەتی کوردییەوە بە پێی ڕێبازێکی وشەسازیی کوردی، بۆ مەبەستێکی دیاریکراو لە کۆڕی پسپۆڕێتیدا سازکراوە.

هەروەها ئەگەر سەیری هەندێ سەرچاوەی تر بکەین لە بارەی زاراوەوە، دەبینین ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن: زاراوە واژەیەکە، وشەیەك یان چەند وشەیەك کە چەمکێك هەڵدەگرێت مادیی بێت یان مەعنەویی یان وشەیەك یان چەند وشەیەکە، کە خاوەنی واتایەکی زانستی یان ژیاری بێت[1]، زاراوە وەك بینرا ڕێککەوتنی کۆمەڵێك خەڵکە لەسەر زاراوەیەك، بۆ بەکارهێنان و ناونانی ئەو شتەی کە دەیانەوێت دەری ببڕن لە کاروباری ڕۆژانەیاندا، لەبەرئەوەی زاراوە وێنەیەکی چڕی ئەو پێوەندییە ئەندامییەیە، لە نێوان ئاوەز و زماندا ڕاوەستاوە، هەروەها پێوەندیی بە دیاردە زانیارییەکانەوە هەیە، زاراوەش لە هەر زانستیێ، لە زانستەکان بە ناوکی چەق دادەنرێت،

---

[1] جەمال عەبدول، زاراوەسازی و زانستاندنی زمانی کوردی، گۆڤاری ئەکادیمی کوردی، ژمارە (٧) ، ل١٨٤– ١٨٥.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٨٤–١٨٥.

[1] انترنيت: منتدى اللسانيات: منتدى المصطلح اللساني، محمد احمد، المصطلح العلمي بين السيرورة والاندثار.

که لایەنی ڕۆشنی زانیاریی پێ بەردەوام دەبێ و هێنانی فیکری پێ دەچەسپێت[٢]، هەموو ئەمەش بۆ پێکەوەبەستنی ژیاری نەتەوەکانە.

پێناسەی نوێی زاراوە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە، مێژووی زاراوە، مێژووی زانستەکانە، هەموو زانستێکی نوێ پێویستی بە زاراوەی نوێ دەبێت و، هەموو وێناکردنێکی نوێش وا لە خاوەنەکەی دەکات، زاراوەی نوێی بۆ درووست بکات، یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی زانستە سروشتییەکان ئەوەیە، کە پەرەسەندنێکی بەردەوامیان هەیە، ورد و ڕێکوپێکن، شایانی خۆگەیاندنی ماوەیەکی دوور و درێژیان هەیە، بۆیە پێویستە و دەبێت بۆ ئەو زانستە هەمان ئەو زاراوانە هەبێت بە هەمان تایبەتمەندی ئەو زانستە[١]. هەروەها پێناسەیەکی تر لە بارەی زاراوەوە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە، کە زاراوە لە نەژاددا ڕێککەوتنی توێژەرانە لەسەر هەڵبژاردنی بۆ دیاریکردنی لە بارەی چەمکێکی دیاریکراو لە زانستێك یان هونەرێکی دیاریکراو. زۆر جاریش زاراوە بە شێوە واژەیەکی تاك دێت، وەك فەرهەنگ، جێناو... یان، چەند وشەیەك وەك، ئەندازیاری کارەبایی، زانستی زەویناسی... هتد.

زاراوە بریتییە لە وشەیەك یان کۆمەڵە وشەیەك لە زمانێکی تایبەتی زانستی یان تەکنیکی، بۆ دەربڕین لە چەمکەکان و ئاماژە بۆ کردنی شتە

---

[٢] د.مولاي علي بوخاتم، مصطلحات النقد العربي السيماءوي الاشكالية والاصول والامتداد، ل٣١.

[١] محمد كامل حسين، القواعد العامة لوضع المصطلحات العلمية، مجلة مجمع اللغة العربية بالقاهرة، الجزء (الحادي عشر)، القاهرة، ١٩٥٥، ل١٣٧.

مادییە دیاریکراوەکان بەکاردێت. بەم واتایە زاراوە دەبێتە گوزارشتکردن لە چەمکەکان و شتە مادییەکان، بەڵام ڕاوبۆچوونی گونجاو لە لای پسپۆڕانی زانستی زاراوەسازیی ئەوەیە کە، تا ئاستێك لە لایەن گۆکردن و ڕێنووسەوە کۆکن دەربارەی وشەی (زاراوە) لە زمانە جیاوازەکان بەم شێوە جیاوازە دەینووسن و گۆی دەکەن، بە ئینگلیزی و هۆڵەندیی و دانیمارکی و نەرویجی و سویدی وشەی (Term) و بە ئەڵمانی وشەی (Trem)و بە فەڕەنسی (Terme)و بە ئیتاڵی (Termine)و بە ئیسپانی و بولگاری و ڕۆمانی و سلۆڤینی و چیکی و پۆڵەندی(Terminos)و بە پورتوگالی (Termo)و بە ڕووسی (Termin)ی پێ دەڵێن، وشەی تری زمانە ئەورووپییەکان کە سەر بەهەمان بنەماڵەی زمانن[٢]. لە لای عەرەبیش وەرگیراوە بە(إصطلاح) و (مصطلح)[*] و لە زمانی کوردییشدا بە (زاراو) و (زاراوە) بەکارهاتووە، بەڵام هەر وشەی (زاراوە)کە چەسپاوە. کەواتە

---

[٢] د.محمود فهمي الحجازي، الاسس اللغوية لعلم المصطلح، ل٩.

[*] هەروەها لە بارەی هەندێ پێناسەی تری زاراوە، بڕوانە:

أ- قاسم السارة، تعريب المصطلح العلمي (اشكالية المنهج)، مجلة (عالم الفكر)، المجلد التاسع عشر، العدد الرابع، وزارة الاعلام، الكويت، يناير - فبراير - مارس ١٩٨٩، ل٨٣-٨٤.

ب- د. ابراهيم كايد محمود، المصطلح ومشكلات تحقيقه، مجلة (التراث العربي)، العدد (٩٧)، السنة (٢٤)، دمشق، اذار ٢٠٠٥، ل١٧-١٩.

ج - شحادة الخوري، دراسات في الترجمة والمصطلح والتعريب، الطبعة الثانية، دار طلاس للدراسات الترجمة والنشر، دمشق ١٩٩٢، ل١٧٢.

زاراوه بەهەر شێوەیەك بنووسرێت و گۆ بكرێت ناونانێكی زمانی دەسەپێنێ[1]، كە لە زمانێكی تایبەتیدا چەمكێكی دیاریكراوە.

## جیاوازیی نێوان چەمك و زاراوە

لەم چەرخەی ئێستادا، زاراوە بۆتە باسی زانستێكی سەربەخۆ، كە بە زانستی زاراوەسازی ناودەبرێت و بە شێوەییەكی زانستی لە چەمكەكان و زاراوە بەكارهاتووەكان لە زمانێكی تایبەتی دەكۆڵێتەوە، زاراوەسازیش (Terminology) وەك زانستێك بایەخ بە داڕشتنی زاراوە و دیاریكردن و دروستكردنی دەدات. كەواتە زاراوە = نێوەرۆك (پلەیەكی واتایی) + دەربڕین (داڕشتەیەكی زمانی گەیەنەری)ە، یان هێمایەكی ڕێككەوتییە بۆ تێڕوانینێك لە دەنگی گۆكراو یان شێوە كە بە نووسین دەردەبڕێت (بە پیت) پێكدێت.

زاراوە لەوانەیە وشەیەك یان دەستەواژەیەك بێت، ئەگەر چەمك نواندنی بیری شتێك بێت (هەستپێكراو یان ڕوون) یان بۆ پۆلێك كە سیمای هاوبەشی هەیە و بە زاراوەیەك یان هێمایەك گوزارشتی لێ دەكات. زاراوە هەر یەكەیەكی (زمانی) واتاییە كە لە وشە پێك هاتووە (زاراوەی سادە) یان چەند وشەیەك (زاراوەی لێكدراو)، كە بەچەمكێكی دیاریكراو ناودەبرێت بە شێوەیەكی یەك لا لەناو بوارێكدا یان چەمكێكی تایبەتی،

---

[1] د. ايناس كمال الحديدي، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث، ل٣٢.

بریتییه له وێناکردنێکی ئەرکی بۆ تایبەتمەندیی زانیاریی زاراوەکە[1]، ئەم دەستوورانە، زاراوە لە پێوەندیکردنی بە چەمکەوە زیاتر لێڵ دەکات، چەمکیش لە میانەی پێناسەکانی زاراوەدا لە زۆرینەی سەرچاوەکاندا لە زاراوە تایبەتیی ترە و بە واتای وێناکردن بەکاردێت، چونکە چەمکەکان مەرجی بەردەوامی و کرۆکیی زمانن و لە ڕێگەیەوە مرۆڤ جیاوازی لە نێوان شتێك و شتێکی تردا دەکات. چەمکەکانیش پێویستیان بە جۆرە ڕێکخستنێك هەیە بۆ لە ئامێزگرتنی هەموو پارچەکانی.

زاراوەش بریتییە لە چوارچێوەی وێناکاری و گوزارشتی چەمکەکان. زاراوەکان بە پێی ئەوەی دەرکیان پێدەکەین هێمان بۆ چەمکەکان، ئەمە ئەوە دەگەیێنێ کە چەمکەکان لەڕوانگەی تایبەتێتی چەمك دەربارەی زاراوە لەپێش زاراوەکان دۆزراونەتەوە و درووست بوون، لەبەرئەوەی زانستی زاراوەسازی، زاراوەکان بە چەمکەکانەوە دەبەستێت، نەك بە پێچەوانەوە، هەر لەبەر ئەمەش بایەخ بە سیستەمێکی چەمکی ڕەها نادات، بەڵام لە پێناوی ئاسانکاریی بەردەوامی تەنیا بایەخ بە سیستەمە دانراوەکە دەدات، بەڵام ئەم ڕوونکردنەوەیە بۆ ئەو پێوەندییەی نێوان چەمك و زاراوە و لادان و نەهێشتنی ئەو تێکەڵییەی نێوانیان و لایەنی جیاوازییان بەسە؟.

ئەوەی لەبارەی پێناسەی چەمك و زاراوە ڕوونمان کردەوە دەمانگەڕێنێتەوە بۆ ئەو تێکەڵییەی کە لێیەوە کەوتینە باسکردنی، مەبەست دیاریکردنی جیاوازیی نێوان چەمك و زاراوەیە، لێکۆڵینەوەی

---

[1] انترنيت: تربوي اون لاين on line.com المفهوم والمصطلح (تعاريفه واختلافاته ومصادره).

یەکەی چەمك و تایبەتییە بنچینەییەکەی لە دەوروبەری فەلسەفیدا و یەکەی زاراوە تایبەتییەکەیەتی لە دەوروبەری زمانەوانیدا، وای لەو دوو یەکەیە کردووە، لە واتاکانیاندا لێڵی هەبێت، بەقەد ئەو لێڵییەی نێوانیان و بەکارهێنانیان و باوی هاوواتایی نێوانیان بە ئاسانی و ڕوونی دەبینین، تەنانەت ئەو فەرهەنگ و پێناسانەی، بێ ئەوەی جیاوازی لە نێوانیاندا بکەن بایەخیان بە دیاریکردنی واتای نێوان چەمك و زاراوە داوە، هەردوو چەمك و زاراوەیان وەك هاوواتایەك کردە ناونیشانی نووسینەکانیان[1].

هەروەها لەوانەی بۆ دیاریکردنی زاراوە لێکۆڵینەوەیان لە بارەی زانستی زاراوەسازیدا کردووە، جیاوازییان لە نێوان زاراوە و چەمك کردووە، کە دەڵێن زاراوە دیاریکردنی چەمکێکە لە شێوەی پیتە یان ژمارە یان نووسینی وێنەیی یان داهێنانێك لەم ڕەگەزانە، لە میانەی ئەمەدا بینییان زاراوە پێوەندیەکی بەهێزی لەگەڵ چەمك هەیە و، لەم ڕوانگەیەوە دیاریکردنێکیان پێشکەشکرد کە چەمکەکان زاراوە نین[1] لێرەدا باسەکە ئەوە نییە چەمك بە پلەی یەکەم سەر بە فەرهەنگی فەلسەفییە، پاشان پەرەی سەند و لە بواری زمانەوانیدا، وەك هاوواتایەکی زاراوە لە بوارە جیاوازەکاندا و دیاریکردنی جیاوازیی نێوان چەمك و زاراوە و پێوەندیی نێوانیان، کە گشت زمانەوانەکان دانی پێدادەنێن بەکار دەهات، کەچی

---

[1] انترنیت: تربوي اون لاین، المفهوم والمصطلح (تعاریفه واختلافاته ومصادره).

[1] د.مولاي علي بوخاتم، مصطلحات النقد العربي السیماءوي الاشكالیة والاصول والامتداد، ل٤١.

تێکەڵیی دیاریکردنی ئەو جیاوازییە لەبیر ناکەن، لە دەرەوەی چوارچێوەی نێوان چەمك و زاراوە بەیەك واتا بەکاردێنن.

ئەو جیاوازییەی بینیمان لە ئاکامیدا ئەوە درووست دەبێت، ئەو دانەیەی ناو دەنرێت (چەمك) دانەیەکی تر دەتوانێ لە دەربڕینی هەمان واتا هاوبەشی بکات لەگەڵی، بەڵام ئەو دانەیەی ناو دەنرێت (زاراوە) ئەو دانەیە هەر ئەو واتایە دەردەبڕێت و سەر بۆ هاوواتا ناکێشێ، ئەمەش تایبەتمەندیی زاراوەیە[٢]. کاتێ کە وشەیەکی یان زاراوەیەکی وەك، ڕۆشنبیریی، ژیار، دیموکراسی، فیدراڵی،... بەکار دێنین، ئەمانە چەمکن بریتیین لە واتایەك، پێکهێنانی و خڕکردنەوەی بە وشەیەك قورسە، لەبەر ئەوە توێژەر بۆ هەر یەك لەوانە بە سەدان پێناسە دەدۆزێتەوە، سەرەڕای ڕێککەوتنی نێوانیان لەسەر دابەشە هاوبەشەکانی، کە پێوەندە بە واژەکەوە، ڕۆژێك دێت واتای ئەو وشانە یان ئەو چەمکانە تەسك دەبێت و بە واژەیەك دەردەبڕێت و دەبێتە زاراوە، بەڵام زاراوە ئەو توانستەی نییە لە پێناسەکردندا کراوەبێت و بڵاوبێت، لەبەرئەوەی سنووردارە و گشت واژەیەکیش لە پێناسەکردنیدا خاوەنی واتایە، لەوانەیە داڕشتەی پێناسە بۆ زاراوە زۆر هەبێت، بەڵام هەموویان لە هاوبەشی تەنگەبەری و تەسکبوونی واتاکەیدا بەشداری دەکەن[١]، بۆیە سنووری پێناسە وا دەکات زاراوە لە چەمك جیاوازبێت، چونکە چەمك بەڕاییکردن پێناسە دەکرێت و

---

[٢] شحادة الخوري، دراسات في الترجمة والمصطلح والتعريب، ل٧٣.

[١] د.ايناس كمال الحديدي، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث، ل٣٢.

ناتوانرێت بە ڕەهایی پێناسە بکرێت، لەبەرئەوەی ئەگەر بە ڕەهایی پێناسە کرا دەبێتە زاراوە، بەڵام زاراوە بە ڕەها پێناسە دەکرێت و دەتوانرێت بەڕاییکردنیش پێناسە بکرێت، لە پێناو ڕوونکردنەوەی و نزیکخستنەوەی لەگەڵ پاراستنی ئەو بنەمایانەی کە جیای دەکاتەوە، وەك زاراوەیەك چەمك دەتوانێت ببێتە زاراوە، ئەویش بە پەرەسەندنی مێژوویی بەکارهێنانی، هەروەها زاراوەش دەتوانێت ببێتە چەمك، ئەویش بە پێی فراوانکردنی واتاکەی کاتێ پشتگوێ بخرێ، وەك زاراوەیەك بەکارهێنانی بۆ واتایەکی گشتی تەشەنە بکا، هەروەها دانە وشەیەك لە هەمان کاتدا دەتوانێ ببێتە زاراوە و چەمك، بەڵام بە پێی شوێن(ڕەوت)ی جیاواز، هەروەها چەمك لە لایەن ئەوانەی، کە بایەخی پێ دەدەن هەریەکێك لەوانە واتایەکی پێ دەدەن جێگەی جیاوازیی و مشتومڕە، بەڵام زاراوە لە نێو ئەوانەی، بایەخی پێ دەدەن جێگەی مشتومڕ و جیاوازیی بیر و ڕا نییە، چونکە لە نێو ئەوانەی بەکاری دەهێنن دیاریکراوە، هیچ کەسێکیش دەسەڵاتی بەسەر واتاکەیدا نییە.[1]

---

[1] انترنیت: تربوي اون لاين، المفهوم والمصطلح (تعاريفه واختلافاته ومصادره).

## سەرچاوەکانی چەمك و زاراوە

دەتوانرێت سەرچاوەکانی چەمك و زاراوە بەسێ خاڵ دیاری بکرێن:

**یەکەم - مێژوویی:**

ڕوونە کە مێژووی تایبەتی بە میانەیەکی (سیاقی) دیاریکراو لە هەڵبژاردنی هەندێ وشەی زمانەکەدا ڕۆڵ دەگێڕێت بۆ ئەوەی ببێتە نیشانە لە نێوانیاندا و بتوانرێت لەو دەوروبەرانەوە لەو جۆرە زاراوانە تێبگەین.

**دووەم - سەرچاوەی کەسی:**

مەبەست ئەوەیە ئەوەی کە پێشنیازە و لە لایەن کەسێکی پسپۆر لە بوارێکی دیاریکراودا بەکاردێت وشەیەك دیاری دەکات بۆ ئاماژەبۆکردنی واتایەکی دیاریکراو، ئەو لەو حاڵەتەدا دەبێتە سەرچاوەی پێناسەکردنی ئەو زاراوەیەی، کە درووستی کردووە.

ئەوەی دیاریکرد لە چەمك و زاراوە دەبێتە چوونە ژوورەوەیەك بۆ ناسینی بیرەکانی و تێگەیشتنی دەقەکانی، لەوانە ئەو زاراوەیە داتاشین یان داڕشتن لە زاراوەیەکی کۆنەوە یان بەرهەمێکی نوێبێت.

**سێیەم - سەرچاوەی دەق:**

بە تایبەتی ئەو کاتەی کە دەقەکە تایبەتییەکی زمانەوانی هەبێت و لە دەقەکانی تر جیاوازتر بێت و هەندێ لەو وشانەی تێدا بەکاردێن و لە جێگا جیاوازەکاندا دووبارە دەبێتەوە و دەبێتە کلیلێك بۆ تێگەیشتنی دەقەکە[1].

---

[1] انترنیت: تربوي اون لاین، المفهوم والمصطلح (تعاریفه واختلافاته ومصادره).

# وشه و زاراوه

له بواری زانستی زاراوەسازیدا، زمانەوانەکان بایەخێکی زۆر به لێکۆڵینەوه و یەکاڵاکردنەوه و باسکردنێکی قووڵی وشه به گشتی و زاراوه به تایبەتی دەدەن. هەڵبەته ئەم بایەخدانەش له ڕێی چەند زانستێکەوەیە، لەوانه زانستی سیمانتیك (semantique) که له سەرووی هەموویانەوه دێت و پاشان زانستی وشەڕۆنان (word- formation)، هەروەها زانستی ڕستەسازی (sentax)یش بایەخ به وشه دەدات و هەرەوەها زانستی لیکسیکۆلۆژیش هەر له وشه دەکۆڵێتەوه.[*] لێرەدا دەمانەوێت هەندێ پێوەندیی نێوان وشه و زاراوه، له ڕووی جیاوازی و لێکچوونیان و ئەو تایبەتییانەی هەیانه و ڕۆڵیان له گەیاندنی ئەرك و واتا ڕوون بکەینەوه.

---

[*] زانستی سیمانتیك: مەبەستی سەرەکی ئەم زانسته لێکۆڵینەوەی واتای وشه و چۆنێتی گۆڕان و پێوەندی ئەم گۆڕانەیه بەکاری کۆمەڵەوه.

– زانستی وشەڕۆنان: (وشەسازی) له بواری وشەسازیدا له چۆنێتی پێکهاتن و یاسای درووستبوونی وشەکانی زمان دەکۆڵێتەوه.

–زانستی ڕستەسازی: له ئەرکی وشه له ناو ڕستەدا دەکۆڵێتەوه.

– زانستی لیکسیکۆلۆژی: بەشێکه له زانستی زمان و له بارەی باری ئێستا و ڕابوردووی وشه دەدوێ.

هەرچەندە (زاراوە) جۆرێکە لە جۆرەکانی (وشە)، بەڵام ڕێچکەی تایبەتی خۆی هەیە و لە زانستەکانی وشەسازیدا، چەند باسێکی تایبەتی لە بەشەکانی ئاخاوتن جیای دەکاتەوە.[1]

وشە تا ئێستا پێناسەیەکی تەواو و گونجاوی بۆ نەکراوە کە گشت لایەن و واتا و ئەرکەکانی وشەی گرتبێتەخۆ، زمانەوانانی کوردیش هەریەکە و بەپێی پسپۆڕێتی خۆی و لە ژێر تیشکی کارتێکردنی ڕۆشنبیری ڕووسی و ئینگلیزی و عەرەبی، پێناسەیان بۆ وشە داناوە، بەڵام وشە بەر لە کارەکانی ئەوان بۆ زیاتر لە دوو هەزار ساڵ پێناسە کراوە، لەو بارەیەوە فەیلەسووفی بە ناوبانگی یۆنانی (ئەرستۆ) وشەی بەم شێوەیە پێناسە کردووە و دەڵێت: وشە، یاخود ناو، واژەیەکە لە چەند دەنگێك پێك هاتووە و واتای هەیە و هیچ پارچەیەکی خۆی لە خۆیدا واتایەك نابەخشێت[1]. لە وشەدا پێویستە ئەم تایبەتییانەی خوارەوە هەبێت:

١- پێکهاتنی فۆنەتیکیی هەبێت.

٢- مانا و واتادار بێت.

٣- قەوارەی ڕێزمانی هەبێت.

٤- هەمیشە خاوەنی دەنگ و واتا بێت.

٥- هەردەم لە ئاخاوتندا وەك یەکەیەك (وحدة) لە زماندا بەکاربهێنرێ.

---

[1] د. کامل بصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل١٠.

[1] ارسطو طاليس، فن الشعر، ترجمة: عبدالرحمن البدوي، مطبعة مكتبة النهضة العربية، قاهرة، ١٩٥٣، ص٥٦.

٦- پتر له یەك گیرەی نەبێت.

٧- بتوانرێ له ڕستەدا بەکاربهێنرێ.

٨- توانای هەبێ ببێت به ئیدیوم.[(*)(**)]

زاراوەش وشەیەکی تایبەتییه له بابەتێك له بابەتەکانی زانست و زانیاری و ڕۆشنبیری و شارستانێتی و له کاروباری ڕۆژانه و بەهۆی ئەوانەی که پێوەندییان بەو بابەتەوە هەیه بەکاردەهێنێت[(١)]، هەروەها زاراوە ڕێکەوتنی کۆمەڵه کەسێکه لەسەر دانانی شتێك (وشەیەك) و بەکارهێنانی له نووسیندا[(٢)]، یان ڕێکەوتنی کۆمەڵه کەسێکه لەسەر دانانی وشه بۆ ناونانی ئەو شتانەی هەن له پێناو دەربڕینیان و ناسینەوەیان و بانگکردنیان و لێك جیاکردنەوەیان، لەم بارەیەشەوە هەندێ تایبەتی بۆ چەمکی زاراوە دەستنیشانکراوە:

- زاراوە چەشنێکه له وشه.

---

(*) بڕوانه:

أ- د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، ل٦-٧.

ب- د. وریا عمر امین، چەند ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، ل٣٦٤.

(**) سەبارەت بەو هەشت خاڵه له بەشی دووەم (لاپەڕە ٨) باسمان کردووە و به چوار خاڵ لێی دواوین.

(١) د. کامل بصیر، پێناسینی زاراوە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، بەغدا، ١٩٨٦، ل٢١٧.

(٢) د. مولاي علي بوخاتم، مصطلحات النقد العربي السيماءوي الاشكالية والاصول والامتداد، منشورات اتحاد الكتاب العرب، دمشق، ٢٠٠٥، ص٥١.

- زاراوە دەستەیەك لە كۆمەڵانی خەڵك سازی دەكەن و، بۆ ئیش و كاری تایبەتی خۆیان بەكاری دەهێنن.

- ڕێبازی سەرەكی لە ڕێبازەكانی دانان و لە دایكبوونی زاراوەدا، گواستنەوەی وشەیەكە لە واتایەكەوە بۆ واتایەكی تازەتر، كەوابوو هەموو وشەیەك زاراوە نییە، بەڵام هەموو زاراوەیەك وشەیە.[٣]

زاراوە وشەی فەرهەنگی سەر زمانی كۆمەڵانی خەڵكی نییە، بەڵكو وشەیەكی نوێباوە بۆ واتایەكی نوێ لە كۆڕێكی زانستی یاخود ڕۆشنبیری سەردەمدا سازكراوە، كەچی زۆرجار تێبینی دەكەین زاراوە لەگەڵ وشەی ڕۆژانەدا تێكەڵ دەكرێت و وشەی سەر زاری خەڵكی بە زاراوە لە قەڵەم دەدرێت[١]، وەك ئەم وشانە:

| عەرەبی | كوردی |
| --- | --- |
| الرئتان | سی |

---

[٣] د. كامل بەصیر، زاراوەی كوردی هەڵسەنگاندن و لێكۆڵینەوە، ل١٦.
هەروەها بڕوانە: ا- د.كامل بەصیر، پێناسینی زاراوە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، ل٢١٧.

[١] د. كامل بەصیر، زاراوەی كوردی هەڵسەنگاندن و لێكۆڵینەوە، ل٢٥-٢٦.
هەروەها بڕوانە:
أ- جەمال عەبدول، بەركولێكی زانستە زاراوەسازی كوردی، ل٦.
ب- جەمال عەبدول، بیردۆزی گشتی زاراوە دانان و یەكخستنی و تۆمارسازی، گۆڤاری (وەشت)، ژمارە (١)، ل١٨-٢١.
ج- جەمال عەبدول، زاراوەسازی و زانستاندنی زمانی كوردی، گۆڤاری ئەكادیمی كوردستان، ژمارە (٧)،ل١٨٠-١٨٤.

الاتلاف لەناوبردن

الاهمال کەمتەرخەمی

.... هتد.

بۆیە هەندێ وشە و زاراوە هەن هەموو کەسێ بەکاریان دێنێ، پێیان دەوترێت وشەی گشتی و هەندێ وشەش هەن تەنیا دەستەیەکی تایبەت لە کۆمەڵ بەکاریان دێنن بە وشەی تایبەت ناو دەبرێن، بۆ نموونە وشەی (خاڵ) لە لای کۆمەڵانی خەڵك پەڵەیەکی شینی دەستکردە کە بۆ جوانی لەسەر ئەندامی ئادەمیزاد ئەگوترێ یان ڕەشی خواکردە، یان برای دایك پێی دەوترێ خاڵ، بەڵام هەمان وشە لە لایەن مامۆستایانی ڕێنووسەوە بۆ نیشانەیەك سازکراوە، دەوترێ (ح) پیتێکی بێ خاڵە و (ز) پیتێکی خاڵدارە.

وشەی ئاسایی لە دوو زمان یاخود سەد زماندا بەرهەمێکی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییە، کە وەك جریوەی چۆلەکە و قاسپەی کەو، تاکە مەبەستی ڕاگەیاندنی نیازی ئاخێوەری ڕەچاو کردووە، بێ ئەوەی گوێی دابێتە زمانێکی دیکە، هەرچی زاراوەیە لە سەرەتاوە مەبەستێکی نائاسایی بەخۆیەوە گرتووە، ئەوجا بە زۆریش لە ڕێی چاولێکەری ڕۆشنبیرییەکی پێشکەوتووەوە پێوانە و کێشانەی زانستی و هونەری و ئەدەبی لەگەڵدا کردووە[1]، بۆ نموونە کورد بە ڕێکەوت وتوویەتی (گوڵ) و عەرەبیش وتوویەتی (وردة)، بەڵام بە مەبەست و بە ئەرك و لێکدانەوە، کورد لە بری (قواعد اللغة و قواعد الاملاء) ڕێزمان و ڕێنووسی ڕۆناوە.

---

[1] مسعود محمد، زاراوەسازی پێوانە، بەغدا، ١٩٨٨، ل٣.

یەکیَ لە بنەما گرنگەکانی زاراوە دەلالەت و واتا بەخشینە لەمەڕ ڕاستییە زانستییەکە و چەندوچۆنی زاراوەش لە زمانێکدا ئاوێنەیە بۆ بینین و زانینی ئاستی پێشکەوتنی ئەو زمانە، هەروەها زاراوە بڕبڕەی پشتی زمانە و دەبێتە بنەمایەك بۆ یەکگرتنی جەماوەری خوێندەوار و ڕۆشنبیر.

هەروەها دەبیَ لە نێوان ناو و زاراوەدا جیاوازی بکرێت. ئەمەش لە زمانی کوردیدا شتێکی ڕێژەییە، چونکە لای ئێمە زۆر ناوی زانستی هەیە، وەك زاراوە مامەڵەی لەگەڵ دەکریَ، چونکە ماوەیەکە کەوتۆتە نێو کتێبان و تا ئێستا لە بواری زانستیدا دەقی نەگرتووە، لە زمانی عەرەبیدا (ورید) و (شریان) ناون و بە زاراوە ناژمێردرێن، بەڵام لە کوردیدا بەرانبەر ئەوانە تا ئێستا وشەی دەقا و دەق واتا گەیەنەریان بۆ دیاری نەکراوە، بۆیە کە بۆیان دیاری کرا تا ماوەیەك هەر بە زاراوە دەزانرێت [1]، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە زۆر وشە کە لە زمانێك دا زاراوەیە کاتێك لە زمانی کوردی وشەیەکی بەرانبەر واتاکەی بۆ دادەنرێت، سەرەتا سەیر دێتە پێش چاو، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات و زۆر بەکارهێنانی ئاسان دێتە بەردەست، خۆ سەرەتا هەر زاراوەیەکی نویَ، یان وشەیەکی نویَ بەسەیر دێتە بەر گویَ، بەڵام پاشان خەڵکەکە ئاشنایی لە گەڵدا پەیدا دەکەن و ئاسایی دەبێت، بۆ نموونە کورد تا ئێستاش ئاشنایی لەگەڵ وشەی (هەستیار) پەیدا نەکردووە، کە بۆ وشەی (شاعر)ی عەرەبی دانراوە.

---

[1] عبدالرزاق بیمار، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نویَ)، ژمارە (١١١)، ل٢٨٨.

کەوابێ زاراوە وا دەکات وتە واتایەکی نوێی دوور لە واتا زمانییە بنچینەییەکەی خۆی بگەیێنێت، هەروەکو چۆن سەیارە کە ئەمڕۆ بۆ ئۆتۆمبیلە جاران لە عەرەبیدا واتای کاروان و ئەستێرە گەڕۆکەکانی دەگەیاند. کەوابێ زاراوە وشەیەکە کۆمەڵێك پسپۆر بۆ مەبەستێکی زانستی ڕایان دەکەن بە یەك و دایدەنێن دەشبێ بۆنە یان هاوبەشی یان وێکچوونێکی زۆر یان کەم لە نێوان واتا زمانییەکەی و واتا زاراوەییەکەیدا هەبێت[1]، بەڵام زاراوەسازان وایان پێ خۆشە جەخت لەوە بکەن کە زاراوە وشەیەك نییە لە وشەکان، چونکە وشە واتای هەیە، بەڵام زاراوە چەمکی هەیە. هەروەها دەڵێن: زمانەوان مامەڵە لەگەڵ وشە و واتاکانی و کێڵگە واتاییەکان دەکات، کەچی زاراوەساز نەك هەر مامەڵە لەگەڵ زاراوە و چەمکەکان و بوارە چەمکییەکانی تەنانەت سیستەمە چەمکییەکانیشی دەکات، لەبەرئەوە زانستی زاراوەسازی سەر بە زانستی زمان نییە، بەڵکو زانستێکی سەربەخۆیە، با زانستی زمانیش لە کارەکانیدا بەکاربێنێت، چونکە زانستی وەك ژیربێژی و بوون (الوجود) و پۆلێنکردن و... هتد دەگرێتەخۆ[2]. دەبێ ئەوەش بلێین: ئایە زاراوە وشەیەك نییە کە کار بۆ دەستنیشانکردنی واتاکەی دەکرێت؟ لە وەڵامیشدا: وشە لە میانەی ڕستەدا واتاکەی دەردەکەوێت، بەڵام زاراوە چەمکەکەی لە

---

[1] عبدالرزاق بیمار، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، ل٢٨٩.

[2] انترنیت: swo – فن وثقافة www.nesasymorg/content/categoory
د.علي القاسمي، ماهية الفاظ الحضارة، هل هي كلمات عادية ام مصطلحات تقنية ؟

جێگەی ئەو چەمکەی کە کێڵگەی چەمکەکانی یان سیستەمی چەمکەکانی دیاری دەکرێتا، هەروەها لە ڕێی پێوەندیی بە چەمکەکانی دەوروبەری ئەو کێڵگەیەوە دیاری دەکرێت.

جێی سەرنجە کە زمانەوان لە وشەوە بۆ ڕستە پاشان بۆ واتا کار دەکات، بەڵام زاراوەساز لە لێکۆڵینەوەی چەمك و تایبەتمەندییەکانی دەستپێدەکات تا بگاتە ئەو زاراوەیەی دەیەوێت دەری ببڕێ[1]. هەروەها زمانەوان هاوواتا و هاوبێژی پشتگوێ دەخات و بایەخی پێ نادات، کارەکەی بۆ پیاهەڵدانی زمان تەرخان دەکات، هەندێ زمانەوان هاوواتا بە دەوڵەمەندبوونی زمان دادەنێن و بەشتێکی باشی دەزانن و هاوبێژیش بە هۆیەك لە هۆیەکانی ڕەوانبێژی دادەنێن، بەڵام زاراوەساز بوار بە هاوواتا و هاوبێژ نادات، چونکە ئەرکەکەیان ئەرکێکی ستایش پێوانییە لە هەمان کاتدا لەسەر ئەو ڕێبازە دەڕۆن کە دەڵێت: زانستی زاراوەسازی هەوڵ دەدات کە یەك زاراوە گوزارشت لە چەمکێك لەیەك کێڵگەی زانستی بکات و دەربڕین لەیەك واتا تەنیا بە یەك زاراوەبێت لە یەك کێڵگەی زانستیدا، بۆ ئەوەی زمانێکی پاراوی گونجاوی زانستی هەبێت، گشت ئەوانەی لەو بوارە کاریپێدەکەن بە ئاسانی و ڕەوانی و بێ گرێ و گیروگرفت تێی بگەن.

تەنانەت ئەگەر وتراش زاراوە چەشنە وشەیەکە لە زماندا هەیە و جیاوازیی لەگەڵ وشەدا تەنیا لەو کەسەوەیە کە بەکاری دێنێت، لەگەڵ

---

[1] إنترنيت: swo – فن وثقافة www.nesasymorg/content/categoory
د.علي القاسمي، ماهية ألفاظ الحضارة، هل هي كلمات عادية أم مصطلحات تقنية ؟

ئەوەشدا خەڵکی بە گشتی وشە بەکاردەهێنێت. بەکارهێنانی زاراوەی زانستی و تەکنیکی خاوەنی بواری تایبەت بەکاری دەهێنن و بۆ لەیەکتر گەیشتنی خۆیان، ئەمەش بە وشەیەکی وەك گشتی و تایبەت پەسند دەکەین، زمانەوانەکان مامەڵە لەگەڵ وشەی گشتی دەکەن، بەڵام زاراوەساز مامەڵە لەگەڵ وشەی تایبەتی دەکات، بە وێنە وشەکانی: (ڕۆیشت، خەوت، ئاو، با، کتێب، جوان،...) وشەی گشتین و هەموو کەسێك بەکاری دەهێنێت، بەڵام وشەی (دووەمی ئۆکسیدی کاربوون، ئۆکسجین، بلۆتۆن،...) وشەی تایبەتین و چەند کەسانێکی تایبەت لە کۆمەڵدا لە توێژینەوە زانستی و لێکۆڵینەوە تەکنیکییەکانیاندا بەکاریان دێنن، واتا لەخۆڕا درووست نەبوون و کەسانێك درووستی کردوون.

بۆ پێوانەی توانستی زمانی کوردی بۆ ئەوەی زانستی نویٚ بگرێتەخۆ، بەلای ئێمەوە دیارترین ڕێگە ئەوەیە کە دەڕوانێتە زانست بەوەی کۆمەڵە وێناکردنێکە (ڕامان، بەبیراهاتن، بیرلێکردنەوە)، بە واتای هێمای زمانییە ئاماژە بۆ چەمکی دیاریکراو دەکات، لەهەر کێڵگەیەکی زانستیدا، یەك سیستەم کۆیان دەکاتەوە[1]. لێرەدا وێناکردنەکە بە زاراوە ناو دەبرێت لە ڕوانگەی ئەوەی ئەو وێناکردنە (یان: چەمك) خۆی واتاکەیە، زاراوەکەش شێوە (ڕووخسار)کەیەتی.

زمانەوانان و زانایانی زاراوەسازی کۆکن لەسەر ئەوەی جیاوازی نێوان (زاراوە) و (وشە) لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە چەمك (یان: وێناکردن) زاراوە

---

[1] إنترنيت، موقع (أوراق ٩٩) awrak ٩٩ – إستيعاب العلم: نقد: د. سمر روحي الفيصل.

ئاماژەی بۆ دەکات پێش زاراوەکە هەیە و بە سیستەمێکی وێناکردن، کە گشت زانستێك لە زانستەکانی لێ پێکدێت بەستراوە، لەبەر ئەم هۆیە بەپێی زۆری زانستەکان ژمارەی زاراوەکانیش زۆر دەبن، هەروەها لەناو یەك زانستیشدا زۆر دەبن ئەگەر هەندێکیان توانای خۆ جیاکردنەوەیان هەبێت، وەك بواری پزیشکی، کە زاراوەی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لقی لێ دەبێتەوە وەك پزیشکی مرۆیی و ددان و لووت و... هتد، هەریەکە لەمانە زاراوەی تایبەتی خۆیان هەیە.

ئەگەر زاراوەمان بەکارهێنا چەمکمان مەبەستە (یان: وێناکردن) میانەی وشەش هیچ پێوەندییەکی بە دیاریکردنی، یان ئاماژە پێکردنی ئەو چەمکەوە نییە، ئەمەش پێچەوانەی وشەیە، چونکە هێمای زمانیی بۆ وشە ئاماژە بۆ واتای زۆر دەکات لە زۆر کاتدا، کە سنوورێکی ڕوون لە نێوانیاندا نییە، لەبەر ئەم هۆیە دیاریکردنی واتای ویستراوی وشە بە دەوروبەرەوە پێوەندە.[1] زانایانی زانستی زاراوەسازی لە بواری بایەخدانیان بە دەربڕین لە هێمای زمانیی کە ئاماژە بۆ چەمك دەکات، سێ جۆر هێمای زمانییان جیاکردۆتەوە:

١- وشە.

٢- زاراوە.

٣- وشەی فەرهەنگی.

لە بارەی وشەوە دەڵێن: وشە دەتوانێت واتای زۆر هەڵبگرێت و دەشێت بۆ ناونانی شتەکان بەکاربێت، و بە دەرخستنی واتاکەش پشت بە دەوروبەر

---

[1] د. محمد ظافر الصواف، التقنيات الحديثة واللغة العربية، الموسم الثقافي الخامس لمجمع اللغة العربية الاردني، عمان، ١٩٨٧، ص٢٠.

دەبەستن، بەڵام زاراوە هێمایەکی زمانیی دیاریکراوە بۆ چەمکێکی دیار کە باسکراوە، بە واتای ئەوەی واتاکەی ئەو چەمکەیە کە زاراوە ئاماژەی بۆ دەکات. پلەی ڕوونی واتاکەش پشت بەجێگەی چەمکەکە لە ناو سیستەمی چەمکە پێوەندیدارەکانەوە دەبەستێت و وشەی فەرهەنگیش زۆرجار زاراوەیە یان ناوە بۆ وەبیرهاتنەوەی زانیاری یان پێڕستکردنی سیستەمێکی تایبەت بەکاردێت، واتاکەشی پشت بە سیستەمی زانیاریی پێوەندیدار دەبەستێت[1] دەتوانین بڵێین گشت واتایەك چەمکە، بەڵام هەموو چەمکێك واتا نییە، بەوێنە ئەگەر وێناکردنەکە گۆ بکرێت، پێیدەوترێت واتا، بەڵام ئەگەر لە ئاوەزدا بوو پێی دەوترێت چەمك[2].

## گیروگرفتە بنەڕەتییەکانی زاراوە دانانی زمانی کوردی

لەگەڵ ئەوەی زاراوە بە بەردی بناغەی هەموو زمانێك دەژمێردرێت و وێڕای شانازیکردنمان بە زمانی کوردییەوە، کە لە زمانە دەوڵەمەندەکانە، بەڵام وەك هەر زمانێك لە بواری زاراوەی زانستی و تەکنەلۆژیادا، ڕووبەڕووی چەندین گیروگرفت بووەتەوە، ئەمەش بووەتە هۆی نەبوونی زاراوەیەکی زۆر بۆ گشت بوارەکانی زانست و دواکەوتنی ئاستی ڕۆشنبیری

---

(1) Helmut felber , standardization in terminology , viana , ١٩٨٥ , p.١٧.

(2) د. إيناس كمال الحديدي، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث، ل٤٨ (پەراوێز).

بەهۆی ژێردەستەیی و نەبوونی دۆزینەوە و داهێنانی زانستی و نەبوونی یەك سەرچاوەی ناوەندیی و شالاّوی ڕۆژانەی زاراوە کە خۆی بە زماندا دەکات.

ئێمە کاتێك لە دیاریکردن و دەستنیشانکردنی ئەو گیروگرفتانە دەکۆڵینەوە، کارەکەمان تەنیا ئەوە نییە هۆیەکان بدۆزرینەوە، بەڵکو دەبێ وا بکەین چارەیان بۆ بدۆزینەوە، بەلای ئێمەشەوە وەك کارێکی پراکتیکی هیچ چارەسەرێك بۆ ئەو گیروگرفتانەی کە دێنە بەردەم زاراوەی کوردی نەدۆزراونەتەوە، پێش هەموو شتێك هەندێ خاڵی ئەو چارەسەرانە، بوونی زمانێکی یەکگرتوو و دەوڵەت و کۆڕێکی زانیاریی و ئەکادیمی و ئاستێکی ڕۆشنبیریی بەرز و فەرهەنگێکی سەرتاسەریی و... چەندین هۆکاری تریشن.

هەندێ لەو گیروگرفتانە بۆ نەبوونی کۆڕێکی ئەکادیمی لە هەر وڵاتێکدا بێت، دام و دەزگایەکی زانستانەی ڕێزلێگیراوی باوەڕ پێکراوی قسەڕۆیشتوو دەگەڕێنەوە، هەروەها بزووتنەوەی ڕۆشنبیرانەی نەتەوەییانە لە نێو کورددا مێژوویەکی کۆنی نییە و سەختترین کۆسپیش لە ڕێی زمانی کوردیدا نەبوونی ئەلفوبێیەکی یەکگرتوو و زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو و بایەخنەدان بە درووستی زمانی یەکگرتووە.[1] بە چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتانە دەگەینە یەکخستنی زاراوەکانمان.

---

[1] د. جەمال نەبەز، سەرنجێك لەچەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، ژمارە (٢٢)، چاپخانەی (دار الجاحظ)، بەغدا، ١٩٧٨، ل٨٠، ٨١.

هەندێ، بوونی ئەو گیروگرفتانە بۆ ناکۆکی هەرێمیی دەگەڕێننەوە، کە ڕۆڵێکی باڵا لە تێکەڵوپێکەڵکردنی زاراوە و ئاوێتەکردنی وشەی گشتی و بازاڕی بۆ نێو زاراوە زانستییەکان لەلایەن هەرکەسەوە بە ئارەزووی خۆی بێ ئەوەی ڕەچاوی ئەو ڕێبازانە بکات، کە لە کۆڕی زانیارییەوە دەرچوون، دەگێڕن، بەڵام هەندێکی تر پێچەوانەی ئەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە دەتوانرێت لە هەندێ باردا سوود لە وشەی گشتی وەربگیرێت، بەڵام بەمەرجێك بە پێی ڕێبازەکان سوودمەند بێت و بتوانێت جێی خۆی بگرێت، هەروەها نەبوونی فەرهەنگ بە هەموو جۆرەکانییەوە و ئەو بۆشاییانەی لە زاراوەی کوردیدا هەن و وەرگرتنی ڕاستەوخۆ لە زمانی بێگانەوە و هەروەها ڕێگا جیاوازەکانی دانانی زاراوەی کوردی و بڵاویی زمانی کوردی و داگیرکردنی خاکی کوردستان لە لایەن داگیرکەرانەوە لە قۆناغە کۆنەکان و تا ئێستاش و تاکەکەسی و جیاوازیی سەرچاوەکانی وەرگێڕان و ئاستی ڕۆشنبیریی وەرگێڕان لە بوارەکانی زاراوەدا، هەروەها بوونی وشەی هاوواتا و هاوبێژ کە ئاماژە بۆ زیاتر لە واتایەك دەکەن و دەبنە هۆی گیروگرفت لەبەردەم زاراوە دانان و تێگەیشتنیان.[1]

ترسناکیی گیروگرفتەکان و یەکخستنی بەکارهێنانی زاراوە زۆرن، لەوانە کار دەکاتە سەر بیرکردنەوەی زانستیی تاکی کورد و دەبێتە ڕێگر لە تێگەیشتن و وەرگرتنی چەمکە نوێیەکان و داهێنان و پێشکەوتن، هەروەها دەبێتە گێرەشێوێنی و تێکدانی کاری زانستی و بیرکردنەوەکانمان،

---

[1] أحمد الأخضر غزال، المنهجية العامة للتعريب المواكب، معهد الدراسات والأبحاث للتعريب، الرباط – المغرب، ١٩٧٧،ل١٩.

بەڵكو زۆریی زاراوە و یەكنەخستنیان هەندێك جار تووشی هەڵە و ناكۆكیمان دەكات[٢]. ئێمەی كورد لەمێژ نییە دەستمان بە دانانی زاراوەی زانستی كردووە. لە كاتی خۆیدا بەشێك لەو زاراوانە، لەبەر هەندێك هۆ لە ناچاریدا بە پەلە و سەرپێیی، بەهەوڵی تاك تاك و پچڕپچڕ داتاشروان و هێنراوەنەتە كایەوە. هەندێك لە خۆیانەوە زۆر وشەیان بە شێوەیەكی ڕووكاری پیتیی، لە زمانی دیكەوە بۆ كوردی وەرگێڕاوە، بێ ئەوەی مەبەست و واتا زانستییەكەی بزانێت، یان واتا زمانییەكەی بە هەموو بارێكدا تێ بگەن، یان لەسەر شێوازێكی كوردی گونجاو سازی بكەن، ئەم جۆرە هەڵە لاسەنگانە بوونەتە هۆی ئەوەی گەلێك زاراوەی چەوت و ناقۆڵا بخزێنە نێو زمانی كوردییەوە و پێزی زمانەكە ببزركێنن و ڕەوانییەكەی بشێوێنن[١]، بۆیە ڕاستكردنەوەی ئەم زاراوە نالەبارانە ئەركی سەرشانی پسپۆڕانە.

گەر لە گیروگرفتەكان ورد ببینەوە، دەبینین هەندێكیان یاخود بەشێكیان پێوەندییان بە زمانی كوردی خۆیەوە هەیە و بەو زمانانەی كە لێی وەردەگرێت و بەشێكی تریشیان پێوەندیی بە ڕێبازی زاراوە

---

[٢] د. محمد رشاد الحمزاوی، العربية والحداثة – أو الفصاحة فصاحات، منشورات المعهد القومي لعلوم التربية، تونس، ١٩٨٢، ل٨٥.

هەروەها بڕوانە:

– إنترنيت: المعجم العربي الماهية والوظيفة، مجلة (الحرس الوطني)، العدد (٢٣٤)، في ١/ ١٢/ ٢٠٠١.

[١] ئیبراهیم ئەمین باڵدار،، زاراوە و زمان لە كاروانی زانیاری ئەمڕۆدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٢)، ل٢٢٩.

درووستکردنەوەکە هەیە، زمانی کوردی لەبەر ئەوەی بە زمانێکی لێکدراو هەژمار دەکرێت توانستێکی باشی بۆ دارشتنی وشەی لێکدراو و دارێژراو هەیە، ئەمە لە زمانێکی وەك عەرەبی تائاستێك وانییە، کە لە رێی پاشگر و پێشگر یان هەردووکیان پێکەوە یان ناوگر درووست دەبێت. هۆیەکی تریش تایبەتە بە قورسیی دارشتنی رێبازەکانی زاراوە دانان، بۆیە بۆ ئەم مەبەستە ناتوانین لە دانانی زاراوە سەرکەوتووبین تا خاوەنی رێبازێکی روون و دیاریکراو نەبین، چونکە زانیاری ناتوانرێت بێ رێبازێکی گونجاوی تەواو کە بۆ بەرەنگاربوونەوەی گشت پێداویستییەکانی ژیانی زانستی و ژیاری روون و تەواو و گشتی بێت[2] پشتی پێ ببەسترێت... هتد. تێکەڵکردنێکی ئەو رەگەزانەی بەشداریی لە دانانی زاراوەدا دەکەن لە ئاستێکی داواکراودا نییە و، دەبێتە هۆی تێکدان و شێوان و هەروەها تێکەڵکردنی نێوان هۆیەکانی دانان و تەکنیکییەکانی وەرگێران و رێبازەکانی یەکخستنی[1]، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کە ئێمە تا ئێستا تێروانینێکی روونمان نییە بۆ گشت ئەوانەی لە بواری زاراوە پێشکەش دەکرێن سەرەرای ئەوەی کە کورد لە کۆنەوە تا ئێستا هەندێ

---

(٢) د.إبراهيم كايد محمود، المصطلح ومشكلات تحقيقه، مجلة (التراث العربي)، مجلة فصلية تصدر عن إتحاد الكتاب العربي، العدد (٩٧)، السنة الرابعة والعشرون، دمشق، اذار ٢٠٠٥، ل٧٥.

(١) د.محمد رشاد الحمزاوي، المنهجية العامة لترجمة المصطلحات وتوحيدها وتنميطها، الطبعة الأولى، دار الغرب الإسلامي، بيروت، ١٩٨٦، ل٢٠.

هەنگاوی باشی لە گەیشتن شان بە شانی ژیاری جیهانی و گەیشتن بە ئاستێکی باش لە بواری زانست و ڕۆشنبیریدا ناوە، کەچی دۆزی زاراوە لە زمانی کوردیدا تا ئێستاش بە دەست گیروگرفتی زۆرەوە دەناڵێنێ، و چەندان لەمپەڕ و بەربەست هاتۆتە ڕێگای، کە نەهێڵێت ئەو دامودەزگایانەی کاریان زاراوە دانانە سەرەڕای ئەو هەوڵە ڕاستگۆیانەی دەیدەن هەست بە ڕۆڵی خۆیان بە شێوەییێکی تەواو نەکەن، بۆیە دەبێ پێش ئەوەی دەست بە دانانی زاراوە بۆ گشت دۆزینەوە و داهێنانەکان بکەین گرنگیی زاراوە بزانین و ڕەهەندەکانی و ئەو هۆیانە وەربگرین کە بەشداری لە جێبەجێکردن و سەرکەوتنی دەکەن دیاری بکەین و ئەو گیروگرفت و ئەستەمانەی پێشیان دەگرێت لاببەین، پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە زمانی کوردی و ئەو گرفتانەی بەدەست زاراوەوە هەیەتی بارێکی گشتییە و هەموو زمانەکانی جیهان ئەو گیروگرفتانەیان هەیە و زمان نییە لە گیروگرفتەکانی زاراوە ڕزگاری بووبێت، تەنانەت ئەو زمانانەش کە بە زمانی ژیاری و تەکنیکی زانست دادەنرێت. هەر زمانێکیش ئەم مەرجانەی خوارەوەی نەبێت بە زمانی زانست ناژمێردرێت، لەوانە:

١- ڕوونی و ئاشکرایی.

٢- درووستی بنیاتی زمانەوانی و کورتبڕی:

أ- هێماسازی.

ب- هاوکێشەسازییە بیرکارییەکان.

پ- وێنەسازی.

٣- زاراوەی زانستی.

٤- زۆر بایەخ بە ڕواڵەت نەدرێت، بەڵکو بایەخ بە ڕاستیی شتەکان بدرێت.

٥- ژیربێژی(logical).

٦- گشتگیریی ڕەوشی زانست.

٧- شەقڵی تری زمانی زانستی.[1](*)

هەروەها هەندێ گیروگرفت بەو گیروگرفتانەی کە لە پرۆسەی زاراوەسازیدا هەن پەیوەستن و هەندێکی تر لە زاراوەکە خۆیدان. ئەو گیروگرفتانەی تایبەتن بە پرۆسەی زاراوەکە، گیروگرفتی ئەرکین، دیارترین دیاردەی ئەم شتەش زۆری زاراوەیە بۆ یەك چەمك، وەك: (ڕاناو - جێناو) بۆ (ضمیر) عەرەبی، یان جیانەکردنەوەیەکی تەواوی نێوان چەمکەکان، وەك زاراوەی (زمان) کە نازانرێت ئەو پارچە گۆشتەی ناو دەمە یان وشەی زمانی قسەکردنە یان... هتد. بەڵام ئەو گیروگرفتانەی پێوەندی بە زاراوەکە خۆیەوە هەیە، گیروگرفتی دانانە، چونکە زۆرینەی هەوڵەکانی دانانی زاراوە ڕەچاوکردنی دیاریکردنی جیهانی چەمك پشتگوێ دەخەن.

---

[1] كارم السيد غنيم، اللغة العربية والنهضة العلمية المنشودة في عالمنا الاسلامي، مجلة (عالم الفكر)، المجلد التاسع عشر، العدد الرابع، وزارة الاعلام، الكويت، يناير – فبراير – مارس ١٩٨٩، ل٤٤، ٤٥، ٤٦.

(*) هەروەها لە بارەی هەمان خاڵ و ڕوونکردنەوەی زیاتر بڕوانە:

– جەمال عەبدول، گۆڤاری ئەکادیمی کوردی، ژمارە (٧)، ل١٥٩–١٦١.

پەنا نەبەردنە بەر کاری داتاشین و کورتکردنەوە، وا دەکات زاراوەکە درێژبێت، ئەمەش زانست ڕەتی دەکاتەوە، چونکە دەبێتە ڕێگر و ناهێڵێت زاراوەکە بچەسپێت و بەردەوام بێت[1]. پاش ڕوونکردنەوەی هەندێ خاڵ، کە لە پێشەوە باسکران، دەتوانین لەو ڕوانگەیەوە ئەو گیروگرفتە بنەڕەتی و سەرەکییانە دیاری بکەین، کە لەبەردەم پرۆسەی زاراوە داناندا بوونەتە گیروگرفت، ئەمانەی خوارەوەن:

### ١- گیروگرفتە زمانییەکان:

#### أ- فرە دیالێکتی Dialects:

وەك ئاشکرایە زمانی کوردی یەکێکە لەو زمانانەی کە خاوەنی دیالێکت و زار و شێوەزاری زۆرە، ئەمەش بۆ کۆمەڵێك هۆکاری جوگرافی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی[1] و... هتد، دەگەڕێتەوە. ئەمەش بۆ خۆی دەبێتە هۆی درووستبوونی زاراوەی هاوواتا و هاوبێژ و فرە واتا لە بواری زاراوەسازیدا بۆتە گیروگرفت، پێویستە ئەو زاراوانە یەکبخرێن و یەك وشە یان زاراوەی گونجاو هەڵبژێررێت، کە زۆرینەی دیالێکتەکانی کوردی قسەی پێ دەکەن، ئەو وشەیە هەڵبژێرێت و واز لەو وشانەی تر

---

[1] إنترنيت: منتدى اللسانيات/منتدى المصطلح اللساني، محمد أحمد، المصطلح العلمي بين السيرورة والاندثار.

[1] بڕوانە: د. فوئاد حەمەخورشید، زمانی کوردی دابەشبوونی جوگرافیایی دیالێکتەکانی، وەرگێڕانی: حەمەکەریم هەورامی، چاپخانەی (افاق عربية)، بەغدا، ١٩٨٥، ل٤٢، ٤٦.

بهێندرێت، بۆ نموونە ئەگەر وشەیەك لە دیالێکتی (س) و (ص) و (م) بەکارهاتبوو، یان زۆرینەی خەڵکی هەرسێ دیالێکتەکە لێی تێدەگەن، لەو بارەدا دەبێ ئەو وشەیە بۆ بەکارهێنانی وەك زاراوەیەکی یەکگرتوو هەڵبژێرین. بە شێوەیەکی تر گەر سەیرێکی ئەم هێڵکارییە بکەین ئەوەی باسمان کرد بۆمان ڕوون دەبێتەوە:




لەو وێنەیەدا دەگەینە ئەوەی ئەگەر ئەو وشەیەی لە دیالێکتی (س)دا بەکاربهێنین باشترە لە وشەی دیالێکتەکانی(ص) و (م) چونکە بە پێی هێڵکارییەکە دیارە کە ڕێژەیەکی زۆر لە خەڵکی بەکاری دێنێت. لە بواری

زاراوەسازیدا پێویستە ئەم دیالێکتانە لەبەر چاو بگیرێن، چونکە دەشێ ببێتە هۆی دانانی دوو زاراوە بۆ هەمان چەمك، بۆ نموونە دەشێ زاراوەیەکی وەك (تەندرووستی) و (ساخلەمی) کە بۆ (صحة)ی عەرەبی بەکاردێت، لەوانەیە ببێتە هۆی دوانەیی لە زاراوە داناندا وەك چەندان و چەندان زاراوەی دیکە[1]. زۆری شێوەش کاریگەریی خۆی هەیە بۆ نموونە (شواشتیك) کە درەختێکی بەهاری هەمیشە سەوزە، گەڵای وەك مۆرد وایە، بەرێك دەگرێ وەك چواڵە تاڵە. هەر ئەم وشەیە لە بادینانندا ناوە بۆ جۆرە ترێیەك و بۆ جۆرە هەنجیرێکیش. هەروەها (چا) لە ناو لوڕەکاندا بە (سارد) ئەڵێن. لە هەندێك شوێنی تر چایەکە دەخورێتەوە. پاشان (ساو) کە بەهەتاو دەڵێن و لە هەوراماندا بە (سێو)... هتد[2]بۆیە دەبینین زۆریی شێوەزار لە زمانەکەماندا بووەتە مایەی دەوڵەمەندبوونی، بەڵام هەر ئەمەش بۆ خۆی جاروبار کاری دانانی زاراوە گرانتر دەکات و ناچارمان دەکات بۆ یەك مەبەست لە وشەیەك زیاتر پێشنیاز بکەین[3].

---

[1] محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی کوردیدا، ل٥٢.

[2] جەمال بابان، هەندێك لەو زاراوانەی واتایەك زیاتر ئەبەخشن، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (دووەم)، بەشی (یەکەم)، بەغدا، ١٩٧٤، ل٥٧٠-٥٧١.

[3] ئەنجومەنی کۆڕ، لیستەی پێنجەمی زاراوەکانی کۆڕ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (سێیەم)، بەشی (دووەم)، بەغدا، ١٩٧٥، ل٥٢٨.

## ب- بوونی هاوواتا: Synonymy

شێوەزار و جۆرەکانی دیالێکت بەهۆی ئەو جیاوازییەی نێوانیان لە ڕووی وشەو دەنگ و... وایان کردووە، کە زمانی کوردی لە وشەی هاوواتا پڕبێت، ئەمەش نیشانەی دەوڵەمەندبوونی زمانەکەیە و لە زاراوەسازیدا ئەمە بە گیروگرفت دادەنرێت، بەڵام هەبوونی وشەی هاوواتا ئەگەر بۆ زمانی ئەدەبی بواری دەربڕین لەبەردەم ئەدیب و نووسەران بکاتەوە، لە بواری زاراوەسازیدا، کێشە و گرفت درووست دەکات[1]، بۆ نموونە وەك ئەم وشانە کە بۆ واتای جیاواز بە کاردێن: (ئاوارە، لانەواز، بێدەر)،(فرمێسك، ئەشك، ئەسرین، ڕۆندك)[2]،(کچ، دوێت، کیژ،... هتد).

وشەی هاوواتا (مرادف – Senonymy) بەو وشانە دەوترێن کە یەك واتا دەبەخشن، یاخود واتایان لێك نزیکە، بەڵام لە خوێندنەوە و نووسینیاندا جیاوازن[3]، وەك:

پاك – خاوێن – پاکژ

خەم – خەفەت ....

هەروەها (د.محمد علی الخولي) بەم شێوەیە پێناسەی دەکات: هاوواتا لە یەکچوونی واتایە لە دوو وشە یان زیاتر لە هەمان زماندا[4]. هەرچۆنێك

---

(1) ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل١٣٣.

(2) تاهیر سادق، فەرهەنگی هاوواتاکانی کوردی، کوردستان – سلێمانی، ١٩٩٨، ل١٧.

(3) د.ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، ل٢٠.

(4) د. محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري، ل٢٧٨.

بێت دیاردەی هاوواتایی لە زاراوەسازیدا پەسەند نییە و یەك زاراوە بۆ مەبەستێك پەسەند و درووستە... .

### ج- بوونی هاوبێژ:

هاوبێژیش وەك هاوواتا یەکێکە لەوانەی لە بواری زاراوەسازیدا بۆتە گیروگرفت لەبەردەم زاراوە داناندا و بەوە پێناسە دەکرێت: یەك فۆرم، کە دوو واتا یان زیاتری هەبێ، مەبەست لە یەکەم فۆرم، تەنیا فۆرمی وشە نییە، بەڵکو گیرەك و گرێ و ڕستەش لە بازنەی ئەو مەبەستەدان[1]، یان هاوبێژ ئەوەیە: وشە هەن بە خوێندنەوە و نووسین وەك یەکن، بەڵام واتایان جیاوازە، وەك:

باو – دەستوور، فیسار شت بووە بە باو.

باو – باوك.

باو – زیادەی شتێك بەسەر شتێکی تردا.

.........................

شین – ڕەنگێکی نزیك مۆر و سەوز.

شین – شیوەن ....

بۆیە زۆر جار دەبینین یەك زاراوە بۆ چەندین واتای جیاواز بەکاردێت، کە جۆرێك تەمومژی واتایی درووست دەکات، زمانناسان بەم دیاردەیە دەڵێن هاوبێژیی، یان هاودەنگیی و هاوبەشی لە بێژەدا. بەمجۆرە دیاردەی

---

(1) صباح رشید قادر، هاوبێژی و فرەواتایی، نامەی ماجستێر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٧.

هاوبیژیی بە گرفتێکی دیکە لەو گرفتانەی کە دێنە بەردەم زاراوەسازی کوردی، دادەنرێت.

هەروەها زۆر جار لە فەرهەنگدا کەرەسەکانی زمان، بۆ چەند واتایەکی جیاواز بەکاردێن، جیاوازی بەخشینی واتایی هەر کەرەسەیەکیش دەبێتە هۆی ئالۆزی و تێکەڵی ئەو واتایە لە لایەن گوێگر یان خوێنەرەوە[1]، بۆیە پێویستە جیاوازیی نێوان وشەکە خۆی و هەروەها نێوان ڕێژەکەی و واتاکەی بکەین[2]، بۆ نموونە:

با ١ – بە واتای بەڵێ یان (ئا) دێت.

با ٢ – وەك ناوێك بۆ (ریاح)ی عەرەبی بەکاردێت (تا با لەم کونەوە بێت...).

با ٣ – لێگەڕان، وەك (با بڕۆین/ با بچین...).

با ٤ – ئارەزووی هێندێ جانەوەری مێچکە بۆ نێر: (دێڵە بە با)، (پشیلەکە وە با هاتووە...).

با ٥ – لەکن، لجەم، لنك.

با ٦ – نەخۆشی و ژانێکی لەشە.

با ٧- زگی بای کردووە.

با ٨- بریتییە لە تڕ و تس.

---

[1] طالب حوسێن عەلی، هەندێ لایەن لە پێوەندی ڕستە و واتا لە کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێجی ئاداب – زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٩٨، ل٥٥.

[2] جون لاينز، اللغة والمعنى والسياق، ترجمة: مجيد الماشطة، مطبعة جامعة البصرة، البصرة، ١٩٨٧، ل١٩.

با ٩- پێچدان (ئەو بەنە بادەوە / ئەو کۆپتەرە بایدایەوە...).

با١٠- ئەستووربوونی لەش (دەستم بای کردووە...).

با١١- بانگ کردن[*]............

## ٢- زمانی سەرچاوە (بیانی):

هەندێ لەو گیروگرفتانە بۆ ئەو زمانە سەرچاوەیەی کە زاراوەی لێ وەرگیراوە، دەگەڕێنەوە:

- فرە سەرچاوەیی زاراوەکان:

دەشێ سەرچاوەی هەندێ زاراوە کە هەندێ جار لە ڕێی زمانی عەرەبییەوە گەیشتبێتە زمانی کوردیی، یان زمانی فەڕەنسی یان ئینگلیزی بێت. هەرچەندە هەردوو زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسی هەندێ زاراوە بەکاردەهێنن، کە لە بنجدا گریکی یان لاتینین، شێوازی جیاواز لە دەربڕین بەکاردێنن:

- ئەو کاتەی لە زمانی فەڕەنسی و ئینگلیزیدا دوو ناوی جیاواز بۆ یەك شت یان چەمك دادەنێن گەر لە هەردووکیان وەرگێڕدران بە جیاجیا، ئەوا

---

[*] بڕوانە:

ا- Taufiq wahby and C.J.Edmonds ,A Kurdish – English dictionary , London , ١٩٦٦,p.٥-٦.

ب- هەژار، فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە (کردی – فارسی)، تەهران، ١٣٨١، ل ٣٧.

دوو زاراوەی لێك جیا لە ڕووی بنچینەی داڕشتنەوە پەیدا دەبن، واتە دوانەیی لە زاراوەدا دروست دەبێت، بۆ نموونە:

نیترۆجین Nitrojen لە زمانی ئینگلیزیدا.

ئازۆت Azot لە زمانی فەڕەنسیدا.

هەمان گاز دەگەیێنێت گەر هەردوو وشە وەرگێڕان، دەبنە دوو زاراوەی جیاواز.

- ئەگەر دوو زاراوە هەبن لە تیرەی داڕشتندا هەریەکە جیابێت لەوەی دیکە و لە هەمان زمان یان لە دوو زمانی لەیەك جیادا، ئەوا دوو زاراوەیی دروست دەبێت، بۆ نموونە:

ئەگەر یەکێکیان لە ئینگلیزی و ئەوی تریان لە فەڕەنسی وەرگرین و وەریان بگێڕین بۆ زمانی کوردی، ئەوا دوو زاراوەی سەربەخۆ دروست دەبێت، وەك:

کاتژمێری سەرەکی Master clok ئینگلیزی

کاتژمێری دایك Horloj emere فەڕەنسی.[١]

لێرەدا دوو زاراوەی لەیەك جیاوازمان بۆ دروست بوو، بۆ هەمان شت کە پێوەندیی بە ڕیشەی وشەکەوە هەیە لەم دوو زمانەدا، بۆیە پێویستە لەکاتی هەڵبژاردنی زاراوەدا ئاگاداری فرە سەرچاوەیی زاراوەکان ببین و هەڵبژاردنی لە دوو زمانی جیاوازدا دەبێتە هۆی دروستبوونی گیروگرفت و هۆی لە دەستدانی یەکێتی ڕیشەی زاراوەکان، جگە لەمەش بە هەمان شێوە دەبێت ئاگامان لە وشەی هاوواتا و هاوبێژی ئەو زمانانە بێت

---

[١] بڕوانە: د.علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ل٧٩، ٨٠.

لەکاتی وەرگێڕانی وشە هاواتاکان، چونکە لەوانەیە وەرگێڕ نەزانێ ئەو دوو زاراوەیە هاوواتا یان هاوبێژن، لە ئەنجامیشدا هەر کەسە بە شێوەیەکی جیاواز وەریان دەگێڕێ، هەروەها هەندێ هۆی تریش هەن، لەوانە:

- هۆی مێژوویی بنچینەی زاراوە یان وشەکان لە ڕەگەزدا یەك بوون، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات و ڕۆژگار لەیەك دوورکەوتوونەتەوە.

- ڕێکەوت: ناو هەیە بە ڕێکەوت بەسەر دوو شتدا سەپاوە و هەریەکە شوێنی خۆی گرتووە، وەك: کەو، کەو کە لە بابەتی بێژنگە و دەغڵی پێ پاك دەکرێتەوە.[1]

## ٣- گیروگرفتی ڕێکخستن:

ئەم گیروگرفتەش سێ جۆر لە خۆ دەگرێت:

أ- زۆریی دانەرانی زاراوە.

ب- پشتگوێخستنی کولتووری کۆنی کورد.

ج- پشتگوێخستنی ئاستەی ئاسانیی بڵاوبوونەوەی زاراوە لە نێو خەڵکدا[2].

---

[1] جەمال بابان، هەندێك لەو زاراوانەی واتایەك زیاتر ئەبەخشن، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (٢)، بەشی (١)، ل٥٦٩.

هەروەها بڕوانە: گۆڤاری (پەروەردە و زانست)، ژمارە (٤)، ساڵی (٢)، بەغدا، ١٩٧٢، ل٤.

[2] محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی کوردیدا، ل٥٦.

زۆری دانەرانی زاراوە وایکردووە گیروگرفت بۆ کاری زاراوەسازی کوردی درووست بکەن، ئەویش لەبەر کۆمەڵێ هۆ، لەوانە: ئەوانەی زاراوەیان داناوە، لەوانەیە لەو بوارە زۆر لێهاتوو نەبووبن و زمانی تریان بە باشی نەزانیبێت، یان شارەزایی تەواویان لە ڕێبازەکانی دانانی زاراوەی کوردی باش نەبووبێ یان زانیارییان لە بارەی لایەنی تیۆریی و پراکتیکی ئەم زانستە کەم بووبێت و شارەزایی تەواویان لە کەلتوور و داب و نەریتی کۆمەڵ کەم بووبێت...ئەمە و چەندان هۆ، کە لە لایەن دانەرانی زاراوەوە بوونەتە هۆی بوونی گیروگرفت لەبەردەم زاراوەی کوریدا.

- کوولتووری کوردیی بە پێی ئەو بارودۆخەی هەیەتی و بە پێی ئەو کۆمەڵە شێوەزار و دیالێکتانەی هەیەتی زۆر دەوڵەمەندە و دەتوانرێت لە دانانی زاراوەدا سوودی لێ ببینرێت و پشتگوێخستنی هۆیەکە بۆ درووستکردنی گیروگرفت و لاوازبوونی زاراوەی کوردی.

- زاراوە تا ئاسان و سووك و کورت بێت، لە ناو خەڵکیدا زیاتر بڵاودەبێتەوە و جێگیر دەبێت، بەڵام پشتگوێخستنی ئەم مەرجانە و ئاڵۆزی و لێڵی زاراوە و درێژبوونی دەبێتە هۆی گیروگرفت لە دانانی زاراوەدا و لە لای خەڵکیش.

بێجگە لەم هۆیانە زمانی کوردی لە بواری زاراوە تەکنیکییە زانستییەکاندا دووچاری هەندێ گیروگرفت بووەتەوە، هۆی سەرەکیش، بە گشتی ئەمانەن:

**١- ژێر دەستەیی:** زمانی کوردی هەر لە فەرمانداریەتی دەوڵەتی عوسمانییەوە بگرە هەتا سییەکانی سەدەی بیستەم خزمەتێکی بەرچاوی نەکراوە، لەم بوارەدا و لە کارگێڕی و فێرکردندا بە فراوانی بەکار نەهاتووە[١]، ئەوەشیان بووە هۆیەك بۆ لاوازبوون و پووکانەوەی لەم بوارەدا.

زمانی کوردی، کە ئەمڕۆ کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر قسەی پێ دەکەن و کاری زانستی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و...، پێ ئەنجام دەدەن و دەردەبڕن، هەمیشە ئامانجێکی سەرەکی ڕاستەوخۆی سیاسەتی داگیرکەرانی کوردستان بووە. قەدەغەکردنی زمانی کوردی لە لایەن هەموو داگیرکەرانی کوردستانەوە و سەپاندنی زمانی خۆیان بەسەر زمانی کوردیدا، ڕۆڵی زۆری لە سنووردارکردنی زمانی کوردی[١]، بینیوە، هەر زمانێکیش بە سنووردار کرا لاواز دەبێت و کار دەکاتە سەر دانانی زاراوەکەشی. بۆیە ئەم ژێر دەستەییەی کورد لە لایەن داگیرکەرانی عوسمانی لە کۆندا و داگیرکردنی لەلایەن (تورکیا، سوریا، عێراق، ئێران) لەم سەردەمەدا وایکردووە کە زمانی کوردی لە بواری دانانی زاراوەدا هەنگاوی باش نەنێت.

**٢- نەبوونی دەوڵەت:** بوونی دەوڵەت و قەوارە و کیانی سیاسی کار دەکاتە سەر دانانی زاراوە و یەکخستنیان، چونکە هەر میللەتێك کە دەوڵەتی هەبوو دەتوانێت لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە گشت بوارەکانی (کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و زانستی و ئابووری و ڕامیاری و... هتد ،

---

[١] محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی کوردیدا، ل٤٨.

[١] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل٢٨٣.

بکات و ڕۆڵەکانی بۆ تەواوکردنی خوێندن و ئەنجامدانی کاری زانستی بنێرێتە دەرەوە، کە ئەمەش لە پێشخستنی کۆمەڵ و زمان و بەهەمان شێوەش لە دانانی زاراوە و زاراوەسازی کوردیدا ڕەنگدانەوەی خۆی دەبێت، هەروەها ئەگەر دەوڵەتت هەبوو دەتوانرێ لەڕێی ئەو کۆڕی زانیاری و دامودەزگا فەرمییانەی وڵات بڕیارێك دەربکرێت یەکێك لەوانە بڕیاردان لەسەر ئەو زاراوانەی کە لە بارەی زۆر لایەنی زانستییەوە بۆ کاری زانستی بەکارمان دێن، پێچەوانەی ئەمەش کاری زاراوەسازی کوردی لاواز دەبێت و دووچاری گیروگرفت دەبێت.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت نەبوونی دەوڵەتێکی کوردی، گەلێك ڕەنگدانەوەی خراپی بۆ سەر زمان و زاراوەسازی کوردی هەیە، کورد وەك نەتەوەیەك لە هەموو پارچەکاندا شەڕی لە نێوبردنی کراوە و زمانەکەی یان قەدەغە بووە یان بوارێکی تەسکیان بۆ هێشتۆتەوە و زمانی داگیرکەریان بەسەردا سەپاندووە، ئەمەش کاریگەریی خۆی هەبووە، لەوانە:

١- بەکار نەهێنانی زمان لە بوارەکانی زانست و پەروەردە و فێرکردندا تەنانەت بۆ کاروباری ڕۆژانەش بەکارنەهاتووە، هەندێك لە کوردەکانی ئەو پارچانەی کوردستان نەك هەر لە زمانی کوردەکانی دیکەی کوردستان تێناگەن، بەڵکو هەندێکیان زمانی دایکیشیان لە بیر چۆتەوە و نایزانن.

٢- بەکارنەهێنانی زمان بە بەردەوامی لە خوێندن و پەروەردە و بوارە زانستیی و تەکنیکی و ڕۆشنبیرییە جیاوازەکاندا.

٣- هەستی لاوازیی و تۆوی باوەڕ بەخۆ نەبوون لە دەروونی تاکی کورددا، بەرانبەر بە زمانەکەی خۆی دەڕوێنیٚ.

٤- دەرککردنی مرۆڤی کورد بە هەبوونی خۆی، وەکو تاکێکی نەتەوەیی تایبەت لەو ساتەوەیە کە دەرك بکات خاوەنی زمانێکی تایبەتە و دەبیٚ بەو زمانە بدویٚ و خۆی بناسێنیٚ، یەکێك لە سیماکانی هۆشیاریی نەتەوەیی گرنگیدانی ئەو نەتەوەیەیە بە زمانی خۆی[1].

**٣- پێشنەکەوتنی زانستی:** پێشکەوتنی زانستیی هۆکارێکی گەورەیە بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵ لە گشت لایەنەکانی زانستیدا، گەلی کوردیش لەبەر کۆمەڵیٚ هۆکاری زانراو تا ئێستا لە بواری زانستیی و زانیاریدا هەوڵی داوە هەنگاو بنێت، لە ڕێی بایەخدان بە کاری زانستی و تەکنیکی و... هتد شان لە شانی زمانە پێشکەوتووەکان بدات. ئەمەش گەر هەموو ئەندامانی کۆمەڵ قۆڵی لیٚ هەڵنەماڵن نایەتە دییٚ.

نەبوونی داهێنان و دۆزینەوەی گەورەی زانستیی لە کوردستان بۆ ئەوەی زاراوەی کوردی بەسەردا ببڕێت، وەك دەزانین زۆربەی داهێنانی کارە زانستییە گەورەکان بە ناوی داهێنەرەکانیانەوە ناونراون، وەك: (ڤۆڵت، ئۆم، وات، ...).

[1] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل٢٨٥.

## ٣- کەمتەرخەمی کۆڕی زانیاریی:

لە هەموو وڵاتێکدا کۆڕی زانیاریی گەورەترین دەزگایە، لەبەر ئەو ڕۆڵە گەورەیەی کە لە پێشخستنی زانست و ڕۆشنبیریدا دەیگێڕێت، ئەم جۆرە کۆڕانە لەهەر وڵاتێکدا بن بۆ بڵاوکردنەوە و چەسپاندنی هەموو جۆرە دانان و گۆڕین و چارەسەرکردنێك لە بارەی زمانەوە[1] گەورەترین دەسەڵاتێکی زانستین، هەروەها دەتوانێت بە پێی ئەو ئەزموونانەی کە هەیەتی و بە پێی ئەو زانایانەی کاری تێدەکەن ئەو ڕۆڵە گەورەیە لە دانانی زاراوەدا بگێڕێت، کۆڕیش ئەوەنەبێت تەنیا هەر پشت بەخۆی ببەستێت و بڕیار لەسەر دانانی زاراوە بدات، بەڵکو لەو بوارەدا پەنا بۆ گشت چینەکانی کۆمەڵ دەبات ئەوەتا ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کورد، دەڵێت: ئەنجومەنی کۆڕ لە کاتی دانان و هەڵبژاردنی زاراوەکانیدا هەوڵی داوە لە هەموو ڕوویەکەوە کەڵك لە بەرهەمی شاعیرە کۆنەکان و فۆلکلۆر و قسەی باوی ناو لادێ و ناوچە جیاوازەکانی کوردستان و فەرهەنگە کوردییەکان وەربگرێت[1] و کۆڕیش کە زاراوەی نوێ دادەنێت مەبەستی ئەوە نییە وشە کۆنەکانمان لە بیر بچێتەوە و بەکاریان نەهێنین و دەڵێت: لێرەدا بە پێویستی دەزانین ئەوەیش بخەینە بەرچاوی ئەنجومەنی کۆڕ بە

---

[1] د.جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، بامبێرگ – ئەڵمانیا، ١٩٧٦، ل١٤.

[1] ئەنجومەنی کۆڕ، زاراوەی کارگێڕی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (یەکەم)، بەشی (یەکەم)، بەغدا، ١٩٧٣، ل٤٢١.

دانانی زاراوەی نوێ نایەوێت زاراوە و وشە بەکارهێنراوەکانی تر لە ناوبچێت و ئەمە بە هەڵەیەکی گەورە دادەنێت[٢].

لە دانانی زاراوەدا کۆڕی زانیاریی کورد ڕۆڵێکی چالاکی لە بارەی دانان و داڕشتن و وەرگێڕانی زاراوەوە گێڕابوو، نەك تەنیا بایەخێکی زۆری پێدابوو، بەڵکو بەشی زۆری کاتی خۆی بۆ ئەم کارە گرنگە تەرخان کردبوو. چەندەها لیژنەی زانستی بۆ کاری زاراوە تەرخان کردبوو و لە هەوڵەکانی پێش خۆی بەوە جیا دەکرێتەوە کە لە بواری زاراوە داناندا، تا ئەندازەیەك لەسەر ڕێبازێکی زانستیی کاری دەکرد.

لە سەرەتای دامەزراندنیەوە هەوڵی داوە زاراوەی جۆراوجۆر دابنێت، کە گشت بوارەکانی زانست سوودیان لێ ببینن و بەرهەمی ئەو هەوڵەش ئەو لیستانەن کە لەو بوارەدا داینناون کە لە پێنج ژمارەی گۆڤاری کۆڕدا بڵاوکراونەتەوە، لە دواییشدا لە سێ کتێبی سەربەخۆدا: (زاراوەی کارگێڕی ١٩٧٣-١٩٧٤) و (زاراوەی هەمەچەشنە – ١٩٧٤) و (لیستی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ – ١٩٧٥) چاپکراون[*]، کۆڕ تا ئاستێك لە

---

[٢] هەمان سەرچاوە، ل٤٢٢.

[*] بڕوانە:

– کۆڕی زانیاری کورد، (گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد):

أ– زاراوەی کارگێڕی، بەرگی (یەکەم)، بەشی (یەکەم)، بەغدا، ١٩٧٣، ل٤١٩–٥٢٥.

ب– لیستی دووەمی زاراوەکانی کۆڕ، بەرگی (دووەم)، بەشی (یەکەم)، بەغدا، ١٩٧٤، ل٨٩٤–٩٣٩.

کارەکانیدا سەرکەوتووبوو، کە زاراوەکانی بۆ زانستی زاراوەسازیی کوردی گەنجینەییێکی بە نرخن. دەتوانین ئەم کارانەی کۆڕ لە بارەی داڕشتن و وەرگێڕانی زاراوەی کوردی و پێکهێنانی لیژنەکانی، بەسەرەتایەکی باش، لە ڕێچکەی قۆناغەکانی دیکەی زاراوەسازیی کوردی دابنێین[1]. بۆیە بوونی کۆڕێکی زانستی و ئەکادیمی زۆر پێویستە و نەبوونیشی دەبێتە هۆی گیروگرفت لە بەردەم زاراوەسازیی کوردیدا، چونکە ئەو کۆڕە کارێکی گەورە و بە شێوازێکی زانستی پێشکەش بە زانستی زاراوەسازیی کوردیی و دانانی زاراوە دەکات.

---

پ – لیستی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕ، بەرگی (دووەم)، بەشی (دووەم)، بەغدا، ١٩٧٤، ل١٦٦–٢١٨.

ت – لیستی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ، بەرگی (سێیەم)، بەشی (یەکەم)، بەغدا، ١٩٧٥، ل٤٩٧–٥٤٢.

ج– لیستی پێنجەمی زاراوەکانی کۆڕ، بەرگی (سێیەم)، بەشی (دووەم)، بەغدا، ١٩٧٥، ل٥٢٦–٥٥٣.

چ– لیستی شەشەمی زاراوەکانی کۆڕ، بەرگی (چوارەم)، بەغدا، ١٩٧٦، ل٤٧٦– ٤٧٩.

هەروەها کۆڕی زانیاری کوردستان ئەوەی لەبەر دەستی ئێمەدا بێت دوو نامیلکەی لە بارەی زاراوەوە بە چاپ گەیاندووە:

– لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان:

أ– زاراوەی کارگێڕی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٤، (٤٧ لاپەڕەیە).

ب– زاراوەی یاسایی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٤، (٤٧ لاپەڕەیە).

[1] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی ، ل٢٨٩.

دیارە تا ماوەیەکی باش لە دانانی زاراوە و پێشخستنی زانست بەردەوام بوو، بەڵام دوای کۆتایی هەشتاکان ئیدی کاری کۆڕ بەرە و کزبوون چوو، ئەویش لەبەر ئەو فشارەبوو کە ڕژێمی بەعس کردبوویە سەر کۆڕ و ئەندامانی، کە بووە هۆی ئەوەی هەندێ یان زۆرینەی ئەو ئەندامانە لە کۆڕ نەمێنن، لەم بارەیەشەوە هێما بۆ چەند کەموکورتییەك دەکەین، چونکە یەك سەرچاوەی گشتی زاراوە داناغان نییە:

١- نەبوونی یەك سەرچاوەی نێوەندیی بۆ دانانی زاراوە، هەرچەندە کۆڕی زانیاری ڕۆڵێك لەم بوارەدا دەبینێ، بەڵام زانکۆ و وەرگێڕان و دامودەزگاکانی دیکەش سەرەڕای نووسەران و ڕۆژنامەنووسانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن... هتد، ئەمڕۆ ڕۆڵێکی بەرچاویان هەیە[٢].

٢- نەبوونی لیژنەیەکی زانستیی پسپۆڕ، لە لایەن کۆڕی زانیارییەوە بۆ هەڵسەنگاندن و تاوتوێکردنی ئەو زاراوانەی کە بەرهەمی (هەوڵی تاکە کەسین) بە تایبەتی ئەو ژمارە زۆرەی زاراوەیەی کە لە دوای ڕاپەڕینی گەلی کوردستانی ساڵی ١٩٩١ دانراون، پێکهێنرابێت.

٢- چارەسەرکردنی کێشەی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردی و هەوڵدان بۆ پێکهێنانی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی سەرتاسەری کوردستان[١].

---

[٢] محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی کوردیدا، ل٤٨.

[١] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی ، ل٢٨٩.

## ٥- کەمی ژمارەی دەزگای کلتووری و ئەکادیمی:

گەلی کورد ئێستا خاوەنی کۆمەڵێك نووسەری باشە، لە گشت بوارەکانی زانستدا کار دەکەن و خزمەتی زمانی کوردی دەکەن، بەڵام هەندێ جار باری ئابووریی زۆرینەی نووسەران ڕێگا نادات بەرهەمەکانیان بە چاپ بگەیەنن، دەزگایەکی نەتەوەیی یەکگرتوومان نییە، بەرهەمەکانی ئەو نووسەرانە چاپ بکات، ئەمە خۆی لە خۆیدا یەکێکە لە گیروگرفتەکانی باری زاراوە و دواکەوتنی زانست و ڕۆشنبیریی و کلتووری کوردی.

## ٦- نەبوونی فەرهەنگ:

بوونی فەرهەنگ یەکێکە لە ئەرکە پێویستەکانی پەرەپێدانی زمانی کوردی، بایەخدان بە دانانی وشە و ڕێکخستنی، سەرەڕای فەرهەنگی نەتەوەیی پێویستیشمان بە ئینسکلۆپیدیای نەتەوەییە.

زمانی هەر نەتەوەیەك بە فەرهەنگەکەی هەڵدەسەنگێنرێت، کەواتە دەتوانین بڵێین فەرهەنگ پێناسەیەکە، کە کلتوور و ڕۆشنبیری و پلەی شارستانیەتی و پێشکەوتوویی و کەسایەتیی ئەو گەلەی پێ دەردەکەوێت، کە بەو زمانە دەپەیڤن[١].

ئەرکی فەرهەنگ ڕوونکردنەوە و پێناسینی وشە و ناساندنیەتی بەو کەسەی کە شارەزایی تەواوی لە وشەدا نییە و فەرهەنگیش وەك تۆمارگەیەك وشە لە فەوتان دەپارێزێت و فەرهەنگی زمان دەوڵەمەند

---

[١] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی ، ل٢٩٣.

دەکات، هەروەها لێی کۆڵراوەتەوە و واتای ڕوون کراوەتەوە و لێکدراوەتەوە و شی کراوەتەوە و زانیاری لە بارەی چۆنێتی نووسینی و بەدەماهاتن و پەیدابوونی... دراوە[٢]، لەبەر ئەوە بەهۆی فەرهەنگەوە خەرمانی وشەی کوردی گرد دەکرێتەوە، وشە و زاراوەی میللی لەنێوچوون دەپارێزرێت.

گەلی کوردیش کەم تا زۆر کاری فەرهەنگنووسیی کردووە، بەڵام گشت ئەو کارانە بە دڵۆپێك لە دەریای فەرهەنگی کوردیی دەژمێررێن[*]، چونکە دەتوانین بڵێین کورد تا ئێستا خاوەنی فەرهەنگێکی وا نییە

---

[٢] د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، ل٦٩.

[*] سەبارەت بە پوختەی مێژووی فەرهەنگنووسیی کوردی بڕوانە:

- سەید عەبدوڵڵای سەمەدی: بەسەرکردنەوەی مێژووی ٣٢٠ساڵەی فرهەنگنووسی زمانی کوردی، گۆڤاری (مهاباد):

ژمارە (١٣)، ساڵی (٢)، بەشی (١)، مهاباد، ٢٠٠٢، ل١٥-١٧.

ژمارە (١٤)، ساڵی (٢)، بەشی (٢)، مهاباد، ٢٠٠٢، ل١٨-١٩.

ژمارە (١٥)، ساڵی (٢)، بەشی (٣)، مهاباد، ٢٠٠٢، ل١٦-١٧.

ژمارە (١٦)، ساڵی (٢)، بەشی (٤)، مهاباد، ٢٠٠٢، ل٢٠-٢١. =

ژمارە (١٧)، ساڵی (٢)، بەشی (٥)، مهاباد، ٢٠٠٢، ل٨-٩.

ژمارە (١٨)، ساڵی (٢)، بەشی (٦)، مهاباد، ٢٠٠٢، ل١٤-١٧.

ژمارە (١٩)، ساڵی (٢)، بەشی (٧)، مهاباد، ٢٠٠٢، ل٢٢-٢٣.

ژمارە (٢٠)، ساڵی (٢)، بەشی (٨)، مهاباد، ٢٠٠٢، ل٢٢-٢٤.

ژمارە (٢١)، ساڵی (٢)، بەشی (٩)، مهاباد، ٢٠٠٢، ل٢٤-٢٥.

ژمارە (٢٢)، ساڵی (٢)، بەشی (١٠)، مهاباد، ٢٠٠٢، ل٢٤-٢٥.

ژمارە (٢٣)، ساڵی (٢)، بەشی (١١)، مهاباد، ٢٠٠٣، ل٢٠-٢١.

ژمارە (٢٤)، ساڵی (٢)، بەشی (١٢)، مهاباد، ٢٠٠٣، ل٢١-٢٢.

توانیبێتی گشت لق و پۆپ و شێوە جۆر بە جۆرەکانی زمانی کوردی لەخۆ بگرێت، واتە فەرهەنگێکی نەتەوەیی یەکگرتوومان نییە، گشت وشە و زاراوەکانی تێدابێت و ببێتە بناغەی زمانێکی ئەدەبی یەکگرتوو، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت کە لەلایەنی فەرهەنگ نووسینەوە دواکەوتووین و ژمارەی فەرهەنگەکانمان لەوانەیە لە (٢٠٠- ٣٠٠) یان زیاتر تێپەڕ نەکات، کەچی زمانە زیندووەکان ژمارەی فەرهەنگەکانیان گەیشتوونەتە (١٥٠٠) فەرهەنگ[١] دواکەوتوویی کوردیش لە بواری فەرهەنگنووسیندا بۆ هۆکاری سیاسیی، زمانەوانی، ئایینی، کەلتووری، ژێر دەستەیی، نەخوێندەواری،... هتد، دەگەڕێتەوە.

## مەرج و بنەماکانی زاراوەدانان

کە دەمانەوێت لە مەرجەکانی زاراوەدانان بدوێین، دەبێ ئەوە بزانین، زانستی زاراوەسازی بنەمای تایبەت بە دانانی زاراوەکان لەسەر بنەڕەتێکی پێوانەیی یەکگرتوو وەخۆ دەگرێت، ئەگەر بێت و زمان ڕێ بە هۆکاری زۆر لە پێکهێنانی زاراوەکان بدات، ئەوا زانستی زاراوەسازی ئەو مەرجە ئاراستەکراوانە دەستنیشان دەکات. لە ڕێی ئەم ماندوبوون و کارکردنە

---

[١] حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردی (کۆڵینەوە و ڕەخنە)، چاپی دووەم، چاپخانەی (کارۆ)، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٤٨٧.

توێژەران دۆزێکی زۆر بۆ گیروگرفتە زمانەوانییەکانی ئێستا یا دواڕۆژیان تۆمار دەکەن.

دۆزی دانانی زاراوە کارێکی تا ئەندازەیەك زۆر گران نییە و ئەرکێکی قورس نییە، چونکە ئەوە ئەرکێکە توانستی ئەو بابەتە و شارەزایی زمانەوانی و لێهاتوویی و چالاکی زانستی هاوچەرخی پێویستە، بەڵام قورسی یان گیروگرفتەکە زیاتر دەبێت گەر هات و دۆزەکە بە بواری وەرگێڕان و گواستنەوە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر پەیوەستبوو. ئەگەرچی ئەوانەی لە دانان و وەرگێڕانی زاراوەکاندا، بە تایبەتی زاراوەکانی کتێب و قوتابخانەدا بەشدارییان کردووە، وەك کارێکی سەرەتایی و بەهۆی وەرگێڕان و گواستنەوەوە ئەم کارەیان لە کەموکووڕیی بەدەر نەبووە و تووشی چەند گیروگرفتێك بوون، لەوانە:

١- دانانی چەند زاراوەیەك بۆ یەك چەمك، جاری وا دەبینی لە یەك کتێبدا دوو جۆرە زاراوە بۆ یەك چەمك بەکارهاتووە، وەکو (هێڵی یەکسانی، هێڵی کەمەرەی زەوی، خەتی ئیستیوا) لە کتێبی جوگرافیادا، یان ئەو زاراوەیەی کە لە کتێبی پۆلێکدا بەکارهاتووە لە کتێبی پۆلێکی تردا بۆ واتای زاراوەیەکی دی بەکارهێنراوە، هۆیەکەشی لەوانەیە ئەوەبێ کە لیژنەی جودا جودا کتێبەکانی بابەتێکی زانستی چەند پۆلێکیان کردبێ بە کوردی و لە کاری یەکتر ئاگادار نەبووبن.

٢- دەست نەدان و ناڕێکیی هەندێك زاراوە، ئەمەش بۆ چەند هۆیەك دەگەڕێتەوە:

أ- ئەندامانی لیژنەکانی کتێب و وەرگێڕان و مامۆستایانی بابەتە زانستییەکان کاتی خۆی ئەو ماددانەیان بە کوردی نەخوێندووە و شارەزاییەکی تەواویان لە کوردی و لە وشە و زاراوەکاندا نەبووە.

ب- کردنە کوردیی کتێبەکان بە لێشاو و تێکڕایی بوو، لەچاو زمانەکەمان و ئەو بابەتە زانستییانەشدا نوێ بوون.

پ- لە دانان و هەڵبژاردن و وەرگێڕانی زاراوەکاندا هەندێك جار ڕێگەی زانستی پەیڕە و نەکراوە، کە لە داتاشین و خواستنەوەدا، یان لە وەرگێڕان و کردنە کوردی، یان لە داڕشتنندا هەوڵی ئەوە نەدراوە، کە بەپێی دەستووری زانستی و لۆجیك ئەم جۆرە کردارانەی دانانی زاراوەکان پتە و بکەن.

ت- زۆر کەم نەبێت وشەگەلی شێوەزارە جیاوازەکانی کوردی بۆ لێ خواستنەوە و داڕشتنی زاراوەی نوێ بەکار نەهێنراون[1].

کاتێ باسی دانانی زاراوە دەکەین، وەرگێڕان یەکێکە لەو هۆیانەی لە ڕێگەیەوە دەتوانرێت زاراوە دابنرێت، یان لە ڕێگەیەوە زاراوەیەك لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر بگوازرێتەوە. زمانە هاوچەرخەکان کە لە سەر ڕێگا دەستنیشانکراوەکانی (ئەرستۆ) بۆ گواستنەوەی وشە لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی تر تێبینیان هەیە و سێ ڕێگای دی لەم ڕوانگەیەوە دەخەنە ڕوو:

---

[1] عبدالرزاق بیمار، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، ل٢٨٧-٢٨٨.

**یەکەم:**

فراوانکردنی واتای وشە و شکاندنی سنووری لە چەمکێکی تایبەتییەوە بۆ مەبەستێکی فراوان... وەك وشەی (سەرچاوە) بۆ واتایەکی دەستنیشانکراو بەکارهاتووە و لە میانی ڕۆشنبیری و زانیاری و زانستیدا بووە بە زاراوەیەکی ژیاریی فراوان.

**دووەم:**

تایبەتیکردنی واتای فراوانی وشەیەك و گواستنەوەی لە جوغزێکی بەر بڵاوەوە بۆ ئەرکێکی دەستنیشانکراو. بۆ نموونە وشەی (گەڕێن) کە بە واتای (ئۆتومۆبیل/ئۆتەمبیل) دێت، وشەی (گەڕێن) لە فەرهەنگدا ئاوەڵناوە بۆ هەموو شتێك کە پێی بکرێت هاتووچۆ بکات. زمانەوانی کورد ئەو وشەیەی کردووە بە زاراوە، واتا گشتییەکەی تەنگەبەر کردووە و بۆ شتێکی تایبەتیی بەکاری هێناوە، هەرچەندە ئەو وشەیە وەك زاراوەیەك بەرانبەر بە (ئۆتومۆبیل) ڕێی نەکرد و وشە جیهانییەکە چەسپا، ئەمەیش ئەوە دەسەلمێنێت کە نەتوانرا بەتەواوی واتا گشتییەکەی وشەکە سنووردار بکرێت.

**سێیەم:**

گواستنەوەی وشەیەك لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی دی لەبەر جۆرە لێکچوون و پێوەندییەك، وەك وشەی (زمان) لە فەرهەنگدا واتای هۆی ئاخاوتن دەگەیێنێ و زاراوەسازی کورد بەرانبەر بە زاراوەی (اللغة)ی عەرەبی بەکاری هێناوە، چونکە لە نێوانی ئەم دوو واتایەدا پێوەندیی

هۆیی هەیە[1]، لێرەدا دەبێ ئەوە بزانین کە ئەگەر وشە لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی تر گوێزرایەوە دەکرێ بە زاراوە. ئایا واتا دێرینەکەی دەفەوتێ و لەیاد دەچێت، یاخود بە زیندوویەتی لەتەك زاراوەییەکەی وشەکە دەمێنێتەوە؟ زۆربەی زمانەوانەکان لەو باوەڕەدان کاتێ وشە بوو بە زاراوە، تەنیا واتا زاراوەییەکەی مەبەستە و پێویستە (واتا)ی پێشووی لە یاد بکرێت.

دانانی زاراوە و چەسپاندنی کارێکی گرنگە، کە گشت زمانەکانی جیهان پەیڕەوی دەکەن و زاراوەی کوردیش دەبێ دەستنیشانکراو و یەکگرتوو بێت و بۆ واتایەکی تایبەتی بەکاربێت، سەرئەنجام نابێ بۆ تاقە مەبەستێك و یەك واتا پتر لە یەك زاراوە بەکار بهێنرێت و سەر لە خوێنەر و گوێگری کوردی تێکبدرێ[1].

تایبەتمەندیی زاراوە لەمەڕ لقێك لە لقەکانی زانست و ڕۆشنبیری و هونەر و دانانی بۆ بابەتێك لە بابەتەکانی زانیاری پێویستییەکی پڕۆگرامیی دەخاتە سەر شانی زاراوەسازەکان، ئەم پڕۆگرامەش ئەوەیە کە دەبێ کتێب و نامیلکە و لیستەی زاراوە بە چەشنی بابەتەکانی زاراوە دابەش بکرێن و بە وردی ڕێك بخرێن و لەیەکتر جودا بکرێنەوە.

مەبەستمان لە زاراوە دانان و ئامادەکردنی، هەموو ئەو چالاکییانەیە، کە بە کۆکردنەوەی زاراوەکان و شیکردنەوەیان و ڕێکخستنیان و زانینی

---

[1] د.کامل بەصیر، پێناسینی زاراوە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، ل٢١٥.

[1] د.کامل بەصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٢٤.

هاوواتاکان و پێناسەکانی بە هەمان زمانی یان بەرانبەرەکەی بە زمانێکی تر پەیوەستە[٢]. هەروەها گشت چەمکەکانی بوارێکی دیاریکراو لە بوارەکانی زانیاریدا و لێکۆڵینەوەی پێوەندیی نێوان ئەو چەمکانە، قۆناغی ئامادەکردنی زاراوەیی پێوانەییش بە سێ قۆناغدا تێ دەپەڕێت:

١- لێکۆڵینەوەی سیستەمی زاراوە بەکارهاتووەکان کە ئێستا لە بوارێکی دیاریکراودا کاریان پێ دەکرێت، یان بە واتایەکی تر، لێکۆڵینەوەی بەکارهێنانی ڕاستەقینەی زاراوەکان لەو کێڵگەیەدا، کە ئەمەش پرۆسەیەکی پەسەندکردنە.

٢- پێشخستنی سیستەمی زاراوەکان، واتە چاککردنی بەکارهێنانی ڕاستەقینەی زاراوەکان، کە ئەمەش پرۆسەی پێوانەییە.

دانانی زاراوەی ورد و درشت بەرانبەر چەمکە زانستییەکان، بنەمایەکە لە بەرهەمهێنانی زاراوە پۆلێنکراوەکان و سیستەمە پۆلێنکراوەکان و فەرهەنگە واتاییەکانە.

٣- بڵاوکردنەوەی ئەو پێشنیازانەی تایبەتن بە زاراوەی یەکگرتووی پێوانەیی و گشتاندنی بەکارهێنیان.

پێش دانانی زاراوە و یەکخستنیان دوو مەرجی سەرەکی هەیە ئەویش ئەمانەن:

أ- پێویستە هەر چەمکێك یان شتێك، یەك زاراوەی سەربەخۆی بۆ دابنرێت.

---

[٢] د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ل٣٣.

ب- زیاتر لەیەك زاراوە بۆ چەمكێك یان شتێك دانەنرێت[*].

هەرچەندە هەڵبژاردن و داتاشینی زاراوە و دۆزینەوە و دارشتنیان ئەركی كۆڕی زانیارییە، بەڵام ئەوە واناگەیێنێت كە زانایان و ڕۆشنبیران لە ئاست خۆیانەوە نەتوانن هاوكاریی ئەم پرۆسەیە نەكەن، بەڵام لە دۆزینەوە و هەڵبژاردن و دانان و دارشتن و داتاشینی زاراوەدا پێویستە چەند ڕاستییەك هەیە لەبەر چاو بگیرێت، وەك:

- پێویست بەوە ناكات سڵ لە هەموو وشەیەكی بیانی بكەینەوە، چونكە هیچ زمانێك نییە، ئەمڕۆ لە چوارچێوەی قاڵبێكی تەسكی تەنها وشەگەلی خۆماڵیدا گەشە بكات و بەرەو پێشەوە بچێت.

- ئەو وشە بیانیانەی كەوتوونەتە نێو زمانی كوردی، جۆری دارشتن و شێوەیان گۆڕاوە و هیچ پێویست بە لابردنیان ناكات، مەگەر ئەو وشە و زاراوانە نەبن كە لەگەڵ زمانی كوردی ناگونجێن و وشەی زاراوەی كوردیی پەتیی بەرانبەریان هەیە یان لە ڕێگەیانەوە دەتوانرێت زاراوەی نوێ دابنرێت.

- زیندووكردنەوەی وشەی كۆنی كوردی و چەسپاندنیان و بڵاوكردنەوەی هەموو وشە و زاراوەیەكی ناوچەیی كوردی پەتی، كارێكی گرنگ و دیارە.

---

[*] بڕوانە:

أ- د. علی القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ل٦٨.

ب- محەمەد وەسمان، گیروگرفتەكانی زاراوەدانان لە زمانی كوردیدا، ل٥١.

- بایەخدان بە ڕێکخستنی زاراوەی بوارە جیاجیاکان و ڕێکخستنیان، بۆ نموونە زاراوە پزیشکییەکان، زاراوە یاساییەکان، زاراوە کارگێڕییەکان.

- ئەمڕۆکە وا خەریکە فەرهەنگنووسی کوردی جێگەی شایانی خۆی لە ژیانی ڕۆشنبیریی و زانستی گەلی کورددا دەگرێت و دەیان زانا لەم بوارەدا هەنگاویان ناوە، بەڵام پێویستیان بە بابەتی نوێ هەیە بە تایبەتی لایەنی تیۆری زاراوەسازی.

- بایەخدان بە نووسینەوەی فەرهەنگی پزیشکی لەبەرئەوەی ئەم بوارە پێویستی بە هەزاران زاراوەی نوێ هەیە[1]، دیارترین ئەزموونی کۆڕی زانیاری کورد ئەوەیە کە لە لاپەڕەکانی گۆڤاری کۆڕ چەندین زاراوەیان لەو بابەتەدا بڵاوکردۆتەوە[*].

زاراوەدانان یان هەڵبژاردنی وشە بە زاراوە بەلای (مەسعود محەمەد)ەوە، تەنیا پێویستی بە دوو شت هەیە:

١- بەدوادا گەڕان.

---

[1] محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی کوردیدا، ل٦٨-٦٩.

[*] بڕوانە:

أ- ئەنجومەنی کۆڕ، لیستی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕ، ل١٦٦-٢١٨.

ب- محەمەد وەسمان، بەرەو فەرهەنگی پزیشکی یەکخراو، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٨)، هەولێر، ٢٠٠١، ل١٨-١٩.

.............. کە باس لە (٥٠٠) زاراوەی پزیشکی کراوە.

٢- هەستکردن بە سازانی وشە بۆ زاراوە. هەرچی دروستکردنی زاراوەیە لە ڕێی تێکبەستنەوە وێڕای ئەو دوو مەرجە پێویستی بە زانینی دەستوورەکانی داڕشتن و تێکبەستن هەیە[1].

دانانی زاراوەش بەلای ئێمەوە بەسێ قۆناغی گرنگدا تێدەپەڕێ:

- قۆناغی دانانی زاراوەکان.
- قۆناغی یەکخستنیان.
- قۆناغی گشتاندن و بەکارهێنانیان.

قۆناغی یەکەم لە هەموویان گرنگترە و پتر بە زمانەوە بەستراوە، هاوکات قۆناغی سێیەم ئامانجێکی سەرەکیی ئەو کۆمەڵەیەیە، کە ئارەزووی لە وەرگرتنی زانستە، بۆیە لەبەر ڕۆشنایی ئەوانەی باس کران، بۆمان هەیە ئەو مەرج و بنەمایانە، لەم خاڵانەی خوارەوەدا بۆ دۆزینەوەی یان دانانی زاراوەی کوردی دیاری بکەین:

١- پێویستە گونجان یان هاوبەشی، یان لێکچوونێك لە نێوان واتای زمانیی و واتای زانستیی زاراوەکەدا هەبێت، مەرجیش نییە زاراوەکە هەموو واتا زانستییەکەی خۆی بگرێتەوە.

٢- دانانی یەك زاراوە بۆ یەك چەمکی زانستی هاونیۆەرۆك لە یەك بواردا.

٣- خۆپاراستن لە فرەواتایی یەك زاراوە لە بوارێکدا و پەسەندکردنی واژەی تایبەتمەندانە بەسەر واژەی هاوبەشدا.

---

[1] مسعود محمد، زاراوەسازی پێوانە، ل٢٩.

٤- له نێوان وشه هاوواتا کوردییەکاندا، ئەوەیان هەڵبژێرین پاش لێکۆڵینەوە و دەست بژێرکردنیان له لایەن لیژنەی تایبەت و پسپۆری زاراوەسازییەوە، وەك: مەڕ، پەز، ڕان... هتد، بۆ زاراوەی زانستیی بە پەسەند دەزانرێت.

٥- له هەڵبژاردنی زاراوەی زانستیدا، ئەو ڕێبازە جیهانیانە بگرینەبەر، کە ئێستا باون:

أ- زاراوە زانستییەکانی کوردی لەو زاراوانەی کە ئێستا بەشێوەیەکی جیهانیی بەکاردەهێنرێن نزیك بخەینەوە، تاکو بەراوردکردنیان بۆ ئەوانەی خەریکی کاری زانستی و لێکۆڵینەوەن، ئاسان بکەین.

ب- پشتبەستن بە پۆلینی دەبیی جیهانیی زاراوە، بە پێی بوار و لقەکانی.

پ- پێویستە واتاکان دابەش بکرێن و بە تەواویی ڕوون بکرێنەوە و سنووریان بۆ دابنرێت و پێناسە بکرێن ئەوسا زاراوەیان بۆ پێك بهێنرێت.

ت- دەبێ پسپۆرەکان و بەکارهێنەری زاراوەکان، هەردوولایان هاوبەشی لە دانانی زاراوەکاندا بکەن .

ج- درێژەپێدانی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە، بۆ ئاسانکردنی پێوەندیی نێوان زاراوەساز و بەکارهێنیان.

٦- بەکارهێنانی ڕێبازە زمانەوانییەکان لە دانانی زاراوەی زانستی نوێدا، پەسەندکردنی ئەم ڕیزبەندییە کە لە کەلەپوورەوە پەیدابببێت، پاشان شێوازەکانی پێکهێنان لە (لێکدان و دارِشتن و خواستن و داتاشین و وەرگێڕان و خۆماڵیکردن) کە لە زمانی کوردیدان .

٧- پەسەندکردنی وشە کوردییە ڕەسەنە باوەکان بەسەر ئەو وشانەی کە خۆماڵی دەکرێن.

٨- خۆپاراستن لە وشەی ڕەشۆکی، مەگەر لە نێو چەند شێوەیەکی زمانی کوردیدا هاوبەش بن، ئەوساش ئاماژە بۆ ڕەشۆکێتییەکەیان بکرێت و بخرێنە نێو دوو کەوانە.

٩- پەسەندکردنی شێوەی کورت و پاراو و ڕوون و خۆدوورخستنەوە لە وشەی نەگونجاو و نارێك.

١٠- پەسەندکردنی ئەو وشانەی بواری دارشتنیان تێدایە.

١١- وشەیەك کە واتایەکی وردی هەبێت، دەبێ لە وشەیەکی گشتی، یان وشەیەکی لێڵ پەسەندتر بکرێت، ئەوەش بخرێتە بەرچاو کە لە وەرگێڕاندا زاراوە کوردییەکە لەگەڵ واتا زانستییەکەی و زاراوە بێگانەکەدا یەککەوێت و گوێش نەدرێتە ئاخاوتنی ئەو زاراوە بێگانەیە کەچی دەگەیێنێت.

١٢- پەسەندکردنی وشەی باو بەسەر وشەی دەگمەن یان نامۆ و نائاشنادا، مەگەر واتای زاراوە زانستییەکە، لەگەڵ واتای باوی وشەکەدا پێکداچوون و تێکەڵییەکی پەیداکردبێ.

١٣- ئەگەر هەندێك وشەی وا هەبن، کە هاوواتا بن، یان واتاکانیان نزیك یەك بن، پێویستە باش ڕوون بکرێنەوە، هەر یەکێکیان بە شێوەیەکی ورد، کام جۆرە واتایەکی زانستی دەگەیێنێت. لە هەڵبژاردنی ئەم جۆرە زاراوانەدا وا چاکە لە پێشەوە هەموو ئەو بێژانەی واتاکانیان لە یەك

دەکەن یان نزیکی یەکن، پێکەوە کۆ بکرێنەوە، ئەوسا تێکڕا پێکەوە بەراورد بکرێن.

١٤- ئەو زاراوە و واتابەخشە زانستیانەی کە شارەزا و پسپۆرەکان بۆ کاروباری تایبەتی خۆیان دایانناون، وەرگێڕراوبن، یان خۆماڵی، شایانی پەیڕەوکردنن.

١٥- بە کوردیکردنی زاراوە لە کاتی پێویست و ناچاریدا بێت، بە تایبەتی ئەو زاراوانەی کە شێوگێکی جیهانییان هەیە، وەك ئەو وشانەی بنەچەیان یۆنانییە یان لاتینییە، یان ناوی ئەو زانایانەی کە وەك زاراوە بەکارهێنراون... هتد.

١٦- لە کاتی بە کوردیکردنی وشە بیانییەکاندا، چاودێریی ئەم خاڵانە بکرێت:

أ- ئەگەر وشە بەکوردیکردنەکە، لە زمانە بیانییەکاندا چەند دەربڕینێکی جیاوازی هەبوو، ڕەوانترینیان لەسەر زمان هەڵدەبژێرین.

ب- شێوە گۆڕینی وشەکە، تاکو لەگەڵ شێوە کوردییەکەدا گونجاو و هەموارکراو بێت.

پ- زاراوە کوردێنراوەکە، بە کوردی دابنرێت و پابەندی ڕێساکانی زمان بێت و بۆ لێوەرگرتن و داتاشین شیاوبێت، پێشگر و پاشگر بگرێتە خۆی و لەگەڵ شێوەی کوردێنراوەکەدا بگونجێت.

ت- ڕاستکردنەوەی ئەو وشە کوردییانەی زمانە بیانییەکان شێواندوویانن و بە بنەما پەتییەکەی خۆیان بەکار بهێنرێنەوە.

١٧- بوژاندنەوەی کەلەپوور و زیندووکردنەوەی وشەی کۆنی کوردی، بۆ سازکردنی زاراوە زانستییەکان، پێویستە وشەی کوردیی ڕەسەن بەکاربهێنرێت و بە پێی توانست لە شێوە زمانی خۆماڵی و وشەی بازاڕیی و ڕەشۆکی دوور بکەوینەوە.

١٨- بەشداریکردنی پسپۆر و بەکارهێن لە سازکردنی زاراوەدا، تا هەمیشە پێوەندی بەتین لە نێوان زاراوەساز و بەکارهێنانی زاراوەدا هەبێت و لێك دانەبڕێن.

١٩- پەسەندکردنی زاراوەی یەك وشەیی بەسەر دوانی و سیانیدا، چونکە لێوەرگرتن و کۆکردنەوە و خستنەسەری ئاسانترە.

٢٠- نابێ لە زاراوەسازیدا مەرجی زۆر قورس بەسەر دەقی زاراوەکەدا بسەپێندرێت، گرنگترین مەرج لە زاراوەی نوێباودا، ئەوەیە کە بتوانێت بڕوات و لە لایەن ئەوانەی قسەی پێدەکەن پەسەند بکرێت.

٢١- پێویستە هەوڵی سازکردنی دەستەیەك وەرگێڕی ئەکادیمی بدرێت، کە دەسەڵاتیان بەسەر زمانی کوردیدا بشکێت و بە پێی یاسا و دەستوورە زمانەوانییە کوردییەکان کار بکەن.

٢٢- ئامادە و سازکردنی فەرهەنگێکی یەکگرتووی فراوان، بۆ زاراوەکانی هەر بابەتێکی زانستی کار و پرۆژەیەکی گرنگە و پێویستە هزر و ئامانج و نەخشەی زانستی ئاشکرای هەبێ.

٢٣- بنیاتنانی (زاراوە) ناشێ لە لایەن ناشارەزای زمانی کوردی و ناپسپۆڕی بابەتەکەیەوە ئەنجام بدرێت.

٢٤- ئاسانی وسوکی وشه لەسەر زمان و گویٚ، بۆ چەسپاندن و بڵاوبوونەوەی زاراوەی نویٚ مەرجێکی پێویستە.

٢٥- لە نێو گەلە پێشکەوتووەکاندا، هەر پسپۆرێك، یان چەند پسپۆرێك هەر یەکە لە ئاستی خۆیەوە ئەو زاراوانە دادەنێت، کە لە بواری ئیشوکارەکەیاندا پێویستن و تاقە کەسێك مافی ئەوەی نییە زاراوە بۆ هەموو بوارەکانی زانیاری و زانست دابنیٚ. جا لێرەدا دەردەکەویٚ پسپۆڕێتی ڕۆڵێکی باڵا بۆ چەسپاندنی زاراوە، یان ناوی نویٚ دەبینیٚ.

٢٦- ئێمە کە بێین بمانەویٚ زاراوە بۆ هەموو ئامێر و ڕشتە و بەشەکانی دروستکراوێکی وەك (فڕۆکە) دابنێین پێویستە لە پێشەوە زانستی فڕین بە زمانی کوردی بخوێنین و بنووسین.

٢٧- پێویستە پسپۆرانی بەشی هەریەك لە زانستەکان و دروستکراوەکان لە نێو خۆیاندا، ئاگاداری کاری یەکترین، نەکا هەر دەستە ملی ڕێگەیەك بگریٚ کە لەئاکامدا زاراوەی بەراوەژوو و لێك جودا بۆ وردە ئامێری ئەوتۆ دابنێن، کە هەمان فەرمان جێبەجیٚ دەکات لە دوو دروستکراوی جودادا.

٢٨- زاراوەدانان بەر لە هەموو شتێك پێویستی بە زانستی فەرهەنگسازی هەیە، چونکە لەئاکامدا بایی فەرهەنگێك وشە ڕۆدەنێت، پێویستی بەو زانستە هەیە کە زاراوەی بۆ دادەنرێت و پێویستی بە زانستی زمان و دەنگسازی و هەموو لکەکانی دیکە هەیە، کە زمان باوەشیان پێدا دەکات.

٢٩- پێویسته ئەرکی زاراوەساز ئاسان بکرێت بەوەدا کە تەسکپێوی لەگەڵدا نەکرێت، وەك لەگەڵ بابایەکی وەرگێڕی چیرۆکدا دەکرێت، چونکە زاراوە واتایەکی بەرین لە مەودایەکی تەسکدا دەحەوێنێتەوە... هتد.(*)

---

(*) لە بارەی ئەم مەرجانەی باسکران بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

١- ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ٣٢٠-٣٢٦.

٢- ئیبراهیم ئەمین باڵدار، زاراوە و زمان لە کاروانی زانیاری ئەمڕۆدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٢)، ل٢٢٧-٢٢٩.

٣- د.علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ل١٠٧-١١٢.

٤- جەمال عەبدول:

ا - زاراوەسازی و زانستاندنی زمانی کوردی، گۆڤاری ئەکادیمی کوردی، ژمارە(٧)، ل١٧٥-١٧٨.

ب- بیردۆزی گشتیی زاراوەدانان و یەکخستن و تۆمارسازی...، گۆڤاری (وەشت)، ژمارە (١)، ل١٥-١٧.

پ- بەرکوڵێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی، ل٦٢-٦٧، ل٧٢-٧٦. ==

ت - چەند سەرنجێك دەربارەی نامیلکەی (زاراوەی کوردیی زانستەکان)ی کۆڕی زانیاری عێراق دەستەی کورد، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٢٣)، ل٩٣.

٥- محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی کوردی، ل٦٢-٦٤.

٦- د. کامل بەصیر، پێناسینی زاراوە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، ل٢١٨.

٧- عبدالرزاق بیمار، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، ل٢٨٩-٢٩٣.

٨- د.مولاي علي بوخاتم، مصطلحات النقد العربي...، ل٥٩-٦٢.

٩- كارم السيد غنيم، اللغة العربية والنهضة العلمية المنشودة، مجلة (عالم الفكر)، العدد الرابع، ل٦٩-٧١.

١٠- قاسم السارة، تعريب المصطلح العلمي...، مجلة (عالم الفكر)، العدد الرابع، ل١١٧-١١٨.

١١- شحادة الخوري، دراسات في الترجمة والمصطلح والتعريب، ل١٧٨.

١٢- ئەنجومەنی کۆڕ، لیستی پێنجەمی زاراوەکانی کۆڕ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (سێیەم)، بەشی (دووەم)، ل٥٢٨.

١٣- إبراهيم أمين باڵدار، مشاكل الكتب الدراسية الكردية، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق (دەستەی کورد)، بەرگی (چواردەیەم) (القسم العربی)، بەغدا، ١٩٨٦، ل٢٣٥-٢٣٦.

١٤- غازی فاتح وەیس، کتێبی زاراوەی کوردی و چەند تێبینییەك، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٤)، ل٩-١٠.

١٥- عەبدولڕەحمان عوسمان، زاراوەزانی و زاراوەی زانستی کوردی، گۆڤاری (بانە ڕۆژ)، ژمارە (٢١)، ل٦٣. ===

١٦- مسعود محمد، زاراوەسازی پێوانە، ل: ٦، ٧، ٨، ١٩، ٢٠، ٥٦، ٥٧، ٥٨.

١٧- د. إيناس كمال الحديدي، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث ، ل٩٧-٩٩.

١٨- تۆفیق وەهبی، حول مقال مسؤولية الاديب الكبرى للأستاذ عبدالمجيد لطفي، گۆڤاری (پەروەردە وزانست)، ژمارە (٥)، ساڵی (٣)، بەغدا، ١٩٧٣، ل٩٠.

١٩- د.نەسرین محەمەد فەخری، ڕێبازی بەکوردیکردنی زاراوە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٤)، بەغدا، ئابی١٩٨٧، ل١٢٣-١٣٥.

پاش ئەمە، لە میانی پیشاندانی لایەنەکانی شیکردنەوەی زاراوە و مەرجی دارشتن و گرنگیی لێکۆڵینەوەی زمان بۆ زاراوە و ڕێگای دانان و ڕێبازی شیکردنەوە، ڕوون بووەوە ئەگەر زۆرینەی لێکۆڵینەوەکانی زاراوەسازیی، هێما بۆ گرنگێتی زاراوەسازیی و گیروگرفتی دارشتنی و دەرکەوتن و پەرەسەندنی لە بوارەکانی تەکنیکی و ئەندازیاریی و فیزیایی و زیندەوەرناسی و هی دیکەش بکات، دامودەزگا پەیوەندیدارەکانی کاری زاراوەسازی هەستیان بە گرنگێتی زاراوەسازی لەبوارەکانی زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتی و زمانەوانییەکاندا کردووە[1]، ئەو بارەی جەخت لە سەر نرخی ڕەهەندی زمان بۆ لێکۆڵینەوەی زاراوەسازیی دەکات و بەتایبەتی لە بۆنە نێودەوڵەتییەکانی ڕوون بۆتەوە و زانراوە — کە گفتوگۆ لە سەر دانانی زاراوە دەکرێت - یەکخستنی پێوانەیی زمان پێویستە پێش یەکخستنی پێوانەیی تەکنیکی بکەوێت، ئەمە لەیەکەم کۆنگرەی لووتکەی ساڵی ١٩٢٤ کە لە لەندەن بەسترا، (کنیلی) ئاماژەی بۆ کرد، لەو ساتەدا بڕیاریدا کە گیروگرفتە زمانییەکان کۆسپی سەرەکین بەرانبەر یەکخستنی پێوانەیی جیهانیی زاراوە، پاشان ڕۆڵی زمانەوان لە بارەی زاراوەوە لە لایەنی زمان، بەڵکو زاراوە لە گشت لایەنەکانی زانستیدا نیشاندا، ئەوان هاوبەشن لەگەڵ پسپۆرانی هەر لقێکی زانیاری بۆ هەستان بە بەرپرسیارێتی دانانی زاراوەکانی ئەو لقە، بەڵام بەرپرسیارێتی

---

[1] د. إيناس كمال الحديدي، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث، ل١٠.

زمانەوانە یەکەمینییەکان بریتییە لە بایەخدان بە باسی زاراوەی زمانەوانی[1].

## مەرجەکانی زاراوەساز

لەبەر دواکەوتنی ژیاری و فیکریی، کە گەلەکەمان پێیدا تێپەڕیوە، زانایان و خەمخۆرانی زمانی کوردی هەستیان بەوە کردووە کە کەمتەرخەمیی زمانەکەمان بەرانبەر داواکارییەکانی سەردەم و کەمتەرخەمیی گوزارشتکردنی بۆ دۆزینەوەی چەمکە زانستییەکان و تەکنیکییە ژیارییەکان وایانکرد خەمخۆرانی نەتەوەکەمان قۆڵیان لە هۆشیارکردنەوەی گەل و بەرزکردنەوەی زمانی نەتەوەکەمان و داهێنانی زاراوەی کوردی، کە شتە تازەکانی ژیان دەربڕن، هەڵماڵی. تا ئێستاش ئەرکێکی زۆریان کێشا و دەکێشن لە پێناوی چەسپاندنی زمانەکەمان و دابینکردنی ئەو شتانەی، کە پێویستن، بۆ ئەوەی قاڵبی زاراوەی بیانی خۆی بەسەردا نەسەپێنێ و نەبێتە هۆی لاوازیی و سەرنەکەوتنی، لەبەر ئەم هۆکارانە، دامودەزگای زانستی و ڕۆشنبیری و کۆڕی زانیاری درووستکران، ئەرکی هەرە گرنگیان دانانی زاراوەی زانستی بوو، کە زمانی کوردی بە دەستییەوە دەینالاند.

---

(1) د.عبدالقادر الفاسي الفهري، المصطلح اللساني، مجلة (اللسان العربي)، العدد (الثالث والعشرون)، المنظمة العربية للتربية والثقافة والعلوم (مكتب التنسيق والتعريب)، جامعة الدول العربية، ١٩٨٤، ل١٣٩.

ئەندامانی ئەم کۆڕ و دامودەزگایانە بۆ زاڵبوون بەسەر زۆرینەیی و دوای پشتبەستن بە سروشتی زمانی کوردی و ئەو تایبەتمەندییانەی کە هەیەتی، بەرانبەر کۆمەڵێك گیروگرفتی بووبوونەوە. هەروەها دووچاری گیروگرفتێکی تریش بوون، کە دەبێتە کۆسپ لەبەردەم جێبەجێکردنی پرۆسەی زاراوەدانان بە ئاسانی، وەك وەرگرتن لە زمانێك کە سەر بە بنەماڵەی زمانەکەت نەبێت، ئەمەش خۆی لە خۆیدا گرفتە، چونکە هەر زمانێك و بنەماڵەی زمانێك خاوەنی تایبەتمەندیی خۆیەتی، کە لە زمانەکانی تری جیا دەکاتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ وەرگرتن لە نێوان دوو زمان، کە لەیەکترییەوە دوور بن (واتا لەیەك بنەماڵەی زمان نەبن) زۆر لە وەرگرتنی نێوان دوو زمانی سەر بەیەك بنەماڵەی زمان گرانترە.

دانانی زاراوە و دەستنیشانکردنی واتاکەی، کارێکی ئاسان نییە، گشت کەسێك دەتوانێ بیکات، ڕاستە ئەندامانی کۆمەڵ و خەڵکی گوند و دەشت و شار و جووتیار و گاوان و سەپان و مامۆستا و زانا و ئەندازیاران و.... سەرچاوەی سەرەکی ئەو زاراوانەن، کە دادەنرێن، بەڵام لە هەندێ بواردا مرۆڤی سادە و ساکار ناتوانێ زاراوە بە ئاسانی بۆ ئەو بوارە دابنێت، بۆ نموونە سەپان و شوان و گاوانێکی داماو و سادە و ساکار چۆن دەتوانن زاراوە بۆ بواری پزیشکی و زانستی گەردیلە و ئەندازیاری و دەروونناسی و فەلسەفە و ژیربێژی(لۆجیك) و... دابنێن. ئەم بوارانە پێویستیان بە پسپۆری خۆیان هەیە و دەبێت کۆمەڵێك مەرجی سەرەکی لەو کەسانەدا هەبن، بۆیە ئەوەی دەیەوێت کاری زاراوەدانان بکات دەبێت ڕۆشنبیرییەکی بەرزی هەبێت و خاوەنی زانستێکی چاك بێت و پسپۆڕێتی لە یەکێك لە

لقەكانی زانیاری و ئاگاداری ورد و درشتی ئەو زانیارییە بێت و شارەزاییەكی تەواوی لەبارەی زمانەكەی خۆیەوە هەبێت[1] ، زاراوەدانانیش بە تایبەتی زاراوەی زانستی بە هەموو كەسێك دانانرێت، چونكە پیشەی زانایان و توێژەرانە، گومانیش لەوەدا نییە هەندێ لە زاراوەكان خەڵكی گوند و لادێ و شار و مرۆڤی سادە و ساكار دایاننناون و زۆر لەبار و گونجاون، چونكە بە شێوەیەكی هەڕەمەكیی و بێ دەستوور دایان دەنێن، دەتوانین بڵێین لەهەموو ڕووییەكەوە زاراوەكانیان گونجاو و پاراو دەبن.

پێویستە بۆ كاری زاراوەدانان هەندێ بنەما هەبن بۆ ئەوەی بتوانرێ ئەو زاراوەیە بەئاسانی و سانایی بڵاوبێتەوە و خەڵكی وەریبگرێت، لەوانە: ڕاهێنان، توێژینەوەی زانستی سەرەكی و پراكتیكی تایبەتی، تۆمارسازی زانیارییەكان، بینینی چالاكییەكانی زاراوەسازی لە وڵاتە پێشكەوتووەكانی تر و هاوبەشیكردن لەگەڵیاندا[1] ، بۆیە لێرەدا دەتوانین ئەو مەرجە سەرەكییانەی، كە دەبێت لە زاراوەسازدا هەبن، لەم خاڵانەی خوارەوەدا دیاری بكەین:

١- زاراوەساز پێویستە لە زانستێك یان هونەرێك تایبەتمەندبێت و لە ڕووی تیۆری و كردارییەوە شارەزای بوارەكەی بێت، واتە ئەوەی زاراوەی

---

[1] د.إبراهيم كايد محمود، المصطلح ومشكلات تحقيقه، مجلة (التراث العربي)، العدد (٩٧)، ل٢١.

[1] إنترنيت: د.علي توفيق الحمد، في المصطلح العربي (قراءة في شروطه وتوحيده).

پزیشکی دادەنێت، پێش هەموو شتێك دەبێت پزیشك بێت و لەو بوارەدا بە ئەزموون و زانابێت.

٢- شارەزاییەکی چاکی لە زمانی کوردیدا هەبێت، بە تایبەتی لە لایەنی پەیوەندییەوە بەو زانستە یان هونەرەوە.

٣- بەلای کەمەوە زمانێکی ئەورووپی، چاك بزانێت.

٤- شارەزا و ئاگاداری کولتووربێت بە لایەنی کەمەوە لە بوارە تایبەتمەندییەکەی خۆیدا.

٥- لەچوارچێوەی کۆڕێکی زمان، یان زانکۆ، یان دەزگایەکی پسپۆڕدا کار بکات(*).

٦- زاراوەساز دەبێ تا ئاستێك شارەزایی لەبارەی هەموو زار و شێوەزارەکانی زمانی کوردی و بابەتی فۆلکلۆر و پەندی پێشینان و چەند بوارێکی دیکەش هەبێ.

٧- دەبێ زاراوەساز شارەزایی لە زانستی زمان هەبێ و سروشتی مۆرفیمەکانی زمان بناسێت و ئەو دەستوور و یاسایانەش بزانێت، کە بە هۆیانەوە مۆرفیمەکانی پێ لێکدەدرێت بۆ درووستکردنی وشە، جگە لە

---

(*) زۆر لە مامۆستایانی خۆشمان لە کۆڕی زانیاری بەغدا و کۆڕی زانیاری کوردستان لە هەولێر کاریان کردووە و دەیکەن، بەلاّم دەتوانین بلێین تا ڕادەیەك تەنیا (مەسعود محەممەد) هەموو مەرجەکانی تێدان، کە بە زاراوەسازی کورد لەقەلّەم بدرێت و کتێبی (زاراوەسازی پێوانە) و بەرهەمەکانی تری گەواهی ئەوەی بۆ دەدەن.

دەستوور و ڕێزمانی کوردی، پێویستە بە ئەندازەیەکی باش شارەزای دەستوور و ڕێزمانی چەند زمانێکی دیکەش بێت.

٨- پێویستە زاراوەساز ڕووناکبیرییەکی کارامەی دوور لە دەماگیریی و بیروباوەڕی خۆسەپاندنی هەبێت و بەرژەوەندی زمانی کوردیی بخاتە پێش بەرژەوەندی کەسی و ناوچەیی .

٩- زاراوەساز لەکاتی دانانی زاراوەدا، نابێ زاراوەی ناوچەیی و شێوەزاری خۆی بەسەر زاراوەی ئەدەبیدا، بسەپێنێت، واتە لە کاتێکدا زاراوەی (دوانە) هەبێت، نابێ زاراوەی (جوامڕانە) بەکار بهێنێت.

١٠- نابێت زاراوەساز مەرجی قورسی وەڕسکەر بەسەر دەقی زاراوەدا بسەپێنێ و پێوانەی وەها تەسکی تێدا بەکاربهێنێ بۆ خەڵکی نامۆبێت .

١١- زاراوەساز ئاگاداربێ ڕواڵەتی وشە فێڵی لێنەکات، وەك ئەوەی کە (ار)ی ئەبستراکت لەگەڵ (ار)ی بنەڕەتی و (ار)ی وشەکانی (بنار، دیوار، بێوار، هەوار.....) بەیەك شت نەزانێت لە (هەنار، مار، دیوار...) و هاوڕێکانیدا، (ار) بۆ لای زەوی دەچێتەوە[*] .

---

[*] بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی ئەم مەرجانەوە، بڕوانە:

أ- محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی کوردیدا، ل٢٣.

ب- ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی ، ل٣٢٧.

پ- د.کامل بەصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٤٣-٤٤.

ت- مسعود محمد، زاراوەسازی پێوانە، ل٦، ٧، ٨، ١٨، ٢٢.

ج- جەمال عەبدول، بەرکوڵێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی، ل١١.

ح - د.کارم السید غنیم، اللغة العربیة والنهضة العلمیة المنشودة في عالمنا الاسلامي، مجلة (عالم الفکر)، العدد الرابع، ل٦٨.

...هەروەها چەندین مەرجی تریش، کە دەبێت لە زاراوەسازدا هەبن.

پاش دیاریکردنی ئەو مەرجانە بۆئەوەی بەرهەمەکان زانستی و ڕێکوپێك بن، پێویستە زاراوەسازەکان بە پێی ئەم بنەمایانە کار بکەن:

١- ئیشکردن بە کۆمەڵ و ڕێکخستنی کارەکان بەهۆی لیژنەوە.

٢- بڵاوکردنەوەی ئاکامەکانی ئیشی لیژنەکە بەسەر خەڵکیدا، بۆ ئەوەی ڕای خۆیان دەربارەی بڕیارەکانی لیژنەکە دەربخەن و سوود لە بۆچوونی ڕاستی هەمووان وەرگرن.

٣- زاراوەی نوێباو، بۆ گەشە و پەرەسەندن و بڵاوبوونەوە و چەسپاندن، کات و ماوە و بەکارهێنانی دەوێت، بە تایبەتی ئەگەر هاتوو لەبەر ڕۆشنایی ڕێبازێکی زانستییانە سازکرابوو.

٤- دانانی بەرنامەیەکی ڕێکخراوی فراوانی نەخشە بۆکێشراو بۆ پێکهێنانی فەرهەنگێکی فراوانی پوختی (کوردی بۆ کوردی) لەگەڵ فەرهەنگێکی (عەرەبی– کوردی و کوردی –عەرەبی) و هەروەها (کوردی – ئینگلیزی) و (ئینگلیزی – کوردی) و (کوردی – فارسی) و (فارسی – کوردی) و زمانەکانی تریش، کە زۆر پێویستە.

٥- فراوانکردنی لیژنەکانی زاراوەدانان و شارەزایانی بابەتەکانی زانستی و زانیارییان تێدا زۆر بکرێن.

٦- دانانی بەرنامە و نەخشەیەك و ڕێبازێکی زانستییانە، بۆ ئیشوکاری ئەو لیژنانە.

---

خ– د.نەسرین محەمەد فەخری، بەکوردیکردنی زاراوە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٤)، ل١٢٣–١٣٥.

٧- زاراوەی هەر بابەتێك کە ساز دەکرێت، پێویستە زۆربەی ئەندامانی لیژنەکەی لە شارەزایانی ئەو بابەتە بن، واتا لەو بوارەدا پسپۆڕبن .

٨- دانان و وەرگێڕان و پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندن و سەرپەرشتیکردنی چاپی کتێبەکانی قۆناغەکانی خوێندن هەمیشە بەو شارەزا زمانزانە لێهاتووانە بسپێردرێت کە مامۆستای ئەو بابەتانە بوون.

٩- پێویستە لە دانان و وەرگێڕانی کتێبەکانی قۆناغی سەرەتاییدا شارەزایەکی پەروەردەییان لەگەڵدا بێت.

١٠- پێویستە کۆمەڵێك لیژنەی پێداچوونەوە دابنرێن، کە سەر لەنوێ بە کتێبەکانی سەرجەم قۆناغەکانی خوێندنی فێرگە و قوتابخانەکاندا بچنەوە و شێواوی زانیاری و زاراوەکان لابرێن و شێوازی نووسینەکانیان بەسەر بارێکی ڕاستدا ببرێت، کە لەگەڵ پێویستی خوێندکارەکاندا بگونجێت[*].

---

[*] لەو بارەیەوە بڕوانە:

أ- د.کامل بەصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٤٤- ٤٥.

ب- جەمال عەبدول، بەرکولێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی، ل١١- ١٢.

پ- ئیبراهیم ئەمین باڵدار، زاراوە و زمان لە کاروانی زانیاریی ئەمڕۆدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٢)، ل٢٢٩-٢٣٠.

## بنەماكانی دانانی زاراوەی كوردی و پێكهاتەكانی

زاراوە لە زمانی كوردیدا، تا ئێستا بە كارێكی لاواز لە قەڵەم دەدرێت، ئەمەش بۆ كۆمەڵێك هۆ دەگەڕێتەوە: نەبوونی دەوڵەت و ژێر دەستەیی و هەولّی تاكە كەس و دواكەوتنی كۆمەڵ و باری ڕۆشنبیریی و... هتد. بەش بەحاڵی زاراوەی كوردیی، تا بڵێی بە ڕچە و ڕێگایەكی ناهەمواری پێشكەوتندا تێپەڕیوە و هەمیشە لە كێشە و بەرەدابووە.[1] زاراوە نەك لە زمانی كوردی، بەڵكو لە گشت زمانەكاندا هەبووە، بەڵام كاری نووسراو لە زمانێكەوە بۆ زمانێكی تر دەگۆڕێت و جیاوازە، گەر زمانێكی وەك عەرەبی لەمەڕ زاراوەوە خۆی بە دواكەوتوو بزانێت، دەبێ ئێمەی كورد چی بڵێین كە تا ئێستا قەوارەیەكی سەربەخۆ و سیاسی خۆمان نییە و هەروەها كۆمەڵێك هۆكاری دیكەش هەن كە پاشتر لێیان دەدوێین.

بێگومان دەوڵەمەندكردنی فەرهەنگی هەر زمانێك لە ڕێگەی چەندین ڕێگاوە دەبێت، گرنگترینیان ئەمانەن: (داڕشتن و لێكدان و داتاشین و وەرگرتن و وەرگێڕان و... هتد). بۆیە لەم ڕێیانەوە دەتوانین زمانەكەمان بە زاراوەی جۆربەجۆر دەوڵەمەند و پاراو بكەین. مێژووی

---

[1] لیستەی چوارەمی زاراوەكانی كۆڕ، گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەكەم ،ل٤٩٧.

زاراوە لە زمانی کوردیدا بێ پچڕان نەبووە و پەیوەستە بە پێشکەوتنی زمانی کوردییەوە. لەگەڵ ئەوەشدا چ زۆر یان کەم هەوڵدراوە، بەڵام ئەو هەوڵانە گشتیان بە پێی بارودۆخ گۆڕاون و کاریان تێکراوە چ لە لایەن هێزی دەرەکییەوە بووبێت یان بەهۆی کەمتەرخەمی خۆمان بووبێت، بۆیە شاعیرێکی مەزنی وەك (ئەحمەدی خانی) لە ساڵی ١٦٨٢ / ١٦٨٣ لە ژێر ناوی (نەوبەهار)دا، فەرهەنگۆکێکی بە شیعر بۆ یارمەتی منداڵانی کورد بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی نووسیوە[1] چەندان هەوڵی تریش دراوە لێرەدا ناتوانین باسی هەموویان بکەین و بۆ جێگەیەکی تری نامەکەمان هەڵیان دەگرین.

ئەوەی بڕوانێتە باری زاراوەدانان و زاراوەسازیی کوردیی، دەگاتە چەند ڕاستییەکی تاڵ (دواکەوتنی زانستی و تەکنیکی) و پچڕپچڕیی نەتەوەی کورد و لێکدابڕانی سیاسیی و ئیداریی و نەبوونی دەوڵەتێکی کورد، وەك لە پێشەوە باسکراوە، بۆیە زمانی کوردی لە کۆندا بێگومان بەرانبەر بە دانانی زاراوە وەك ئەمڕۆ نییە، چونکە زمانی کوردی لە ئێستادا بە قۆناغێکی مەزنی گەشەسەندن و پەرەپێدان و خزمەتکردندا دەڕوات، ئەم پێشکەوتنەش وای هەڵگرتووە کە بایەخ بە بنەماکانی دانانی زاراوەی زمانی کوردیی زیاتر بدرێت و لە پێکهاتەکانی بکۆڵدرێتەوە و خۆشبەختانە بووەتە زمانی پەروەردە و فێربوون و زمانی کارگێڕیی و ڕامیاری و زمانی دادگە و یاسادانان.

---

[1] لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم ، ل٤٩٨.

لەم ساڵانەی ڕابردوودا زمانی کوردی بەهۆی هەزاران زاراوەی نوێباو، لە بوارە جیاجیاکانی زانست و تەکنەلۆژیا و جیهانی بیردا دەوڵەمەند بووە، بۆیە دەبێت هەوڵی زیاتر بۆ پەرەسەندن و پێشخستنی زمانی کوردی بدرێت، بۆ ئەوەی بەرانبەر ئەو لێشاوە زاراوە نوێباوانە خۆی بگرێت، کە دەکەونە بەردەست و لە ئەزموونگە و کارگەی کیمیایی و فیزیایی و پیشەسازی و ئاسمانگەریی دێنە ئاراوە، هەندێ ئامار دەڵێن لە وڵاتێکی پێشکەوتوودا زانایان ڕۆژانە نزیکەی (١٥ — ٥٠)[1] زاراوەی نوێ دادەنێن. ئایا چۆن لەتەك ئەم بزاڤە سەرتاسەرییە هەوڵی خۆمان هەبێت؟ بۆیە دەبێت لە ڕێگای ئەو بنەما و ڕێبازانەی کە پاشان لێیان دەدوێین خزمەتی زمانی کوردیی بکرێت و بتوانرێت زاراوەی زانستی بۆ گشت بوارەکان دابنرێت، تا ئەو ڕۆژەی دەگەینە ئەو ئاستەی خوێنەر، یان مامۆستای وانەبێژ، دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەیەك لە زمانێکی بیانییەوە دەخوێنێتەوە، بۆ بەیانی بتوانێت بە زمانی کوردیی و بە ڕەوانیی بیلێتەوە. زمانی کوردیی وەك هەموو زمانە زیندووەکانی تری جیهان، دەیان وشەی بیانیی جیهانیی لەخۆ گرتووە، بە تایبەتی ئەوانەی لە بنچینەدا یۆنانی و لاتینین، وەك (تەلەفۆن، تەلیسکۆپ، مایکرۆفۆن، میکریسکۆپ، ڤۆڵت، ئۆم، وات، ڕادار، لیزەر، ناپاڵم، یونسکۆ،... هتد) بێ سڵەمینەوە بەو بێژەی بیانییەوە وەرگیراون و زۆر ئاساییە و زمانی کوردی پێ دەوڵەمەندبووە، وەك دەیان زاراوەی دیکەی وەك: زەکات، حەج...

---

[1] محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی دانانی زاراوە لە زمانی کوردیدا، ل٧–٨.

وەك دەزانین زمان وەك بوونەوەرێك كاتێ لە دایك دەبێت گەشە و گۆڕان لە گەڵی لە دایك دەبێت و ئەو گۆڕانەش بە پێی پەرەسەندن و پێشكەوتنی باری ڕۆشنبیریی و زانستی و فیكری و كۆمەڵایەتی... هتد، كاریگەری دەكاتە سەر زمان، زمانیش وەك دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی، هۆیەكە بۆ لەیەكتر گەیشتن و بەڕێوەبردنی كاروباری ڕۆژانە و زمانیش كاتێك لە گۆڕان دەكەوێت، كە بوونی نەمینێ، بۆیە گۆڕان لەگەڵ زماندا بە شێوەیەكی هاوتەریبی دەڕوات و بەردەوام گۆڕانی بەسەردا دێت و پێویستی بە زاراوەی نوێ دەبێت و هەر كەسێك زمانی كوردی بزانێت بێ ئەوەی ئەركێكی ئەوتۆ بكێشێ، دەتوانێت چەندین وشەی نوێی وەها، كە لەم سەردەمەی ئێمەدا پەیدابوون ناوبێنێت، لەم قۆناغەدا كە ژیانی ڕووناكبیری و زانستی و كۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی... هتد، میللەتی كوردیی لە برەودایە و تێكڕای جیهان لە پێشكەوتندایە[1] بۆیە زمان هەردەم پێویستی بە وشەی نوێ دەبێت، چونكە ڕۆژ بە ڕۆژ شتی نوێ و داهێنانی نوێ پەیدا دەبێت، زۆربەی زمانەكانی جیهان بە پێی ئەو تایبەتمەندییەی هەیانە چەندان ڕێگا بۆ دەوڵەمەندكردنیان دەگیرێتەبەر، ئەم ڕێگایانەش لە زۆربەی زمانەكاندا تا ئاستێك هەمان شتن، بەڵام هەموو زمانێك ناتوانێت گشت ڕێگاكان یان ڕێبازەكان وەك یەك بەكار بێنێت. ڕێگایەكی وەك (داڕشتن) بۆ زمانی عەرەبی لەوانەیە زۆر گونجاوتر

---

[1] د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، زمانی كوردی و خەوشی هەندێ وشە و زاراوەی كوردی، ل٤.

بێت، وەك لە زمانێکی تر، هەروەها ڕێگایەکی وەك (وەرگرتن و لێکدان) بۆ زمانی کوردیی لەوانەیە زۆر لە بارتربێت وەك لە زمانێکی تر.

لەم ڕوانگەیەوە و بۆ زانیاری لە بارەی ئەو ڕێبازانەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ – یان بڵێین بە شێوەیەکی سەرەکی و ناسەرەکی فەرهەنگی زمانی کوردیی دەوڵەمەند دەکەن، باس لەم ڕێگایانەی خوارەوە دەکەین:

## یەکەم: ڕێگای دارشتن – الاشتقاق – Derivation

دارشتن یەکێکە لە گرنگترین ڕێگاکانی درووستکردنی زاراوە لە زمانی کوردیدا. وشەی (دارشتن) وەرگێڕانێکی وشەی (صیاغة)ی عەرەبییە. وەك بە زمانی کوردی دەوترێت، زمانێکی لێکدراوییە، لەبەرئەوەی وشەکانی بۆ دەربڕینی واتای نوێ بە زۆری لە شێوەی لێکداندا پێك دێن و پەرەدەسێنن، زمانی عەرەبیش پێی دەوترێت زمانێکی دارێژراوییە، واتە (ئیشتیقاقییە) چونکە زۆربەی وشەکانی بۆ دەربڕینی واتای نوێی بە ڕێبازی دارشتن، واتە لێوەرگرتن پێکدێن.[1]

دارشتن ڕێگایەکە لە وشە و کەرەسەیەکی سەربەخۆی زمانی کوردییەوە، بە یارمەتی پێشگر و پاشگر یان هەردووکیان پێکەوە دادەڕێژرێت و زاراوەی لێ پێك دێت و زمانەکەمان دەوڵەمەند دەکات و ئەو

---

[1] ئیبراهیم ئەمین باڵدار ، زاراوە و زمان لە کاروانی زانیاری ئەمڕۆدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٢)،ل٢١٨.

وشە سادانە پێناسە دەکات، کە بە هۆی زیادییەکەوە سازکراون(*) (زیادییەکەش پێشگر یان پاشگر یان هەردووکیان) پێکەوەن، وەکو وشەی

(*) هەروەها لە بارەی پێناسەی (داڕشتن)ەوە، بڕوانە:

أ- د. کامل بصیر، بەراوردیەك لە نێوانی زمانی کوردی و زمانی عەرەبیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سیازدەهەم، ل٢٢. ===

ب - د. کامل بصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٧٠-٧١.

پ - محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوە دانان لە زمانی کوردیدا، ل٥٩.

ت - عبدالرزاق بیمار، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، ل٢٩٤.

ج - ئیبراهیم ئەمین باڵدار، زاراوە و زمان لە کاروانی زانیاری ئەمڕۆدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٢)، ل٢١٨.

چ - د.ڕەفیق محەمەد شوانی، چەند بابەتێکی زمان و ڕێزمانی کوردی، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠١، ل٥٠.

ح - جەمال عەبدول، بەرکوڵێکی زانستە زاراوەسازی کوردی، ل١٩.

خ - د.کەمال میراودەلی، فەرهەنگی ڕێزمانی کوردی، چاپی یەکەم، لەبڵاوکراوەکانی مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٣١.

د - david crystal , dictionary of linguistics and phonetic , London – Britain,١٩٨٠ ,p١٠٦.

ر - د. محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري، ل٧٠.

ز - د. ايناس كمال الحديدى، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم المصطلح، ل٩١.

(ڕاکردن) کە لە پێشگری (ڕا) و چاوگی (کردن) داڕێژراوە، وشەی (مسگەر) کە لە وشەی (مس) و پاشگری (گەر) داڕێژراوە...

لەبەر ئەو ڕۆڵە گەورەیەی دارشتن لە پێکهێنانی وشەی نوێدا دەیگێڕێت، زانایان و زمانەوانانی کورد بایەخێکی زۆریان پێداوە و ئەو وشە و زاراوانەی بەم ڕێگایە درووست بوون زۆر بە ئاسانی و بە ڕەوانی خەڵکی بەکاریان دێنن و سوودیان لێ دەبینن. لەبەر زۆری ئەو پێشگر و پاشگرانەی لە پێکهێنانی وشە و زاراوەی کوردی بەشداری دەکەن، چەند نموونەیەك دێنینەوە بۆ باسەکەمان، وەك: چەپگار، دواگر، جلگرە، ڕەنگدار، زاراوەساز، تەلبەند، زمانەوان، زانستگا، ئەندازگە، خڕیلە، نەوتەلان، لووتەوانە، بنکە، پۆشا، گەڕۆك، فڕفڕۆکە، فڕە، لوولە، تێداچوون... هتد.(*)

---

س – د. ابراهيم انيس، من اسرار اللغة، الطبعة الخامسة، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٧٥ ، ل٦٢.

ش – شحادة الخوري، دراسات في الترجمة والمصطلح والتعريب، ل٤١.

(*) بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ڕێبازی دارشتن و دیاریکردنی سەرجەم ئەو پێشگر و پاشگرانەوە، بڕوانە ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:

أ– د.ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٧، ل٤٩–٨٣.

ب– جەمال عەبدول، بەرکولێکی زانستە زاراوەسازی کوردی، ل١٩–٤٠.

پ– ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل٣٣–١٢٥.

## دووەم: ڕێبازی لێكدان - التركيب - Componding

ڕێگای لێكدان ڕێگایەكی دیكەیە بۆ بنەما و پێكهاتەكانی زاراوەی كوردیی، كە بە ڕێگایەك و ڕێبازێكی سەرەكی دەوڵەمەندكردنی فەرهەنگی زمانی كوردی دەژمێردرێت و پێكهێنانی زاراوەی كوردی بە ڕێبازی لێكدان، لە زمانی كوردی و هەموو ئەو زمانانەی تردا كە لە خێزانی هیند و ئەورووپین كارێكی ئاسایی و سروشتییە. كورد زمان هەر لە سەرەتاوە بە شێوازی لێكدان بە تێك بەستنی دوو وشەی واتادار یان زیاتر، وشەی تری نوێی، كە واتایەكی جیاوازی سەربەخۆی هەبێت پێكهێناوە وەك جووتكردنی وشەی (دوو) لەگەڵ هەندێك وشەی تردا[1]، وەك:

دوودوو، دووقەد، دوودڵ، دووڕوو، دووڕەگ... هتد.

---

ت- بەناز ڕەفیق تۆفیق، ڕێگە بنەڕەتییەكانی دەوڵەمەندكردنی فەرهەنگی زمانی كوردی لە دیالێكتی خواروودا، نامەی ماستەر، كولێژی پەروەردە – ئیبن ڕوشد، زانكۆی بەغدا، بەغدا، ٢٠٠٨، ل٣٩-٥٦. ==

ج- د.كامل بەصیر، زاراوەی كوردی هەڵسەنگاندن و لێكۆڵینەوە، ل٧١-٨٧.

چ- د.ڕەفیق محمد شوانی، ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن، چاپخانەی (خانی)، دهۆك، ٢٠٠٨، ل٧٣ – ١٣٥.

[1] ئیبراهیم ئەمین باڵدار، زاراوە و زمان لە كاروانی زانیاری ئەمڕۆدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٢)، ل٢١٨.

له بارەی زاراوەی لێکدراو و داتاشراو و دارێژراو، هەرسێکیان له بناغەدا یەکن و له بەر یەك تیشکێ بنەواشەدا ساز دەکرێن، ئەگەر جیاوازییەك له نێوانیاندا بەدی بکرێت، ئەو جیاوازییه به کاتی لەدایکبوون و دانانی زاراوەکەوە بەستراوە[1]، زمانی کوردییش، وەك له زانستی وشەسازیدا باوە زمانێکی لکاوە — واتا، بەیەکەوە نووساوە یاخود به واتای ئەوەی که ژمارەیەکی زۆر له وشه و دەربڕینەکانی ناسادە و لێکدراون، یان دەتوانرێت به ئاسانی مۆرفیمی وشەکانی لەیەك جیابکرێنەوە و دەستنیشان بکرێن، ئەم تایبەتمەندییەی زمانی کوردی بەوە چەسپاوە که بەهۆی ڕێبازی لێکدانەوە، زۆربەی ناو و کردارەکان لەسەر بناغەی یەکگرتنی دوو وشەی واتادار یان زیاتر له فەرهەنگی زمانی کوردیدا له دایکبوون و وەکو وشەیەکی خاوەن واتایەکی سەربەخۆ خۆیان چەسپاندووە[2] و زمانەکەشمان وەك زۆربەی زمانە ئارییەکان لێکدراوی زۆری لەهەموو جۆر وشه و زاراوە تێدایە[3] و ئەگەر به قوولی له زاراوەی لێکدراوی کوردی بکۆڵینەوە و هەوڵی دیاریکردنی بدەین، بۆمان دەردەکەوێت که زاراوەی لێکدراویش به پێی یاساکانی وشەی لێکدراو ساز

---

[1] د.کامل بصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٨٨.

[2] د.کامل بصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٦٢.

[3] ئەحمەد حەسەن ئەحمەد، پێشگر و پاشگر، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق (دەستەی کورد)، بەرگی (سێیەم)، بەشی (یەکەم)، بەغدا، ١٩٧٥، ل٣٢٠.

دەبێت،کە چەند دانەیەکیان دەکەینە نموونەی باسەکەمان[*]، وەك: مردننامە، کاسەسەر، کتێب دۆست، دەنگەژێ، سەربەسەر، شەوکوێر، شەرواڵ بە کۆڵ، زەرداو... وتارە هەواڵ، ئاڵوگۆڕکردن، خوێنهێن، بەفرماڵ، گڤەگڤ، گەلکاریی، باڵادەست،... دەستبڕین، پێگرتن، چڵکاوخواردن، سەرخۆشبوون، سەرسپیکردن، ڕووڕەش کردن، دڵ جۆشدان، پشت بەخۆبەستن، پەلەپۆست... هتد.

## سێیەم: ڕێبازی (خوازە، میتافۆر، - المجاز / الاستعارة — (Metaphor

فراوانکردنی واتای زمانەوانی وشەیەکە کە واتایەکی نوێی بداتێ[1] وشەیەکی وەك (شۆخ) کە ئێستا بە واتای (جوان) دێت لە قۆناغێکی پێشتردا بە واتای ((بێ حەیا)) بەکارهاتووە[2].

---

[*] بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی سەرجەم ئەو بنەمایانەی کە وشە و زاراوەی لێکدراوی لێ پێکدێت، بڕوانە:

(أ) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، ل٨٤-٩٤.=

(ب) ڕۆژان نوری عبداللە، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی ، ل ١٥٧-١٧٣.

(پ) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، ل٨٥-٨٦.

(ت) د.کامل بصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٦٣-٦٨.

چەندین سەرچاوەی تریش کە لە پەراوێزەکانی ئەم لیکۆڵینەوەیەدا ناویان هاتووە...

[1] شحادة الخوري، دراسات في الترجمة والمصطلح والتعريب، ص١٧٤.

خوازه، یان خواستن زاراوەیەکی زمانی و ڕەوانبێژییە و چەمکەکەی بەوە دەست نیشان دەکرێت، کە گواستنەوەی وشەیەکە لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی دی بەمەرجێك لە نێوانی هەردوو واتاکەدا چەشنە پێوەندییەك هەبێت[(١)] [(*)] ڕێبازی خوازە لە زاراوەسازیدا بە ڕێگەیەکی گرنگ دادەنرێت و هۆیەکە بۆ دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی هەر زمانێك. لەم ڕێبازەدا بێژەی ئەو وشەیە دەخوازین یان وەردەگرین و دەیگوێزینەوە بۆ دەربڕینی واتایەکی تر، کە لە هەندێك ڕووەوە لێی نزیکە، وەك ئەوەی وشەی (برووسکە) کە ناوە بۆ شەوقی ئەو چەخماخەیەی لە هەورەتریشقە پەیدا دەبێت بۆ واتایەکی وەك (برقية – Telegraph) و گەلێك وشەی تری وەها کە بۆ واتایەکی جیاوازتر لە واتا ئاشکراکەی خۆی بە

---

[(٢)] محمد معروف فتاح، زمانەوانی، دار الحكمة للطباعة والنشر في اربيل، هەولێر، ١٩٨٤، ل١٢٤.

[(١)] د.کامل بەصیر، بەراوردییەك لە نێوانی زمانی کوردی و زمانی عەرەبیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ((دەستەی کورد))، بەرگی سیازدەهەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٥،ل١٨.

[(*)] هەروەها لە بارەی پێناسەی میتافۆرەوە بڕوانە:

أ – جەمال عەبدول، بیردۆزی گشتی زاراوەدانان و یەکخستنی و تۆمارسازی، گۆڤاری (وەشت)، ژمارە (١)، ل١٢.

ب– جەمال عەبدول، زاراوەسازی و زانستاندنی زمانی کوردی، گۆڤاری ئەکادیمی کوردی، ژمارە (٧)، ل١٥١.

ج– انترنیت: فريد امعضشو، اليات وضع المصطلحات في اللغة العربية. www.odabasham.net/print.php?sid=١١٥٤٨.

کاردەهێنرێت[٢]، وەك: بلول، بلول بێژ، بلوێر، بلوێر بەزێن، بلوێر ژەن، بلوێر ژەنین، بلوێر لێدان[١]، هەروەها وشەی، دەست درێژ، دەست کورت، زمان درێژ، چاوسوور، کەللە تەزێن، چاوکراوە،... هتد.

دەربارەی ئەم ڕێگایە و لەم ڕووەوە وشەی (Metaphor) کە بە فەڕەنسی (metaphore) دەنووسرێت، لە زمانی یۆنانی و لاتینی دا بە (metafora) ناسراوە واتاکەی لە زۆر کۆنەوە، بردن و گواستنەوە دەگەیەنێت، لە گشت زمانەکاندا ئەم ڕێگایە بە هەمان واتا بە کارهاتووە و بۆ هەمان مەبەست سوودی لێ بینراوە. خوازەش لە زمانی عەرەبیدا زیاتر بەکارهاتووە و بواری فراوانترە و ڕێگەیەك بووە کە زاناکانیان بۆ گوازستن و خواستن پشتیان پێی بەستووە، بەوەی لە نێوان ئەو و نێوان واتا نوێیەکەدا واژەیەکیان بەکارهێناوە، پێوەندییەکی لێکچوو یان هۆیی یان هەندێك یان گشتی یان سەرتاپای یان تایبەتمەندیی یان خستنەسەر یان لێ پێکهاتن، لە نێوانیاندا دەمێنێت[٢]. لە زمانی کوردیدا باری وشەی خوازەیی بەو جۆرە فراوانە نییە، چونکە ژمارەیان کەمە و بە دەگمەن سازدەکرێت، بە تایبەتی لە کۆڕی فەرهەنگ و زاراوەسازیدا.

---

[٢] ئیبراهیم ئەمین باڵدار، زاراوە و زمان لە کاروانی زانیاری ئەمڕۆدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٢)، ل٢١٩.

[١] هەژار، فەرهەنگی (هەنبانە بۆرینە) کردی – فارسی، تەهران، ١٣٨١، ل٥٨.

[٢] قاسم السارة، تعريب المصطلح العلمي (اشكالية المنهج)، مجلة (عالم الفكر)، المجلد التاسع عشر، العدد الرابع، ص٨٥.

میتافۆر (metaphor) وەك زاراوەیەكی بیانی لە كوردیدا زاراوەی جۆربەجۆری بۆ بەكارهاتووە: (خواستن، ئاوەڵواتا، خوازە) كە بریتییە لە بەكارهێنانی وشەیەك بۆ گەیاندنی واتایەك جگە لە واتا بنەڕەتییەكەی، میتافۆر زمان جوان دەكات و لەزووەوە بەكارهاتووە و لە ناو گەلان بایەخی پێدراوە و زمان لە دەربڕینە باو و سواوەكان ڕزگار دەكات، كە بە تێپەڕبوونی كات ژەنگ دەهێنێت و دووبارە گیان بەبەر زمان و فەرهەنگی وشەكاندا دەكاتەوە[1] و سوودێكی گەورەی هەیە، لەوانە:

- بە وەرگرتن و بە كارهێنانی، زمان فراوانتر دەبێت.

- میتافۆر بە دیهێنانی شێوازی نوێی ژیان دەگەیەنێ.

- یەكێك لە بەكارهێنانە گرنگەكانی میتافۆر پڕكردنەوەی فەرهەنگی وشەیە، لەبەرئەوەی فەرهەنگی زمانێك چەند دەوڵەمەند و پتەوتربێت هێشتا بۆشایی گەورە بە خۆیەوە دەبینێ و هەرگیز ناتوانێت پێشەكی پێشبینی هەموو ئەو بارانە بكات كە دنیای دەوروبەر و مێشكی مرۆڤ درووستی دەكەن.

- كەڵكێكی تری میتافۆر لەوەدایە كە واتا حەرفییەكەی دەربڕینەكە ناسڕێتەوە و لەناوی نابات، واتە نەك هەر واتای نوێی و ڕەوان دەهێنێتە ناو زمانەكەوە، بەڵكو لە زۆربەی بارەكانیشدا سامانە فەرهەنگییە بنەڕەتییەكەش دەپارێزێ، چونكە لێكدانەوەی واتای میتافۆری وشە و

[1] د. محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري (انكليزي – عربي)، ص١٦٨.

دەربڕین لە زۆر باردا بە گەڕانەوە بۆ لێکدانەوەی واتا حەرفییەکە، وشە و دەربڕینە کۆنەکە دەکریٚ.

- میتافۆر ئامرازێکی بەهێزە، هەر کاتیٚ بمانەویٚ بارێکی نویٚ بدۆزینەوە یان ڕوونی بکەینەوە یان ستایشی بکەین توانای ئەوەمان دەداتیٚ کە باری نوێی لە چوارچێوەی وشە و دەربڕینی کۆندا، چوارچێوەیەك کە لێی ئاشناین و لێی دەزانین لێکبدەینەوە.[1]

-میتافۆر دیاردەیەکی زمانیە و بڵاوە، لە زۆر شێوەی گەیاندنی زمانییدا دەبینریٚ، ئاخاوتنی ڕۆژانە، وتاری ڕۆژنامە، وتاری ئایینی، نووسین و ڕۆمان و فەلسەفە و شیعر و... هتد. وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەون:

١- پیاو گورگە

٢- ڕۆژانی سەخت

٣- پەپوولەی ئارەزوو

٤- تەنها لە ئاشتیدا خەونەکان باڵ دەگرن...[2]

---

[1] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل١٧٨-١٧٩.

هەروەها بڕوانە:

- د. بەکر عومەر عەلی، میتافۆر لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٠، ل١٢-١٤.

[2] د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی (کوردی - عەرەبی - ئینگلیزی) لەگەڵ دوو پاشکۆ، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٣٤٩- ٣٥٠.

میتافۆر بە دیاردەیەکی هاوبەشی نێوان زمان و ئەدەب دادەنرێت و ڕێبازێکی نوێی ترمان بۆ زمانی کوردی دیاری دەکات و زمانەکانیش سوودیان لەو ڕێبازە وەرگرتووە، بۆ وێنە دەکرێ لە ڕێگەی ئەمەوە بەرگی نوێ بەبەر وشەکاندا بکرێت و یان لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر و بۆ واتایەکی نوێش بگوازرێتەوە. پاشان دەکەونە ململانێ، یا ئەوەتە بە هەردوو واتا دەمێننەوە یان واتایەکیان بەسەر ئەوەیتر زاڵ دەبێت و لەناوی دەبات، هەندێك جاریش واتایەك بازنەی بەکارهێنانی تەسك دەبێتەوە یان لە پاژەکەی خۆیەوە بۆ ناونانی چەند بوارێکی دیکە فراوان دەبێت[1].

لێرەدا دەبێت ئەوە بزانین ئایا بۆ دەبێت زمانەکەمان بایەخ بە میتافۆر نەدات؟ ئەم بایەخدان و گرنگیی پێدانەی میتافۆر لە زمانانی دنیادا هۆکاری زۆرە لەوانە بوونی وتنی میتافۆری بە ئەندازەیەکی زۆر لە زماندا و تەنانەت لە قسەی ڕۆژانەشدا و پێوەندی میتافۆر بە چەمکی نارێزمانێتی و یاسا زمانییەکان و داهێنان لە زماندا[2] و هۆیەکە بۆدەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زاراوەسازی زمان... هتد.

لە کوردیدا وشەی (پاشکۆ) شتێکە کە سوار لەپاش خۆیەوە دایدەبەستێ، نەك هەر سوار، بەڵکو ئەوەی پاسکیلیش لێدەخوڕێ لە دوای خۆیەوە پارچە ئاسنێك یان هەرشتێکی داناوە پێی دەڵێن (پاشکۆ)، بەڵام ئێستا بووە بە زاراوەیەك بەرانبەر بە (الملحق)ی کتێب و دامودەزگا و

---

[1] ) ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل١٨٠.
[2] ) د. بەکر عومەر عەلی، میتافۆر لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە، نامەی دکتورا، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٥٣.

خانوو... هتد، بەکاردەهێنرێت. هەروەها وشەی (تەوەرە)ی[*] ئاش بۆ میحوەری گۆی زەوی و میحوەری کاروباری سیاسەت و فیزیا بەکاردەهێنرێت. (جومگە) بە مانای (مفصل) دێت کە دووئێسك لە لەشی مرۆڤدا سەرەکانیان دەگەنە یەك و ماوەی جوولانەوەیان دەمێنێ وەکو ئانیشك و جومشك و مەچەك، ئەم زاراوەیە بۆ مەکینە و بۆ بەڕێوەبەرایەتی بەکاردەهێنرێت و زاراوەی تری لێ داڕژاوە و وەکو (التمفصل) و دەجومگێنن[1]، هەروەها لە ئەندازەدا ناوی شتومەکی ناومالْ و هەندێك پیشە گوێزراونەتەوە بۆ واتا و مەبەستی نوێی زانیاریی ئەندازە، وەکو (بازنە)- دائرة — لە بازنی دەستەوە کە خڕە، خشتەك (مکعب) کە دارێکی شەش ڕووی ڕێکی زێڕینگەرانە یان پارچە قوماشێکی چوار گۆشەییە لە ژێر هەنگڵەوە لە چۆغەی دەدەن. تەریب (توازی) بۆ ئەو هێڵە دروومانانەیە کە جاران بەرگدروو کورتەك، یان کوڵەنجەی ناو بە لۆکەی پێ تەریب دەدا و ڕێ ڕێ دەبوو.

لە زمانی کوردیدا، بە تایبەتی لە لادێ زۆر وشە و زاراوەمان هەیە کە بۆ جووت و مەڕ و مالات و زەوی و ڕەز و بێستان... هتد، بەکار دەهات وا خەریکە لەبیر دەچنەوە، بۆیە لەسەر زانایان ئەوەیە کە بەهەر جۆرێك بێت

---

[*] لە بارەی وشەی (تەوەرە)وە بڕوانە:

– تۆفیق وەهبی، سەلام سەردەقی شکاند، گۆڤاری (دەنگی گێتیی تازە)، بەرگی یەکەم، ژمارە (٦)، بەغدا، مارتی ١٩٤٤، ل٢١– ٢٤.

[1] عبدالرزاق بیمار، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، ل٢٩٦.

بوار نەدەن ئەو وشانە لەبیر بکرێن، چونکە فەرامۆشکردنیان زیانێکی گەورە بە سامانی فەرهەنگیی زمانیی کوردی دەگەیێنێت و هەروەکو چۆن جاران لایان سەیربوو (پاشبەند) بۆ قافیة و (پاشکۆ) بۆ ملحق و (گەمارۆ) بۆ محاصرة، بەکاربهێنن، چونکە ئەمانە بۆ کەلوپەل و کاروباری کەر و ئەسپ و سەگ بەکارهاتوون، نابێ ئەمڕۆ پێیان سەیربێت کە ناوی ئامێرێکی ئاشی ئاو ببێ بە زاراوە بۆ پارچەیەکی کەشتییەکی بۆشایی.[1]

گەلی عەرەب هەر لە زووەوە ئەمەیان کردووە و هەرچی زاراوەی کێش و مۆسیقای شیعر هەیە لە ڕەشماڵیان وەرگرتووە، خۆ کۆمەڵێك وشەی بەنرخ و بەڕێزی عەرەبی بە مەجاز لە هەڵسوکەوتی حوشترەوە وەرگیراوە.

لە میتافۆردا وشە بە واتای چەسپاوی خۆی بەکار نایەت، ئەگەر وشە خاوەنی واتای چەسپاو و نەگۆڕ نەبێت[2]، هەڵبەت میتافۆر بێ واتا دەردەچێ، واتای ڕستە کۆی واتای کەرتەکانی نییە، بۆ نموونە ڕستەیەکی وەك (نەمریم بە چاوی خۆم دی) بێ واتا دەبێ، ئەگەر لە لێکدانەوەیدا خۆمان بە کۆی واتای چەسپاو و نەگۆڕی خۆمان بە وشەکانەوە خەریك بکەین و بمانەوێ لەم ڕێگەیەوە ڕستەکە بدۆزینەوە[3] بۆیە لە شیکردنەوەی میتافۆریشدا دەتوانین بگەینە ئەوەی کە وشە واتایەکی نەگۆڕ و چەسپاو

---

(1) عبدالرزاق بیمار، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١) ، ل٢٩٧.

(2) د. بەکر عومەر عەلی، میتافۆر لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی، ل٩.

(3) ڕۆژان نوری عبداللە، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل١٨٠.

نییه و له زمانی کوردیدا دەتوانرێ دوو جۆر واتا (مانا) بۆ وشه جیا بکرێتەوە:

١- واتای حەقیقی (direct proper meaning) بەو واتایە دەوترێ که ڕاستەوخۆ دیاردەیەکی بابەتی واقیعی نیشان دەدات.

٢- واتای مەجازی (transfered meaning) بەو واتایە دەوترێ که ڕاستەوخۆ دیاردەیەکی بابەتی واقیعی نیشان نادات، بەڵکو له ڕێگای پەیوەندییەوە لەگەڵ دیاردەیەکدا واتا دەدات.

بۆ وێنە وشەی (ئاگرنانەوە) له زمانی کوردیدا به واتای (ئاگربەردان) له شوێنێك که بسووتێ و (هەڵگیرساندنی شەڕ و ئاشووبنانەوە) دێت. واتای یەکەم حەقیقییە، بەڵام واتای دووەمی خوازە(مەجاز)ییە و ڕاستەوخۆ دیاردەیەکی بابەتی واقیعی نیشان نادات، چونکە ئاشکرایە دیاردەکە لەم ڕووداوەیاندا (گڕگرتن و سووتاندن)ی تێدا نییه، بەڵکو ئەم کارە که (ناخۆشی و وێرانی و خراپی) لەدوایە له ئەنجامی (گڕگرتن و سووتاندن)ەوە نزیکە[1]، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت وشه له ڕووی ژمارەوە له هەموو زمانێکدا سنووردارە و لەبن دێت، کەچی واتا وانییە و هەرگیز کۆتایی نایەت و له پەرەسەندندایە، ئەمەش وای کردووە هەندێ وشه بۆ دوو واتا یان زیاتر، بەکاربێت، بۆ نموونە وشەی (خاڵ) و (شاخ)... هتد.

شاخ ........... زەقایی ڕەقی سەری هەندێ گیانداری وەك: بەران و بزن و ئاسکە کێوی و...

شاخ.......... کێو، چیا.

---

[1] د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی ، ل١٠-١١.

شاخ.......... ڕەوزە بەردێك بە چیاوە.

شاخ........... باروت دانی ڕاوچی.

شاخ.......... چیای بەردین[1].

ئەم وشانەش لە زانستی زمان و ڕەوانبێژیدا بە جۆری جیاواز باس دەکرێن و لێیان دەکۆڵدرێتەوە. بۆ نموونە لە زمانی لاتینی و زمانە زیندووەکانی ئەورووپا لە ژێر ناونیشانی میتافۆر (metaphore)زاناکانی (ریتورك) و (سیمانتیك)یشیان دەکەنەوە، لە زمانی عەرەبیدا لە ژێر ناوی (المجاز والاستعارة) لێکیان دەدەنەوە، سەرئەنجامیش ئەو وشەیەی کە بۆ واتایەکی نوێ لە زمانی لاتینی و زمانە زیندووەکانی ئەورووپادا بەکاردێت پێی دەوترێت میتەفۆر (metaphore) و لە زمانی عەرەبیدا بە (المجاز) ناو دەبرێ. زمانەوانانی کوردیش لەسەر هەمان ڕێچکە خۆیان لە قەرەی ئەم بابەتە داوە و شوێن پێی شارەزاکانی عەرەبیان هەڵگرتووە و ناوی ئەو وشانەیان بە خوازە یان خواستە ناوناوە[2]. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە وشە لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی تر گوازرابێتەوە؟ بۆ نموونە لە زۆربەی زمانەکاندا بۆ پیاوی ئازا و کوڕی ئازا وشەی (شێر) بەکاردێت و لە جیاتی ئەوەی بوترێ (پیاوێکی ئازام لە بازاڕ دی) دەوترێت (شێرێکم لە بازاڕ دی) یان لە جیاتی ئەوەی بوترێ (کچێکی جوانم لە زانکۆ دی)

---

[1] عەلی نانەوا زادە، فەرهەنگیی کوردیی هەرمان، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، کوردستان – هەولێر، ٢٠٠٥، ل١٣.

[2] د. کامیل بەصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٥٨.

دەوترێت (ئاسکێکم لە زانکۆ دی) بۆیە وشەی (شێر) و (ئاسك) دوو واتای هەیە.

(شێر)ناوێکە بۆ دڕندەیەکی ئازا، وشەی (ئاسك)ەش ناوی ئاژەڵێکی گۆشت خۆشی جوانە و واتای دووەمی (شێر) و (ئاسك) ئاوەڵناوێکە بۆ پیاو و کچ بەکارهاتووە.

کەوابوو وشەی (شێر) و (ئاسك) لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی دیکە نەگواستراوەتەوە، بەڵکو خۆی لە خۆیدا دوو واتای پێکەوە لکاوی هەیە. واتای یەکەم واتا ڕاستەقینەکەیەتی و واتای دووەمیش لە واتا سەرەکییەکەوە هەڵقوڵاوە و مەجازییە و بۆتە ئاوەڵناو.

میتافۆر لە نامیتافۆر بەوە جیا دەکرێتەوە کە یەکێك لەو نیشانانەی، کە لە زۆربەی بۆچوونەکاندا ئاماژەی بۆ دەکرێ، لەگەڵ جیاوازیشیاندا، ئەوەیە میتافۆر ڕەگەزی نامۆیی و ڕامانی تێدایە (هێنل) بۆ نموونە، لەو باوەڕەدایە لە ڕوانگەی گوێگر / خوێنەرەوە ((دیارترین تایبەتمەندیی میتافۆر جۆری ئەو (صدمة)یە یە، کە دەیهێنێتە ئەنجام)) هەروەها (ڕانسەم) وای بۆ دەچێ میتافۆر تەنیا تەنی نامۆ، واتە (نامۆیی) دەهێنێتە نێو باری وتنەوە. دیسان (بیرتسلی) باوەڕی وایە، جیاوازی نێوان دەربڕینی میتافۆری و نا میتافۆری لەو دژایەتییەدایە، کە لە دەربڕینی میتافۆردا هەستی پێدەکرێ. (وانزییش) میتافۆر بەو وشەیە دەزانێ، کە هاتنی لە باری وتندا شتێکی چاوەڕوان نەکراوە[1].

---

[1] د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، ل١٥٠.

مەجاز یان خوازە ئەوەیە کە وشەیەك بەکاردێنین بۆ گەیاندنی واتایەك جگە لە واتا بنەڕەتییەکەی. لە دایکبوونی زاراوە بەهۆی مەجازەوە لەسەر سێ بناغە دامەزراوە:

یەکەم: بناغەی فراوانکردنی واتای وشەیەك کە بەر لە واتاخوازییەکەی بۆ واتایەکی تایبەتی دەستنیشان کراوە و بەکارهێنراوە. وەکو وشەی (سەرچاوە)[1] کە لە زمانی کوردیدا بۆ واتای (شوێنێك) هاتووە، کە ئاوی کانی یان کارێزی لێ دەرکەوێت، بەڵام ئێستاش بەهۆی ڕێبازی خوازەوە واتای فراوان کراوە و بۆ واتایەکی گشتی هەموو شتێکی مادی یان بیری لێوە وەردەگیرێ لێ سازکراو دەوترێ (پارە سەرچاوەی بەختیارییە) یان (نەخوێندەواری سەرچاوەی دوواکەوتنە).

هەروەها وشەی (پشتیوانە)[2] لە فەرهەنگدا بە واتای دارێك هاتووە کە لە پشت دەرگاوە دادەچەقێنرێ بۆ ئەوەی بخرێتە بەر (پشکۆڵ) بۆ پتەویی، کەچی بەهۆی هەمان ڕێبازەوە لە مەیدانی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا بووە بە زاراوەیەك و بۆ واتایەکی فراوانتر سازکراوە و مەبەستی هەموو کەسێك یان شتێك پشت پێ بەستراو دەدات بە دەستەوە، دەوترێت فلاّن کەس پشتیوانمە، لە بانکدا (پشتیوانەم هەیە)، واتا — ڕەصیدم هەیە.

---

[1] فەرهەنگی خاڵ، بەرگی دووەم، ل ٢٦٩.

[2] بڕوانە: شێخ محمدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٠، ل٢١٨

دووەم: بناغەی تایبەتی کردنی واتای وشەیەك کە لە مەوبەر بۆ واتایەکی گشتی و ئەرکێکی فراوان بەکارهێنرابێت. وەکو وشەی (کێش)[٢] کە لە زمانی کوردیدا بۆ کێشانی هەموو شتێك بە تەرازوو بەکارهاتووە، ئێستاش لە زانستی زمان و وێژەدا بۆ کێشانی دێڕە شیعرێك سازکراوە. هەروەها وشەی (کەوتوو) کە لە قەدی (کەوت) و پاشگری (وو) پێکهاتووە و ناوی بکەرە[*] لە فەرهەنگدا ئاوەڵناوێکە بۆ هەموو گیانلەبەرێك یان شتێك کەوتبێت، بەڵام لە فێرگە و زانکۆکان بە هۆی ڕێبازی خوازەوە ئەم وشەیەیان کردووە بە زاراوەیەك بۆ دۆزێکی تایبەتی بەکاریان هێناوە. بۆیە لە بواری تاقیکردنەوەی فێربووندا دەوترێت، فلان (کەوتووە)[١] واتا، لە تاقیکردنەوەدا دەرنەچووە... هتد.

سێیەم: کەڵك وەرگرتن لە لێکچوون و پێوەندیی نێوان وشە فەرهەنگییەکە و واتا زاراوەییەکەی، وەکو وشەی (هێڵ) کە لە

---

[٢] . فەرهەنگی خاڵ، بەرگی سێیەم، ل٧١.

[*] ناوی بکەر بەو وشانە دەوترێن کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و واتای ڕووداوێك لە لایەن ئیشکەرەوە دەگەیێنێت و توانست و تایبەتییەکە یان سیمایەکی بەردەوام و هەمیشەییان پێ دەبەخشێت و لە ناوی کارای داڕێژراو و لێکدراو پێك دێت و بە ڕێگەی جۆر بەجۆر درووست دەبێت. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

- د.ئەورەحمان حاجی مارف، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، کوردی - عەرەبی - ئینگلیزی، ل٣٥٨-٣٥٩.

[١] ئەنجوومەنی کۆڕ، زاراوەی کارگێڕی، بەغدا، ١٩٧٣، ل٥٨.

فەرهەنگدا بە واتای (کێدری جووت)[٢] هاتووە و لە ئەندازیاریدا بە مانای (خەتی ڕاست) بەکاردێت و لەبەر تیشکی بناغەی لە یەکچووی هەردوو واتاکەیدا ئەم ئەرکە تازەیەی پێ سپێردراوە. هەروەها وشەی (قاچ) کە بۆ ئادەمیزاد بەکاردێت، لە هەمان کاتیشدا بۆ (مێز) ساز دەکرێت و دەوترێ (قاچی مێزەکە) هۆی سازکردنی وشەی (قاچ) بۆ (مێز و کورسی و.... هتد) چەشنە پێوەندییەکە لە نێوان ئەرکی وشەی (قاچ) لەم بارەدا.

هەروەها وشەی (زمان)یش، بە مانای ئەو پارچە گۆشتە دێت کە لە دەمدایە، بەهۆی پێوەندیی دەربڕینی ئاخاوتنەوە بووە بە زاراوەیەکی زانستی و بەرانبەر بە (اللغة) بەکاردێت[*]. ئەوەی لە بارەی خوازەوە وترا

---

[٢] بڕوانە: شێخ محمدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ، بەرگی سێیەم، ١٩٧١، ل٤٤٥.

[*] سەبارەت بە زیاتر زانیاری لەبارەی ئەم سێ ڕێگایەوە، بڕوانە:

أ- د. کامل بەصیر، بەراوردیەك لە نێوانی زمانی کوردی و زمانی عەرەبیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ((دەستەی کورد))، بەرگی سییازدەهەم، ١٩٨٥، ل١٩-٢١.

ب- د. کامل بەصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٦٠-٦١.

پ- د. کامل بەصیر، زمانی عەرەبی و کێشەی زاراوەی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (دووهەم)، بەشی(یەکەم)، بەغدا، ١٩٧٤، ل٧٥٥.

ت- جەمال عەبدول، بەرکولێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی، ل١٥-١٦.

دەمانگەیێنێتە ئەوەی کە (ئیدیەم)ە کانیش دەچنە بواری میتافۆر و واتای مەجازی زمانەوە.

زاراوەی (ئیدیەم – idiom)لە لاتینییەوە وەرگیراوە و نەك هەر لە زمانی کوردی، بەڵکو لە گشت زمانە زیندووەکانی جیهاندا بەدی دەکرێت. دەربارەی پێناسەی ئیدیۆم، وتراوە: پێکهاتنێکی ئاڵۆزە، لە شێوەیەکی ئامادە و تێکەڵدا لە زماندا هەیە کە لە یەکگرتنی هەندێ وشە، واتایەکی تایبەتی پەیدادەبێ، کە لە واتادا لە وشە نزیك دەبێتەوە[1]. هەروەها لە پێناسەی ئیدیۆمدا هاتووە: ئەوەیە کە ڕاستەوڕاست ناوی شتێك نەبەی بەڵکو بچی ناوی شتێکی تر ببەی، کە پێوەندیی بە واتای یەکەمەوە هەبێت بۆ ئەوەی پیاو لە واتا باسکراوەکە، بۆ واتا مەبەستە هێما بۆ کراوەکە بچێ[2] و بواری ئیدیۆمیش بوارێکی فراوانە و لە گشت لایەنەکانی ژیاندا بەکاردێت و نەك هەر تەنیا لە قسەی ڕۆژانەی خەڵکیدا هەروەك زۆر کەس وا تێدەگەن، بەڵکو زۆرجار لە

---

ج– محمد مبارك، فقه اللغة وخصائص العربية، الطبعة الثانية، مطبعة دار الفكر الحديث، لبنان، ١٩٦٤، ص٣٠٨–٣٠٩.

[1] د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، ل٥٧–٥٨.

[2] د. نەسرین محەمەد فەخری، هەندێ زاراوە و ئیدیۆمەی کوردی، لێکۆڵینەوەیان لە ڕووی زمانەوە، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، ژمارە (١٩)، ل٩٤.

زمان و نووسین و شیعر و چیرۆکیشدا بەکاردێت، لەو شوێنانەدا کە پێویستی بەکارهێنانی ئەم ئیدیەمانە بکات[٣].

زمانی کوردیش وەك زمانەکانی تر و بە پێی تایبەتمەندیی خۆی جۆرێکی زۆر ئیدیەمی تێدایە، کە پێوەندییان بەو ڕوودانەوە هەبێت، کە لەناو خەڵك و ژیانی ڕۆژانەدا ڕوو دەدەن، هەیە، کە بە پێی مەبەستیان دەکرێنە چەند چەشنێك:

١- ئەو ئیدیەمانەی یەك واتا دەبەخشن، وەك: (پاکوخاوێن، قیتوقۆز، باخوباخات،...) هتد.

٢- ئەو ئیدیەمانەی زیاتر لە واتایەك دەبەخشن، وەك (زمانی لە دەمدا نییە) بۆ کەسێك بە کاردێ کە بێ دەنگ و کزبێ یان بێ دەسەڵات بێ و هیچی پێ نەکرێ - واتە، حەق خوراوبێت،... هتد.

هەندێ ئیدیەم هەیە لە هەمان کاتدا بۆ واتای ڕاستەوخۆ و بۆ واتای خوازەیش بەکاردێت، بە وێنە (شووڵی لێ هەڵبڕیوە) واتا ڕاستەوخۆیەکەی ئەوە دەگەیەنێ (یەکێك شووڵ لە یەکێك هەڵبڕێ)، بەڵام واتا خوازییەکەی - واتە، (لە تامی دەرکرد، لە ڕادەی تێپەڕاند)[١].

٣- ئیدیەمە دژەکان: ئەوانەن لە مەبەستدا دژی یەکن، وەك:

زماندرێژ – زمان کورت

---

[٣] Jennifer seidl ,English Idioms ,Oxford University Press ,١٩٨٨ , p.١٣.

[١] جەلال مەحمود عەلی، ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، دەزگای ڕۆشنبیری کوردی، زنجیرەی کەلەپوور – ١ –، بەغدا، ١٩٨٢، ل٣٤١-٣٤٢.

دەست پاك — دەست پیس

... هتد.

٤- ئیدیەمە لە یەكچووەكان، وەك:

دەمشڕ — زمانشڕ

دەستڕۆ — بەهێز

... هتد.

٥- ئیدیەمە كورتەكان، لە دوو وشە یان سێ وشە پێك دێن، وەك:(مانگە شەو، مانگا بەكەڵ،...) هتد.

٦- ئیدیەمە درێژەكان - لە ڕستەیەك یان پتر پێكدێن، وەك: (وەك كەڵەشێری ناوەخت وایە)، (كۆتر لە دەماخی دەفرێت)[١]... هتد.

٧- هیچ وشەیەك لە زمانی كوردیدا بەئەندازەی وشەی (دەست — دەس) وشەی لێكدراو و ئیدیەمی لێ درووست ناكرێ بۆ نموونە: (دەست خۆش، دەسنوێژ، دەست شكاو،...)[٢] [*]هتد.

---

[١] جەلال مەحمود، ئیدیۆم لە زمانی كوردیدا، بەرگی یەكەم، ل٣٨٩.

[٢] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی كوردی، ل١٨٩-١٩٣.

[*] بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی ئیدیۆمی كوردی، بڕوانە:

- جەلال مەحمود عەلی، ئیدیۆم لە زمانی كوردی دا، بەغدا، ١٩٨٢.

بەرگی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠١.

## چوارەم: ڕێبازی وەرگرتن – الاقتراض - borrowing

ڕێبازی وەرگرتن هۆکارێکە بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی، هەروەها یەکێکە لەو ڕێبازانەی بە ئەندازەیەکی باش بەهۆی وەرگرتنەوە بەکاردێت، ئەم وەرگرتنەش بەهۆی دەستکارییەوە یان بێ دەستکاریی بەکاردێت، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەندامانی کۆمەڵ هەوڵی بژاردنی ئەو وشانە نادەن، کە دێنە نێو زمانەکەیان، هەموو نەتەوەیەك هەوڵ دەدات ئەوەندەی بۆی بکرێ وشەی خوازراو لە زمانەکەیدا (بژار) بکا، و بۆ ئەو شتە تازانەش کە دێنە گۆڕێ، وشەی خۆماڵیی ڕەسەن لەسەر بناغەی دەستووری زمانەکەی دابنێ[1]، بەڵام ئەو کارانە ئیشی تاقە کەسێك نین، بەڵکو لەسەر هەمووانە، بە تایبەتی خاوەن لایەنی پێوەندیدار.

ڕێبازی وەرگرتن بۆ دانان و سازکردنی زاراوە لە هەموو زمانێکی پێشکەوتوودا کارێکی ڕەوایە و زۆربەی زاناکان لەسەری کۆکن و هیچ زانا و زمانەوانێك نکوڵی لەوە ناکەن، کە ئەم کارە لە چاخەکانی کۆن و نوێدا ڕووی داوە[2]، بۆیە دەتوانین بڵێین هەموو زمانێك کەم تا زۆر بەپێی

---

[1] عبدالرحمن زەبیحی، ڕەخنەی زانستییانە یاخود شەلم کوێرم هیچ نابوێرم، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٧١)، بەغدا، تشرینی دووەم – کانوونی یەکەم، ١٩٧٨، ل٢١.

[2] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل١٢٩–١٣٠.

نزیکیی و دووری نەتەوەکان لەیەکەوە کەرەستە زمانییەکان وەردەگرن و دەبەخشن. زمانی کوردیش وەك هەموو زمانانی جیهان لەم دیاردەیە بێ بەش نییە بە تایبەتی لەگەڵ زمانەکانی عەرەبی و تورکی و فارسی و ئینگلیزی و...هتد. هەندێ وشە هەن کە لە زمانێکەوە وەرگیراون ئەویش لە زمانێکی دیکەوە وەریگرتووە، بۆ نموونە وشەی (بیجامە) ئێمە و عەرەبیش لە ئینگلیزیمان وەرگرتووە (pyjama)، بەڵام ئینگلیزیش لە زمانی هیندییەوە وەریگرتووە. وشەی (جگەرە) هەروەها لە (cigarette)ی ئینگلیزییەوە وەرگیراوە[٣]، بەڵام بنچینەی وشەکە فەڕەنسییە، هەروەها زمانی کوردی چەندین وشەی تری وەك کتێب و قوتابی و کلۆج و ئەنقەستی و لە زمانی عەرەبی و میهرەبان لە زمانی فارسی و وشەی تەلەفۆن و زۆربەی زاراوە شارستانییەکان لە زمانی لاتینییەوە وەرگرتووە[١]. ئەو وشانەی کە لە هەر زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر وەردەگیرێن چ لە زمانی کوردی چ لە زمانی عەرەبی وەکو شێوەی ڕەسەنەکەی نەماونەتەوە، بەڵکو خراوەتە ژێر کارتێکردنی دەنگسازیی زمانە وەرگرەکەوە و بەرگی فۆنەتیکی خۆماڵی بە بەردا کراوە و بووە بە داڕێژراوێکی نوێ.

زاراوە وەرگرتنیش تا بتوانرێت لێی دوور بکەوینەوە باشترە و زمانەکەمان بە وشە و زاراوەی بێگانە نەڕوشێنین نەك وەك زمانی فارسی،

---

[٣] د. کەمال میراودەلی، فەرهەنگی ڕێزمانی کوردی، ل١٣٥-١٣٦.

[١] د. کامل بەصیر، بەراوردکاریەك لە نێوانی زمانی کوردی و عەرەبیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق (دەستەی کورد)، بەرگی سیازدەهەم ، ل٢١.

کە بێ باکانە چ زاراوەیەکی بە دڵ بێت و دەستی بکەوێ وەریدەگرێت و بەرگێکی خۆماڵیی فارسی بە بەردا دەکات، ئەویش لەبەر ئەوەبێت، کە (فارس) خاوەنی قەوارەی ڕامیاری و دەوڵەتی خۆی بێت، بۆیە بێ سڵەمینەوە هەموو زاراوەیەك وەردەگرێت. ئەمە تەواو پێچەوانەی نەتەوەی کوردە، کە دەبێت زۆر بەئاگاوە زاراوەی بێگانە وەربگرێت، چونکە زمانی کوردی هەندێ جار ناچار دەبێت زاراوە لە زمانەکانی ترەوە وەربگرێت، چونکە ئەگەر زاراوەیەك لە کۆمەڵێکدا بۆ بیروباوەڕێکی تایبەتی دانرابوو، یاخود لە گەلێکدا بۆ ناوی شتێکی داهێنراوی سەر بە ئەو سازکرابوو، گەلانی دیکە بەهۆی ڕێبازی وەرگرتنەوە دەتوانن قەرزی بکەن و لە زمانەکەیاندا بەکاری بهێنن[1]، بۆ نموونە زاراوەی (الزکاە، الحج، الکفر...هتد)ی عەرەبی زاراوەیەکی سەربەخۆن بۆ واتا تایبەتییەکان و هیچ زمانێکی تر ناتوانێ زاراوەی خۆی بۆ گەیاندنی واتا تایبەتییەکانی ئەو زاراوانە ساز بکات، بۆیە کە نەمانتوانی زاراوەیەکی کوردی پەتی بەرانبەر بەو زاراوانە دابنێین، دەبێت لە ڕێگەی وەرگرتنەوە ئەو کەلێنە بگرین. وەرگرتنیش هەروەکو چۆن کارێکە کە تاکەکەس ئەنجامی دەدات، بە هەمان شێوە دەزگا زانستییەکانیش ئەنجامی دەدەن، وەکو کۆڕی زمانەوانی و زانیاری و ڕاگەیاندنەکان و سەرجەم بوارەکانی دیکەی زانیارییش.

وەرگرتنی زاراوەش زۆربەی جار لە بەر پێویستییە یان دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی سەرسامبوون و کاریگەری ئەو زمانەی کە زاراوەی لێ وەردەگیرێت،

---

[1] د. کامل بەصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٥٠.

به تایبەتی ئەو کەسانەی کە جگە لە زمانی دایك فێری زمانی دیکەش دەبن[٢]، ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕان لەو زمانەدا و تێکەڵکردنی زاراوەی ئەو زمانە لەگەڵ زمانە ڕەسەنەکە خۆیدا، چونکە هەندێ جار گۆڕانی زمان بۆ کاریگەری دوو زمان یان زیاتر لەسەر یەکتری دەگەڕێتەوە، ئەوانەی فێری زمانێکی بێگانە دەبن، دیارە بەر لەمەش زمانی دایکی خۆیان دەزانن، یان زمانی دووەم بە تەواوی فێر نابن یان زمانەکەی خۆیان دەگۆڕێ[٣]، ئەمەش لە زمانەوانیدا بە یەکێ لە هۆکارەکانی گۆڕانی زمان بە (تیۆری دایك) لە قەڵەم دەدرێت. هەموو مرۆڤێك شانازی بە بنەچە و زمانی خۆی دەکات و حەز دەکات پێی بنووسێت و بخوێنێتەوە و پێشی بخات و پەرەی پێ بدات و مافی خۆشێتی ئەگەر هات و ئەو زمانەی دەوڵەمەندکرد بە وەرگرتنی وشەی بێگانە، ئەوانەشی زمانێکی تر بە چاکی دەزانن لە کاتی قسەکردن و نووسیندا وشەی زمانەکەی خۆی لێ فڕێ نادات بە پێچەوانەی ئەوەی کە کاتێ بە زمانەکەی خۆی قسە دەکات چەندین وشەی ئەو زمانەی تێدا بەکاردێنێ، بۆ نموونە لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا، ئەو نووسەر و کتێب دانەرە فارسانەی، کە بە چاکی فێری زمانی عەرەبی ببوون و جگە لە زمانی فارسی بە زمانی عەرەبیش دەیاننووسی، لەو نووسینانەدا کە بە زمانی فارسی دەیاننووسی، چەندین وشە و زاراوەی عەرەبییان بەکاردەهێنا، بەڵام پێچەوانەکەی

---

[٢] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل١٣٠.

[٣] محمد معروف فتاح، زمانەوانی، ل١٠٤.

وانەبوو[1]، نەك هەر ئەمەش چەندین هۆکاری تریش هەیە وەك مێژوویی، کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، ئاینی... هتد، ڕوو دەدات. مرۆڤیش کاتێ وشەیەکی بێگانە وەردەگرێ هەوڵدەدات لەگەڵ زمانە ڕەسەنەکەی خۆی بیگونجێنێت و بەرگێکی خۆماڵیی بە بەردا بکات، بۆ وێنە ئێستا لە زمانی کوردیدا وشەی بێگانەی بەکار هاتوو زۆر هەیە و ئاسان نییە بتوانرێت وازیان لێ بهێندرێت و تەنانەت ئەگەر هاتوو زاراوەیەکی کوردی ڕەسەنیش بەرانبەری بدۆزرێتەوە، بۆ نموونە وشەیەکی وەك (عشق)ی عەرەبی کاتێ کە گوێت لێی دەبێت هەست دەکەیت گوێت لە وشەیەکی کوردی دەبێت، لەبەر بەکارهێنانی لەلایەن کۆمەڵێکی زۆری خەڵکەوە و پەیداکردنی ئاشنایەتی لەگەڵ وشەکەدا، هەروەها وشەی (شاعر)ی عەرەبیش، بە هەمان شێوە، سەرەڕای دانانی وشەیەکی وەك (هۆنیار) و (هەستیار) و (دانیار) بۆ وشەی (شاعر)ی عەرەبی، کەچی تا ئێستاش خەڵکی ئارەزووی بەکارهێنانیان ناکەن... هتد.

هەندێ وشە کە وەردەگیرێت و زۆربەی خەڵکی بەکاریان هێنا، بەئاسانی وازی لێناهێنرێت، چونکە گۆڕانی ئەو زاراوەیە ئاسان نییە و کاتێکی زۆری دەوێت، دیاردەی وەرگرتنیش وەنەبێ هەر تایبەت بێ بە زمانێکی دیاریکراو، بەڵکو لە نێوان هەموو زمانەکانی جیهاندا ڕوو دەدات، لە زمانە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواییەکان و زمانە دواکەوتوو و پێشکەوتووەکانیش هەیە لەبەرئەوەی لەم سەردەمەی ئێستادا، کە سەردەمی شۆڕشی تەکنەلۆژی و ڕاگەیاندن و سەرتاپاگیریی زانست و بە

---

[1] د. ابراهيم انيس، من اسرار اللغة، ل١١٨.

جیهانیبوونە، هیچ نەتەوەیەك ناتوانێ بە گۆشەگیریی و دوور لە نەتەوە و زمانەکانی دیکەی جیهان ژیان بەسەر ببات و لە ناو بازنەیەکی تەسکدا بخولێتەوە.

ئەمڕۆ وەرگرتنی زاراوە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان و زمانە ئەورووپییەکانیش کارێکی ئاساییە، بە ئاسانی کەسانی پسپۆر دەتوانن وشە وەرگیراوەکان لە وشە ڕەسەنەکانی زمانەکە جیا بکەنەوە. فەرهەنگنووسەکان لە فەرهەنگەکانیاندا ئاماژە بۆ وشە وەرگیراوەکان دەکەن و لە وشە بنچینەییەکانی زمانەکە جیایان دەکەنەوە، لەبەرئەوەی زمان هەمیشە لە گۆڕانێکی بەردەوام و بێ وەستاندایە، وەرگرتنیش لە زمانێکی دیاریکراودا بە پێی قۆناغ و سەردەمی ئەو زمانە دەگۆڕێت، بە پێی بواری ڕامیاریی و کۆمەڵایەتی و ئابوریی زمانە پێشکەوتووەکان و چۆنیەتی پێوەندی لەگەڵ زمانە دراوسێ و جیهانییەکان و چەندێتی و ئاستی ئەو پێوەندییە دەگۆڕێت[1]. دەتوانین بڵێین کە دوو جۆر وەرگرتن هەیە:

**یەکەم: وەرگرتن لەبەر پێویستی و ناچاربوون.**

**دووەم: وەرگرتن لە پێناوی خۆ دەرخستن و دەرکەوتن.**

یەکەمیان ئەوەیە کە ژینگەیەك لە ژینگەکان — واتە، شوێنێك— جۆرێکی تایبەتی لە ڕووەکێك وەك، دار یان گوڵ یان ئاژەڵ... یان بابەتێکی جیا خواردن و خواردنەوەی تێدابێت کە لە شوێنی دیکە دەست

---

[1] ابراهيم انيس، من اسرار اللغة، ل١١٨-١١٩.

دەکەوێت، یاخود بیروباوەڕێکی تایبەت بە خۆی یان داهێنانێك هەبێت... جا کاتێ زمانی دووەم هەمان پێویستی بۆ بێتە پێشەوە و ئەو شتانە وەربگرێت، کە لە شوێنە ڕەسەنەکەی خۆیاندان بەکاردەهێنێت، وەك:

١- زاراوەی (Wine)کە هەموو زمانەکانی ئەوروپی لە زمانی لاتینییەوە وەریان گرتووە.

٢- زاراوەی (Tea) ئەم زاراوەیە لە زمانی چینییەکانەوە وەرگیراوە، کاتێ کە چا خواردنەوە لە ئەورووپا پەیدابووە.

٣- زاراوەی (Coffee) لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراوە.

٤- زاراوەی (chocolate) لە زمانی مەکسیکییەوە وەرگیراوە، چونکە چاندنی (کاکاو) لەم وڵاتەدا باوە و هەر لەمەش (شوکولاتە) درووست دەکرێت.

٥- لە زمانی فارسیدا وشەی (یاسمین – Jasmine) وەرگیراوە.

٦- لە زمانەکانی ئەفریقیای ناوەڕاست وشەی (شەمپانزی) وەرگیراوە، ئەم زاراوانە ڕەهەندێکی جیهانییان وەرگرتووە و هیچ نەتەوەیەك لای گران نییە، کە وەریان بگرێت و بەکاریان بێنێت[1]، هەروەها هەندێ نەتەوە کە ئاستی ڕۆشنبیری و زانیارییان لە ئاستێکی نزمدابێت، هەوڵ دەدەن وشە و زاراوە لە زمانی نەتەوەیەکی ترەوە وەربگرن و لە کۆن و تا ئێستایش لە ئارادایە.

دووەمیان: ئەوەیە هەندێ جار وەرگرتنی زاراوە لەبەر پێویستی و ناچاربوون نییە، بەڵکو لە ڕوانگەی خۆدەرخستن و دەرکەوتنەوە دێتە نێو

---

[1] ابراهيم انيس، من اسرار اللغة، ل١٢٠-١٢١.

زمانی خۆماڵی، یاخود له ئەنجامی زۆرکارتێکردنی نەتەوەیەك لە نەتەوەیەکی تر، یان حەزکردن بە لاساییکردنەوەی زۆربەی دیاردە و بوارە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو نەتەوەیە کە یەکێکیان زمانە[٢]، هەروەك چۆن ئێستا لە کەناڵ و میدیا و گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا دەبینین کۆمەڵێك نووسەر لە ڕوانگەی خۆ بە ڕۆشنبیرزانینەوە، چەند زاراوەیەکی بیانی بەکاردێنن بۆ نیشاندنی ئاستی ڕۆشنبیریی خۆیان، تا وای لێ دێت وشە خوازراوەکە هەندێ جار شوێنی وشە خۆماڵییەکە تەنگ دەکات و جێگەی پێ چۆڵ دەکات، لەم ڕوانگانەوە دەتوانین بڵێین، وشەی وەرگیراو بریتییە لەو وشەیەی کە زمانێك لە زمانێکی دیکەوە وەریدەگرێت، هەروەها پێشیدەوترێ خوازراو[١]یان خواستن: وەرگرتنی وشەیەك لە زمانێکەوە لەلایەن زمانێکی دیکەوە.

خواستن دیاردەیەکی مێژوویی و کولتووری و سیاسی جیهانییە[٢]. جا ئەگەر ئەم وەرگرتنانە هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نەیەت پێیان دەوترێت (هاوردە)، وەك: ئیمەیل، ئینتەرنێت، قەدەر، وەهم، کۆمپیوتەر...، بەڵام ئەگەر بە پێی سازگەی زمانی دووەم گۆڕانیان بەسەردا هات و کەوتنە ژێر ڕێزمان و فۆنەتیکی ئەو زمانە، پێیان دەوترێت (کوردێنراو) یان (گونجێنراو)، وەك، زاراوەکانی: سەروەت – سات – کەوسەر – فەلسەفە – ... هتد.

---

[٢] هەمان سەرچاوە، ل١٢١.

[١] د. محمد علی الخولي، معجم علم اللغة النظري، ل١٥١.

[٢] د. کەمال میراودەلی، فەرهەنگی ڕێزمانی کوردی، ل١٣٥.

# زمانی کوردی و چۆنێتی زاراوە وەرگرتن

زمانی کوردییش وەك هەموو زمانەکانی تری جیهان لە هەندێ بارودۆخدا پەنا دەباتە بەر وەرگرتنی وشە و زاراوە لەزمانەکانی ترەوە و لەبەر نەبوونی زاراوە بۆ گشت بەشەکانی زانست ناچار دەبێت ئەو کارە بکات، بۆیە لێرەدا ئەگەر نەتوانرا بۆ زاراوەیەکی زانستی وشەیەکی کوردی ڕەسەن دابنێین، دەبێت سوود لە وەرگرتنی زاراوە لە زمانی دیکەدا ببینین و لەسەر ڕووی زەمیندا هیچ زمانێك نییە کە زمانی بێگانە کاری لێ نەکردبێ، یاخود کاریگەری زمانی بێگانەی لەسەر نەبێ. هەروەها هیچ گەلێك یاخود هەڵگری هیچ زمانێك بە ڕەهایی و بە شێوەیەکی تایبەتی و جیاواز و دوور لە گەلان ناژی[1]، جا لەم بارەدا هاتنی زاراوە یان وەرگرتن لە هەندێ کاری زۆر پێویستیدا و بە شێوەیەکی کەم و بە ئاگادارییەوە زیانێکی زۆر بە زمانەکە ناگەیێنێت، بە وێنە زمانی عەرەبی سەرەڕای ئەوەی قورئانی پیرۆز توانیویەتی هێز و تینێکی زۆری بداتێ و لە هەموو هۆکار و کاری دەرەکی بیپارێزێت، لەگەڵ ئەوەشدا چەندان وشەی لە

[1] د.ئەورەحمانی حاجی مارف، بەرهەمە زمانەوانییەکانم (نووسین و وەرگێڕان)، بەرگی سێیەم (وتار و لێکۆڵینەوە) لەگەڵ پاشکۆیەك، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل١٠٣.

زمانەكانی ترەوە وەرگرتووە و، زمانی فارسییش بە سەدان وشەی لە زمانەكانی ترەوە بۆ خۆی گواستۆتەوە...هتد.

كەواتە هیچ زمانێكی نەتەوەیی نییە سوودی لە زمانە جیاوازەكانی دیكەی گەلانی جیهان وەرنەگرتبێ. وەرگرتنی زاراوە هۆكاری زۆرە، وەكو ئەوەی لە لایەن نەتەوەی باڵادەستدا بسەپێنرێ یان زمانی وڵاتانی پێشكەوتوو لە بواری زانست و تەكنەلۆژیا و داهێنان، زاراوەگەلێك بسەپێنێتە سەر زمانی نەتەوەكانی دیكە[١].

وەرگرتنی زاراوەش هەروا كارێكی ئاسان نییە، بەڵكو دەبێت لە ڕێگەی چەند بنەمایەكی واتایی و زاراوەسازی جێبەجێ بكرێن، لەوانە:

١- بۆ ئەوی زاراوە وەرگیراوەكە بچێتە ناو زمانە نوێیەكەوە، وەك وشەی خۆماڵیی هەڵسوكەوت بكات، دەبێ لەگەڵ دەستووری زمانە نوێیەكەدا بگونجێنرێت[٢].

٢- هەر زمانێك دەستووری زاراوەسازیی و زمانەوانیی تایبەتی خۆی هەیە، بۆیە كاتێك زاراوەیەك وەردەگرین دەبێ دەنگەكانی بخەینە ژێر كارتێكردنی فۆنەتیكیی زمانی كوردییەوە و بەرگێكی خۆماڵی بە بەردا بكەین[٣]، وەك وشەی (تەواو)، (دەوڵەت)، (وڵات)... كە لە عەرەبییەوە هاتوون، وشەی (خەبات)، (خشڵ)، (ناتر)...كە لە سریانییەوە هاتوون،

---

[١] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی كوردی، ل١٣٨.

[٢] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی كوردی، ل١٣٨-١٣٩.

[٣] جەمال نەبەز، زمانی یەكگرتووی كوردی، ل٧٦.

وشەی (خاکەناز)، (مەگریت)، (نیرمیخ)...کە لە ئەرمەنییەوە هاتوون، وشەی (سنوور)، (تەلیسم)، (مەستوور)... کە لە یۆنانییەوە هاتوون، وشەی (پاپۆڕ)، (وەردیان)... کە لە فارسییەوە هاتووون، وشەی (پانتۆڵ)، (نمره)...کە لە ئیتاڵییەوە هاتوون[1].

٣- ئەگەر زاراوەیەك لە ناو کۆمەڵێکدا بۆ بیروباوەڕێکی تایبەتی یان داهێنراوێکی سەربەخۆ سازکرابوو، ئەوا دەکرێ زمانی کوردی، وەکو خۆی بەبێ ئەوەی دەنگەکانی بگۆڕێت وەریبگرێت و لە زمانەکەیدا بە کاری بهێنێت، بە مەرجێك بە ڕێنووسی زمانەکە خۆی بنووسرێت[2].

٤- ئەگەر وشەیەکی خۆماڵی و بێگانە شان بە شانی یەك لە زمانی کوردیدا هەبوون دەبێ کوردییەکەیان بکەینە زمانی ئەدەبی، بۆ ئەمەش لە هەر دیالێکتێك وەرگیرابێ گرنگ نییە، بۆ وێنە ((زیاتر)) و ((پتر))، ((بەگوێرەی)) و ((بەپێی))، ((حەمام))، ((گەرماو))[3]... هتد.

جگە لەم یاسایانەی باسکران، چەند بنەمایەکی تایبەتی واتایی و زمانەوانی هەیە لە وەرگرتنی زاراوەدا دەبێت ڕەچاو بکرێن:

١- راوەی بێگانە چونکە بۆ واتایەکی تایبەت یاخود بۆ داهێنراوێکی دەستنیشانکراو لە زمانە ڕەسەنەکەیدا سازکراوە، دەبێ لە زمانی کوردیدا بە وردی بەرانبەر بە هەمان واتا بەکاربهێنرێت و، بە پێی دەستکاری واتاکەی بۆ هەمان شتی داهێنراو ناو ببرێ، هەندێ جاریش لادان لەم

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٧٧.

[2] ڕۆژان نووری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل١٣٩.

[3] جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ل٧٧.

دەستووره ڕوو دەدات و لەگەڵ ڕێباز و یاساکانی وەرگرتن ناگونجێت، وەك وشەی (بەلووعە)کە لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراوە، بە پێچەوانەی واتاکەی بەکار دێت، (بەلووعە) لە عەرەبیدا بە واتای (زێراب) دێت، بەڵام لە کوردیدا وەك وشەیەك بۆ واتای (الحنفية)ی عەرەبی بەکاردێت[1].

٢- زاراوەی وەرگیراو بەرهەمی درەختی زمانەکەی خۆیەتی و لە دەرفەتی کۆمەڵایەتی و ئابووری و دەروونی ئەو گەلەوە هەڵقوڵاوە کە دایهێناوە و سازی کردووە، هەندێ جار بەهۆی پەیڕەوی نەکردنی ئەم بناغەیەوە هەندێ زاراوە بە هەڵە لە زمانەکەماندا بەکاردێن، بۆ نموونە زاراوەیەکی وەك (قوتابی) کە زاراوەیەکی عەرەبییە و وەرمانگرتووە لە ڕێگای هەندێ گۆڕان و بە پێچ و پەناوە بە دەستمان هێناوە. (قوتابی) لە (الكتاب)ی عەرەبی وەرگیراوە و لە زمانی تورکیشدا بە سێ هەنگاو سازکراوە: یەکەم — دەنگی (ك) کراوە بە (ق)، دووەم — لەو دوو(ت)ە، یەکێکیان فڕێ دراوە، سێیەم — دەستکاری کردنی واتای (کتاتیب)ی عەرەبی دەستکاری کراوە و لە واتای فەقێیی حوجرە و بۆ واتای خوێندکاری فێرگە و زانکۆ پەرەی سەندووە. هەروەها زاراوەی تریش[2] لەوبارەوە هەیە.

٣- هەموو زمانێك لە سازکردن و داڕشتنی وشەدا فۆنەتیك و دەستووری تایبەتی خۆی هەیە، بۆیە هەر وشەیەك کە وەردەگیرێت دەبێت دەنگەکانی بخەینە ژێر کارتێکردنی فۆنەتیکی کوردی و دەستووری

---

[1] د.کامل حسن بصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٥٢.

[2] د.کامل حسن بصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل ٥٢، ٥٣، ٥٤، ٥٥.

وشەسازیی کوردییەوە و بەرگێکی خۆماڵییان بە بەردا بکەین، وەك وشەی (قلم) کە کراوە بە (قەڵەم)، واتا (ل)ەی سووکەکەی گۆڕاوە بۆ (ڵ). چەند زمانێك هەن بە پێی هۆکاری زۆر: (دراوسێیەتی، نزیکیی، ئایین، بازرگانیی، ژنهێنان...) کاریگەرییان لەسەر زمانی کوردی هەیە، کە بریتین لە زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی و، سەرەنجام زمانی کوردی زاراوەیان لێ وەردەگرێت.

## أ- وشە و زاراوەی عەرەبی:

هەڵبەتە پێوەندیی کورد بە نەتەوەی عەرەبەوە شتێکە کۆنە و لە سەر بناخەیەکی ئایینی و ڕۆشنبیری و سیاسیی و ئابووریی پتەو چەسپاوە و هەردوو لا وشەیان لە یەکترییەوە وەرگرتووە و لە زمانی کوردیدا زۆر وشە هەیە، کە لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراون[1] هۆیەکانیشی لەسەرەوە باسکران. زاراوە و وشەی عەرەبیش بە پێی چەند بناخەیەك هاتوونەتە نێو زمانی کوردییەوە:-

١- وەرگرتنی زاراوەی عەرەبی بەبێ دەستکاری، ئەمانەش کۆمەڵێ زاراوە و وشەن، کە لە لای کورد بۆ ناوی ئەو شت و دیاردانە بەکار دەهاتن، لە لایەن خەڵکییەوە وەکو خۆیان بەبێ دەستکاری، خۆیان بەسەر فەرهەنگی زمانی کوردیدا سەپاندووە، وەك: (زەکات، حەج، شێخ، غەفوور...).

---

[1] د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، ل٤٢.

٢- بە کوردیی کردنی یەکێك یان زیاتر لە دەنگەکانی زاراوە عەرەبییەکە. وەك ئەوەی لە وشەی (کتاب)ی عەرەبی ڕوویداوە بە گۆڕینی پیتی (أ)بە پیتی (ێ)ی کوردی و بووە بە (کتێب) زۆرینەی خەڵکی بەکاری دەهێنن و تەنانەت گەر زاراوەیەکی تریشی بۆ دابڕێژرێت هەر وا بە ئاسانی خەڵکی واز لە وشەی (کتێب) ناهێنن، ئەگەر وازیشی لێبهێنن ماوەیەکی زۆری دەوێت، وەك ئێستا هەندێك وشەی (پەرتووك) بەکاردێنن.

ئەم ڕێگایانە نەك لە زمانی کوردی، بەڵکو لە گشت زمانەکاندا هەن و لە زمانی ئینگلیزی پێی دەوترێت (ترانس لەتەرەیشن — Transliteration) و لە زمانی عەرەبی بە (التعریب) ناو دەبرێت و لە زمانی کوردیش بە (بەکوردی کردنی زاراوە) ناو دەبرێت، هەر وشەیەکیش گەر هاتە نێو زمانی کوردی دەبێت لە ڕووی وشەسازی و فۆنۆلۆژی و ئۆرتۆگرافییەوە بچێتە ژێر ڕکێفی دەستووری زمانەکەمان بۆ، نموونە:

ثروة = سەروەت

آثار = ئاسار

فرصة = فرسەت

خلاص = خەڵاس

ظالم = زاڵم

ظروف = زەرف (زرووف)

الأن = ئەلعان

العربة = عەرەبانە

المعذرة = عوزر

... هتد.

ئەم جۆرە دەستکارییە، هەندێ جار وادەکات وشە عەرەبییەکە تەنگ بە وشە کوردییەکە هەڵبچنێ، بەڵکو هەندێ جار شوێنیشیان دەگرێتەوە، هەندێ وشەش هەن گەربێت و لە ڕێی لێکۆڵینەوەی زمانەوانی نەبێت، ناتوانین هەست بەوە بکەین کە ئەم وشانە عەرەبی بن، وەك:

مشعل = مەشخەڵ

خدمة = خزمەت

طعم = تام

... هتد.

٣- بەشێك لەو وشە عەرەبییانەی هاتوونەتە نێو زمانی کوردی، بۆ هەمان واتا وشەی کوردیی ڕەسەن بەرانبەریان هەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هاتوونەتە نێو زمانی کوردییەوە، وەك: (فەقەرە، ئەرز، فیکر، دیراسات، عیلاج، عەقڵ، دەماغ، فەقیر...) کە لە زمانی کوردیدا (بڕبڕە، زەوی، بیر، توێژینەوە، چارەسەر، ئاوەز، مێشك، هەژار...) بەکاردێت.

٤- زۆربەی ئەو وشە عەرەبییانەی کە ناوی مرۆڤن، هاتوونەتە نێو زمانی کوردی بە پێی دەنگسازیی کوردی گۆ دەکرێن و بە پێی ڕێنووسی کوردی دەنووسرێن، وەك:

عثمان = عوسمان

آمينة = ئامینە

خديجة = خەجێ

ظاهر = زاهیر

... هتد.

٥- موتوربەکردن:

واتە درووستکردنی زاراوەیەکی کوردی بە وشەیەکی کوردی و وشەیەکی عەرەبی، وەك (الاتمام، التركيب الاضافي، الشخصية المعنوية) کە بە (تەواوکردن و لێکدانی ئیزافی و کەسیەتی مانایی) وەرگێراون و کراون بە زاراوەی کوردی.

٦- وەرگێڕانی زاراوەی عەرەبی:

لە کاتی وەرگێڕانی زاراوەی عەرەبی، دەبێت چەمکی زاراوەکە لەبەرچاو بگیرێت و بەهەڵە وەرنەگێڕدرێت، وەك ئەوەی لە وشەی (المظاهرة)وە، وەرگێڕاوە، و(ظاهرَ)یش بە واتای (پشتگرتن) هاتووە، عەرەب دەڵێت: (ظاهر فلان فلانا أي سند ظهره و وازره) کەچی وەرگێڕی کوردی وای زانیوە وشەی (المظاهرة) لە فەرمانی (تظاهر)ەوە، هاتووە بۆیە واتاکەی بە وشەی (خۆپیشاندان) دەربڕیوە.

٧- داتاشینی زاراوەی کوردی بەرابەری زاراوەی عەرەبی، بۆ نموونە وشەی (زانکۆ)کە لە رەگی چاوگی(زانین) و وشەی (کۆ) داتاشراوە، وشەی (کۆ)یش ئەوە دەسەلمێنێ کە داتاشەری زاراوەی زانکۆ چاوی لە زاراوەی (الجامعة)بووە، چونکە(الجامعة) ناوی بکەری فەرمانی(جمع)ەیە[*]، ئەمە

---

[*] لەم بارەیەوە بڕوانە:

لە لایەك لە لایەكی تریشەوە شێوەی پێكهاتنی بەهەڵە دارێژراوە، چونكە لەم وشەیەدا ڕەگ پێش ناو كەوتووە، كە ئەمەش لە زمانی كوردیدا نابێت، چونكە ئەو ڕێگایانەی وشەی لێكدراویان پێ پێكدێت هیچ كامیان باسی ئەوە ناكەن كە (ڕەگ) پێش (ناو) بكەوێت بەڵكو دەبێت (ناو) پێش (ڕەگ) بكەوێت، وەك:

زمان + بڕ (ناو + ڕەگ) = زمانبڕ.

یاری + زان = یاریزان.....

كەواتە ناتوانین بڵێین:

بڕ + زمان = بڕزمان

زان + قسە = زان قسە...

---

أ- د. كامل بصیر، زمانی عەرەبی و كێشەی زاراوەی كوردی، گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد، بەرگی دووەم، بەشی یەكەم، بەغدا،١٩٧٤، ل٧٥٨- ٧٦٤.

ب- د.كامل حسن البصیر، زاراوەی كوردی هەڵسەنگاندن و لێكۆڵینەوە، ل١٢، ١٢٨-١٢٩، ١٣٠، ١٣٤.

پ- ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی كوردی، ل١٤٢- ١٤٨.

ت- دەستەی كورد، ڕێنووسی كوردی بە پێی بڕیارەكانی كۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٧، ل١٢٣.

## ب- وشە و زاراوەی فارسی:

زمانی کوردی بە گوێرەی ئەوەی سەر بە بنەماڵەی زمانی هیند و ئەورووپاییە و لەگەڵ زمانی فارسیدا لە بنەڕەتدا لەیەك سەرچاوەوە هەڵقوڵاون و لەیەك گرووپە زمانن، دەبینین گەلێ وشەی هاوبەش و لێك نزیك لە هەردوو زمانەکەدا هەیە، لە ڕووی ڕووخسار و واتاوە وەك یەك وان و یەك شت دەگەیەنن، بۆیە بەتەواوی ناتوانرێت پێ لەسەر ئەوە دابگیرێت کامیان کوردین و کامیان فارسین، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مێژووە دوور و درێژەی کە ئەم دوو گەلە لە تێکەڵاویدا هەیان بوون، بۆ وێنە وشەی (سروشت)، (نماییش)، (وەرزش)، (نایاب)، (ئەندێشە)، (باڵوێز)[1] زۆر ئاساییشە کە لە نێوان ئەو دووزمانەدا وشەی هاوبەش هەبێت لەبەرئەوەی دەچنەوە سەر یەك گرووپە زمان و ڕەچەڵەکێکی هاوبەشیان هەیە، بۆیە بڕیاردان کارێکی ئاسان نییە و پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ و چوونە ناو مێژووی زمان و مەلەکردنی لە بواری لیکسیکۆلۆژی و ئیتۆمۆلۆژیی دەوێت، وەك: (ئاهەنگ، ئاشنا، سەنگ، سوپا، سروود، سەربەست، شیرین، ڕەنج، درەخشان...)، وشەی هاوبەشیش مەرج نییە هۆیەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سەر بەهەمان گرووپە زمان بێت، بەڵکو وابووە لە نێوان دوو زمانی جیاوازیش وشەی هاوبەش هەبووە، وەك لە نێوان زمانی کوردی و عەرەبی، هۆیەکەشی بۆ ئایین و پێکەوەژیان و بازرگانی و سنووری دوو نەتەوەکە و هۆکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیری... هتد، دەگەڕێتەوە، وەك: (سیما، مروەت،...).

---

[1] د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، ل٤١.

## پ – وشه و زاراوەی توركی له زمانی كوردیدا:

هەروەك چۆن زمانی كوردی لەگەڵ زمانەكانی عەرەبی و فارسی وشەی وەرگرتووە و وشەی هاوبەشی تێدابووە بە هەمان شێوە و بە هۆی دراوسێیەتی و تێكەڵاوی كورد و هاوسنووریی لەگەڵ زمانی توركیدا، گەڵێ وشە و زاراوەی توركی كەوتۆتە نێو زمانی كوردییەوە، وەك (قاپی، قەرەباڵغ، مەعین، یاپراخ...) هەروەها هۆیەكی تری وشەی بەكارهاتووی توركی لە زمانی كوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵات، واتە، ئەو كاتەی عوسمانییەكان بۆ ماوەی چەندین سەدە بە ناوی ئیسلامەتییەوە دەوڵەتی عوسمانییان دامەزراند، كوردستانیش بۆ ماوەیەكی زۆر لەژێر حوكمڕانی ئەواندابووە، هەروەها هەندێ جاریش هۆی بڵاوبوونەوەی زاراوە یان وشە دەگەڕێتەوە بۆ ناكۆكی و كێشەی زمانێك لەگەڵ زمانێكی دیكە، یان چەند زمانی تر و زمانێك توانی بەسەر چەند زمانێك زاڵبێت، هەروەها كەسانی گەلێك بەهۆی داگیركردن و ئاوەدانی دوور لە نیشتمانی خۆیان بەمەش زمانەكەیان بڵاو دەبێتەوە و خەڵكان قسەی پێ دەكەن[1] و تا ئێستاش گەر چاوێك بە كۆمەڵێ ناوی، وەك: (قەرەتەپە، قەرەداغ، قوشتەپە، قەرەهەنجیر، كۆپری، بیراڵك[*] و...)، دەیان ناو و وشەی تریش

---

[1] د. علي عبدالواحد وافي، علم اللغة، الطبعة السابعة، القاهرة، ١٩٧٣، ل١٧٠.

[*] بیراڵك: گوندێكە نزیك گوندی (كارێز)ی سەر بە ناحییەی (شوان)ی پارێزگای كەركووكە.

بگێڕین دەبینین هۆیەکەی بۆ (هۆکاری داگیرکردن)ی کوردستان لەلایەن عوسمانییەکانەوە دەگەڕێتەوە، کە پێویستە ئەگەر زاراوە و وشەی گونجاومان هەبوو بەرانبەر ئەوانە، هەوڵبدرێت وشە کوردییەکان بەکاربێنین، بۆ ئەوەی زمانەکەمان لە وشەی بێگانە پاك بکەینەوە.

## ت- زاراوەی جیهانی:

نەك هەر لە زمانی کوردیی، بگرە لە سەرجەم زمانەکانی جیهاندا کێشەی زاراوەی جیهانیی هەیە، چۆن وەربگیرێت و چۆن بگۆڕدرێت و وەربگیرێت بەبێ گۆڕان، ئەگەر گۆڕراش بە چ ڕێبازێك دابڕێژرێت. ئەم کێشانەش لەچەند پرسیارێکدا خۆیان دەنوێنن، ئایا بوونی ئەو زاراوە جیهانییە لە زمانەکەماندا پێویستە؟ ئەگەر پێویست بوو تا چ کاتێك بمێنێتەوە؟ ئایا مانەوەیان هەمیشەییە یان کاتی و قۆناغییە؟ بۆ وەڵامدانەوە سەرەتا دەبێ پێناسەیەکی زاراوەی جیهانی بکرێت کە: واژەیەکە ئەمڕۆ لە لایەن نەتەوە پێشکەوتووەکانەوە بۆ یەك واتای زمانی و تاقە مەبەستێکی شارستانی، یاخود ڕۆشنبیری و دەربڕینی ئەرکێکی یەکگرتوو بەکاردەهێنریێ[1]، وەك: (تەلەفۆن، سەتەللایت، مایکرۆفۆن، سی دی...) کە هەموو کەس لێی دەگات و دەزانن بۆ چی بەکاردێت، ئەمەش تایبەتییەکی گرنکیی زاراوەیە. لێرەدا دەبێت ئەوە بلێین بۆ دەبێت لە هەموو زمانەکانی جیهاندا وەك یەکبن و گشت کەسێکیش تێی بگات؟ هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا ئەو جۆرە

---

[1] د. کامل بصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل١١٤.

داهێنانە نییە و لە زمانەکانی تردا ئەو داهێنانە بە ناوی کەسانی درووستکەرەوە، دانراوە، نزمبوونی ئاستی ڕۆشنبیری و کاری زانستی... لەنێو هەندێ لە قسەکەرانی زمانەکانی جیهاندا، بێجگە لەمەش هۆکاری هەبوونی زاراوەی جیهانی لە زمانی کوردی و زۆربەی زمانەکانی تر دەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵانە:

١- زۆربەی زاراوە جیهانییەکان ئەو وشانە دەگرنەوە کە لە بنەڕەتدا ئەغریقی و ڕۆمانی کۆن و دێرینن وەك (فەیلەسووف و تراجیدیا و کۆمیدیا و دیکتاتۆر و دیموکراسی...).

٢-بەشێکی تری زاراوە جیهانییەکان ئەوانەن کە پێوەندییان بە گۆڕانی ژیانی مادیی و ئابووریی و سەردەمی شۆڕشی پیشەسازی ئەورووپییەوە هەیە و لەگەڵ ئەو پێویستییە زانستیانە هاتوونەتە کایەوە کە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا داهێنراون[1]، وەك (پاسکیل، تەلەفزیۆن، ئۆتۆمبیل، ئەکتەر....).

٣- ئەمڕۆش لەنێو نەتەوە پێشکەوتووەکانی جیهاندا کاتێك شتێك دەدۆزرێتەوە یان مەبەستێك دادەهێنرێ سەرەنجام بە زمانی ئەو نەتەوەیە زاراوەیەك بۆ مەبەستە داهێنراوەکە یان شتە دۆزراوەکە سازدەکرێت[2]، دەبێت بە زاراوەیەکی جیهانی، بەڵام گەر هاتوو بەرانبەر زاراوە جیهانییەکە زاراوەی کوردیی ڕەسەن و گونجاومان هەبوو، پێویست ناکات پەنا بەرینە

---

[1] د. کامل بصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل١١٥-١١٦.

[2] رۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل١٥٢.

بەر زاراوەی تر، بە تایبەتی زاراوەی جیهانی، بۆ ئەوەی زمانەکەمان نەشێوێنین، بۆ نموونە تا ئێستاش زاراوەیەکی وەك (مۆرفۆلۆژی) بەکاردێنین لە بری زاراوەی (وشەسازی) یان (سینتاکس) لە جیاتی (ڕستەسازی) و دەیان وشە و زاراوەی تریش، بۆیە دەبێت هەوڵبدەین واز لەو زاراوە جیهانییانە بهێنین و بەکاریان نەهێنین.

وەرگرتنی زاراوەی جیهانیی سوود بە فەرهەنگی زمانەکەمان دەگەیەنێت و دەوڵەمەندی دەکات، چونکە ئێمە ناتوانین باس لە پێشکەوتن و زانستەکانی سەردەم نەکەین، چونکە زاراوەی پێویست بۆ ئەو بابەتانە لە زمانەکەماندا دەست ناکەوێت[1]. وەرگرتنی زاراوەی جیهانییش مەرجی تایبەتی خۆی هەیە و بە پێی دەستوور ئەنجام دەدرێت، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر هاتوو لە زمانی کوردیدا وێنەیەکی پڕاوپڕی مەبەست و واتای زاراوەیەکی جیهانی نەبوو، دەبێ ئەو زاراوە جیهانییە وەربگرین و پێویست بەوە ناکات وشەی نابەجێی وای بۆ درووست بکەین، کە لەگەڵ مەبەستەکەیدا نەگونجێت و نەتوانێ واتاکەی بە تەواوی بگەیەنێ، بەڵام ئەگەر وشەی ڕەسەنی کوردی وامان هەبوو پێویستە وشە کوردییە ڕەسەنەکە لەبەر تیشکی یەکێك لە ڕێبازەکانی سازکردنی زاراوەدا بکەین بە زاراوەیەك و لە بری زاراوە جیهانییەکە بەکاری بهێنین[2]. سەرەڕای ئەوەش بیروبۆچوون و ڕای جیاواز لە بارەی زاراوەی جیهانییەوە زۆر هەیە،

---

[1] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل٢٥٣.

[2] د.کامل بصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل١١٦-١١٧.

هەندێك وای بە باش دەزانن کە زاراوەکە وەکو خۆی بێ دەستکاری وەربگیرێت و هەندێکی تر وای بە باش دەزانن بە دەستکارییەکی کەمەوە وەربگیرێت و لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ زاراوەی جیهانی هەیە لە بەرانبەریدا زاراوەی ڕەسەنی کوردی هەیە، بەڵام خەڵکەکە بەکاریان ناهێنن و حەزیان پێ ناکەن، وەك وشەی (ئەسپە ئاسنین) کە نەیتوانیوە وەك زاراوەیەك شوێنی زاراوەی جیهانی بگرێتەوە... هتد.(*)

## پێنجەم: ڕێگای داتاشین (کورتکردنەوە) -نحت واختزال - Blends

داتاشینیش ڕێگەیەکی تری دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمانی کوردییە، بەڵام بە ڕێگەیەکی سەرەکی دانانرێت، لەگەڵ ئەوەشدا لە پێکهێنانی زاراوەدا کاریگەریی خۆی هەیە. گەر تێبینی هەندێ وشەی کۆن و نوێی زمانەکەمان، وەك وشەی (دەستاڕ) بکەین ئەم ڕاستییەی خوارەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

١- ئەم وشەیە بە ڕواڵەت لە دوو وشە پێکهاتووە، وشەی (دەست) و چاوگی (هاڕین).

٢- وشەی (دەست) وەك خۆی ماوەتەوە و پاشان لە چاوگی (هاڕین) ڕەگی (هاڕ) وەرگیراوە.

---

(*) هەر لەبارەی زاراوەی جیهانی و سوود و گیروگرفتەکانی، بڕوانە:
– محەمەدی مەلاکەریم و کەمال جەلال غەریب، هەڵبژاردنی زاراوەی کوردی، گۆڤاری (پەروەردە و زانست)، ژمارە (٦)، ساڵی سێیەم، ل٢٩–٥٥.

٣- پاشان دەنگی (ه)ی ڕەگی (هاڕ) تێچووە و نەماوە پاشان وشەی (دەست) و (اڕ) چوونەتە ناویەك و وشەیەکی یەك قەوارەیی (دەستاڕ)ی درووست کردووە، بەمەش دەڵێن داتاشین. هەروەها د.جەمال نەبەز وشەیەکی وەك (کاژمێر)ی بۆ (الساعة – کاتژمێر) پەسندکردووە[1] دوای قرتاندنی دەنگی (ت)ی وشەی (کات)، بەلای ئێمەشەوە لە وشەی (کاتژمێر) وشەیەکی وەك: (کاژێر) داتاشین لە وشەی (کاتژمێر) بۆ وشەی (الساعة) لەوانەیە گونجاوتر و لەسەر زمان سووکتر بێت.

زۆرجار ئەو وشانەی بەشداری لە لێکدانی وشەیەکی لێکدراو دەکەن، دەنگێك یان زیاتر لە دەنگێك دەقرتێندرێت و دوایی لێکدەدرێن و زاراوەیەکی نوێ پێکدەهێنن بە زاراوەی داتاشراو ناودەبرێت و بە ڕێبازەکەشی دەوترێت (ڕێبازی داتاشین).

لە ژێر ڕووناکایی ئەوەی باسکرا، دەتوانین چەند پێناسەیەکی داتاشین بکەین:

- درووستکردنی وشەیەك لە دوو وشەی سەربەخۆ یان زیاتر، بەمەرجێك هاوئاهەنگی لە بێژە و واتای نێوان وشە داتاشراوەکە و هەردوو وشە یان زیاتر لە وشە لێداتاشراوەکان هەبێت[1]، وەك:

کانی + ئاسکان = کانێسکان

ڕێگە + زمان = ڕێزمان

---

(١) د.جەمال نەبەز، زاراوەی لیژنەی (ریاضیات) لەژێر وردبینی لێکۆڵینەوەدا، گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)، ژمارە (٦)، ل١٠٦.

(١) د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ل١٢٠.

بایز + ئاغا = بایزاغا

(خورماومێوژ) = خورمژ[٢]...

- ڕێبازێکه بۆ سازکردنی زاراوەی نوێباو له دوو وشه یان زیاتر له یه‌کێك له وشه ساده‌کان یان له هه‌ردووکیان پاشان به دانه‌ده‌میه‌کیان و سازکردنی زاراوه‌یه‌کی نوێ له هه‌ردووکیان[(١)(*)] بۆ نموونه:

(شمەك)[(٢)] له (شت) و (مەك)ەوە داتاشراوە، پاش قرتاندن و فڕێدانی دەنگی (ت) له وشەی (شت). یان (گاسن) له (گا) و (ئاسن) داتاشراوە، پاش قرتاندنی دەنگی (ئا) له وشەی (ئاسن). هەروەها (د. محمد علي الخولي) بەم شێوەیە پێناسەی دەکات: blend=amalgam: وشەیەکە لە

---

[٢] ئەنجومەنی کۆڕ، ڕێنووسی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٣، ل٣٧١.

[(١)] د. کامل بصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٦٩.

[(*)] هەروەها لەو بارەیەوە بڕوانە:

أ - د.کامل بصیر، بەراوردکارییەك لە نێوانی زمانی کوردی و زمانی عەرەبیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق (دەستەی کورد)، بەرگی (سیازدەهەم)، ل٣٠.

ب- جەمال عەبدول، بەرکولێکی زانستە زاراوەسازی کوردی، ل١٨-١٩.

پ - ئیبراهیم ئەمین باڵدار، زاراوە و زمان لە کاروانی زانیاری ئەمڕۆدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٢)، ل٢١٩.

ت - عبدالرزاق بیمار، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانەکان، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، ل٢٩٧.

[(٢)] ئەنجومەنی کۆڕ، زاراوەی کارگێڕی، ل٨.

ئەنجامی یەکگرتنی دوو مۆرفیم یان زیاتر پێك دێت، لەگەڵ پاراستنی واتا پێکهێنەرەکانی، وەك (smog) کە لە (smoke + fog) داتاشراوە[1] [*] یان زاراوەی (فێرگە) لە (فێربوون) و پاشگری (گە)ەوە داتاشراوە دوای ئەوەی چەند پیتێکیان لێ قرتێنراوە، جاری واش هەیە پیتیان لێ ناقرتێنرێت و بەر ڕێبازی لێکدان دەکەون و لەم بارەیەوە

---

[1] د. محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري (انكليزي – عربي)، ل٣٣.

[*] هەروەها لە بارەی پێناسەی (داتاشین)ەوە لە هەندێ سەرچاوەی تردا، بڕوانە:

أ- د. ايناس كمال الحديدي، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث، ص٩٥.

ب- د. جلال شوقي، المصطلح العلمي بين الثراء والاغناء، مجلة اللغة العربية الاردني، العدد المزدوج (٤٢-٤٣)،، السنة السادسة عشرة، الاردن، ١٩٩٣، ص١١.

ج- قاسم السارة، تعريب المصطلح العلمي (اشكالية المنهج)، مجلة (عالم الفكر)، المجلد التاسع عشر – العدد الرابع، ص٨٥.

د- د. ابراهيم انيس، من اسرار اللغة، ص٨٦.

ه- د. شحادة الخوري، دراسات في الترجمة والتعريب، ص٤٣.

و- انترنيت: فريد امعضشو، آليات الوضع المصطلحي في اللغة العربية.

ز- د. عبدالمالك بوحجرة، اقتراح في تكوين المصطلحات العلمية العربية، مجلة جامعة قسنطينة للعلوم الانسانية، العدد التاسع، الجزائر، ١٩٩٨، ص٨١ – ٩٥.

**david crystal , dictionary of linguistics and phonetic , – London – Britain,١٩٨٠ ,p٤٦.**

د.كامل بصير دەڵێت: دەبێ داتاشین شان بە شانی ڕێبازی لێکدان بەکار بهێنین و هیچ سنووڕێکیش ناتوانێ لە یەکیان جیابکاتەوە[1].

ڕێبازی داتاشین بۆ زمانی کوردی زیاتر گونجاوە وەك لە زمانی عەرەبی، زانایانی عەرەب زۆر ئارەزوومەندی ئەم ڕێبازە ناکەن و داوا دەکەن خەڵکی خۆیانی لێ دوور بگرن و وشەی داتاشراو بە بارێکی قورس دەزانن، تەنیا کاتێ نەبێت کە زۆر پێویست بێت و هۆیەکەشی ئەوەیە زمانی عەرەبی زمانێکی داڕێژراوییە و وەکو زمانەکانی هیندو ئەورووپایی ڕۆنانی نییە، لەگەڵ ئەوەشدا تەقەللای داتاشین لە عەرەبیدا هەر هەیەو، بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانەکەیان سوودیان لێ بینیوە، لە زمانی کوردیشدا سوودێکی زۆری لێ بینراوە و لە وشەی دوور و درێژ کە لەسەر زمان قورسبێت، ڕزگارمان دەکات.

دەشێت کورتکردنەوە و داتاشین بە هەمان شت دابنرێت، چونکە هەردوو زاراوەی ڕێبازی کورتکردنەوە یان داتاشین پێش هەموو شتێك بۆ سووککردن و نەهێشتنی قورسی و درێژیی وشەکان بەکاردێت و لە گشت بوارەکاندا سوودی دەبێت، بەڵام پێش ئەوەی هێمای کورتکراوەکە بزانیت، دەبێت شارەزاییت لە بنچینەی وشە کورتکراوەکان هەبێت، بۆ نموونە (پ.ك.ك) کورتکراوەی (پارتی کرێکارانی کوردستان)ە، یان (ی.ن.ك) کورتکراوەی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)ە... هتد. ئەم کورتکردنەوەیەش نەك هەر لە زمانی کوردیدا، بەڵکو لە گشت زمانەکاندا ڕەچاو دەکرێت و هیچ گومانیشی تێدا نییە کە ئاراستەی

---

[1] د. کامل بصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٧٠.

گشتی هەموو زمانەکان بەرەو کورتکردنەوەی شێوازی وشەکان دەڕوات و منداڵیش کاتێ هەوڵی گۆکردنی وشە درێژەکان دەدات بڕگە کۆتاییەکانی دەڵێت، چونکە دوا بڕگە بووە کە گوێی لێ بووە و ئاسانترە بۆ لە بیرنەچوون. لەبەرئەوەی بواری مێشکیان بچووکە و ناتوانن هەموو بڕگەکان بەیەك جار وەرگرن و بێنەوە یادیان، بۆیە پەنا دەبەنە بەر دوا بڕگە کە گوێیان لێ بووە. بۆیە زێدەڕۆیی ناکەین لەوەی کە (داتاشین) بە وێنەیەك لە وێنەکانی کورتکردنەوە دابنێین. بەهەر شێوەیەك و هەرچۆنێك بێت داتاشین هۆیەکە بۆ پەرەسەندن و پەرەپێدانی زمان، کە شایستەی بایەخ و لێکۆڵینەوەیە.

## شەشەم: ڕێگای وەرگێڕان - الترجمة – Translation

هەموو زمانەکانی جیهان بۆ دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمانەکەیان پەنا دەبەنە بەر وەرگێڕان. بێگومان زۆرجار گەر بۆ هەندێ بواری وەك زانستی، دەروونی، کۆمەڵایەتی، فەلسەفی،... هتد زاراوەی گونجاو نەبوو دەبێت پەنا بەرینە بەر وەرگێڕان، کە پێویستە بایەخی پێ بدرێت، چونکە هونەر و سازگارییە، ئێمەی گەلی کوردیش پێویستیمان بە پێگەیاندنی توێژێکی وەرگێڕی زانستی و تەکنیکی هەیە، ئەندازیاران و تایبەتمەندانی بوارەکانی دیکەی زانست کە بە زمانی بیانیان خوێندووە پێویستە بۆ وەرگێڕان هان بدرێن و کەرەسەی پێویستیان بخرێتە بەر دەست.

ئەو هەوڵ و کۆششانەی کە بە ئەنجام گەیاندراوە، بۆ وەرگێڕانی کتێبەکانی خوێندن و ڕۆنانی زانستە زاراوە و فەرهەنگی هەموو جۆر و کورداندنی نووسراو و پشتپێبەستنیان لە ڕاپەڕاندنی کاروباری فەرمانگە و فێرگە و زانکۆکاندا دران، بوونە هۆی کۆبوونەوە و کەڵەکەبوونی سەدان و هەزاران وشە و زاراوەی نویێ، بەڵام بە داخەوە، زۆریان فەرامۆشکران و لەبیرچوونەوە، بەهۆی نەبوونی بنەمای زمانەوانی یەکگرتوو، جیاوازی پێوانە و بەرنامەی نێوان زانا و زمانەوان و وەرگێڕەوە، کە بووە هۆی ئەوەی باوەڕمان بە خۆمان و زمانەکەمان کز بێ، وابزانین کە بە ڕەوتی خێرای گەشە و پێشکەوتنی زانستی ڕاناگات لەبەرئەوە پێویستە بایەخێکی زۆر بە وەرگێڕان بدرێت و بکرێتە بنەما و پێوانە و کورداندن بکەینە بارێکی تایبەتی وەرگێڕان[1].

دەربارەی ئەوەی ئایا چەندە و تا کەی پەنا بەرینە بەر وەرگێڕان؟ لە ڕاستیدا بەپێی توانست نابێت دەرگا بخەینە سەر پشت و بە بێ سێ و دوو وشە و زاراوەی بێگانە وەربگرین، دیارە هەندێ واژە و وشەی زۆر پێویست دەتوانین ڕێ بە خۆمان بدەین لە ڕێگەی وەرگێڕانەوە زمانەکەمان دەوڵەمەند بکەین، هیچ زمانێکیش نییە لەم جیهانەدا لە چوارچێوەیەکی قالبێکی تەسکی تەنیایی خۆماڵیدا گەشە بکات و بەرەو پێشەوە بڕوات.

وەرگێڕانیش وەك ڕێبازێکی پەرەسەندنی هەر زمانێك بە هۆکارێکی گرنگی پەرەگرتنی پێوەندی کلتووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی زمانێ لەگەڵ زمانەکانی دیکەی جیهان دادەنرێت، ڕۆڵێکی چالاکیشی لە دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا نابێت گشت کاتێك پەنا ببرێتە بەر وەرگێڕان، بە

---

[1] جەمال عەبدول، بەرکولێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی، ل٦٧.

پێچەوانەی زمانی فارسی کە بەبێ سڵکردنەوە دەرگای خستۆتە سەر پشت بۆ وەرگرتنی زاراوە لە زمانەکانی دراوسێوە، بە تایبەتی زمانی عەرەبی. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە وەرگێڕان هۆیەکە بۆ دەوڵەمەندکردنی زمان و پەرەپێدانی و هاوچەرخکردنی، چونکە وەرگێڕان پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت، کە بەدوای وشە و زاراوەی نوێ و بۆچوونی نوێدا بگەڕێ، کەواتە وەرگێڕان بەم شێوەیە پێناسە دەکرێت: گواستنەوەی زاراوەی بیانی بۆ زمانی کوردی بە واتاکەی نەك بە بێژەکەی[1].

وەرگێڕ لە زمانی کوردیدا بەدوای بێژەی بەرانبەر ئەو چەمك و واتایەدا دەگەڕێت کە هەمان واتای زاراوە بیانییەکە بدات یان کوردی چی ناونانێك لەم چەمك و وشەیە دەنێت لەگەڵ چەمکە بیانییەکە لەهەموو لایەنێکەوە دەکۆڵێتەوە، ئنجا بەکاری دێنێت[2]، یان وەرگێڕان ڕێگەیەکە بۆ لەیەکگەیشتن، بە هۆیەوە دەتوانرێت بیر و هەستێك، کە بە زمانێك نووسرابێت یان وترابێت، بە زمانێکی تر ڕابگەیەنرێت، بە جۆرێك کە هەمان بیر و هەست و نەست و سۆز و ئاواز و ڕەزم و (ئیقاع)و شێوازی سەرچاوە نووسراوەکە، یان وتراوەکە بە ڕوونی و

---

(1) د.کەمال مەعروف، ئەدەبیاتی کلاسیکی و نوێخوازی کوردی، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل١٢٢.

(2) محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی دانانی زاراوە لە زمانی کوردیدا، ل٦٠-٦١.

ڕەوانی و بەهەمان مەبەست و کوڵ و قوڵپەوە لە وەرگێڕانەکەدا ڕەنگ بداتەوە و وەك ئاوێنەیەك تێیدا بدرەوشێتەوە[١].

بەهۆی ڕێبازی وەرگێڕانیشەوە چەندان زاراوەی نوێ هاتۆتە نێو زمانی کوردییەوە، وەکو:

بەگشتی کردن (گشتاندن) = تعمیم

هەواڵگریی = الاستخبارات

جەنگی کەنداو = حرب الخليج[٢]

سەندیکایی النقابية unionism

پیشەگەرایی القبلية Apriorism[٣]

ئازادیی ڕۆژنامەوانی حرية الصحافة = Liberty of press

هونەرکاریی = تصميم Layingout[٤]

دەسەڵاتی چوارەم = السلطة الرابعة Four thestate

وێنەخوازیی Imagist

ئەدەبناس Literathol

هونەری شیعر Poetics

---

[١] ابراهیم أمین باڵدار، هونەری وەرگێڕان، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٢١)، بەغدا، ئاداری ١٩٨٩، ل١١٢.

[٢] ڕۆژان نوری عبدالله، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی ، ل٢٢١.

[٣] محەمەد چیا، فەرهەنگی فەلسەفی (ئینگلیزی – عەرەبی – کوردی)، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٢٠٠.

[٤] بەدران ئەحمەد حەبیب، فەرهەنگی زاراوە گەلی ڕاگەیاندن (ئینگلیزی – کوردی – عەربی)، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٩٦.

بایەخی گۆڕینەوە، بهایێ گوهورینێ = قیمة التحویل Ex change value[1]

گرنگییا گوهرینێ

بینراو، دیدار منظور، مرئي Visual [2]

Hexose هکسۆز سکر سداسی ذرات الکربون = شەکرێکی شەش گەردیلە کاربۆنییە[3]

.... هتد.

دەیان زاراوەی تریش لە گشت بوارەکانی زانستیدا هاتوونەتە کایەوە و زمانی کوردییان دەوڵەمەند کردووە .

لە کاری وەرگێڕاندا، هەندێ جار جۆرەکانی وەرگێڕان وا لە وەرگێر دەکەن کە کارەکەی لاواز و سست بێت و لە ئاست هەندێ ناو و وشەدا بەهەڵەدا بچێت، بۆ نموونە لەوانەیە وەرگێڕێك کە چاوی بە ناوێکی وەك (ابوڤیان)ی نووسەر بکەوێت یان (حاجی جندی)ی لە کاتی وەرگێڕانی

---

[1] بەختیار سەجادی و محەمەد مەحموودی، فەرهەنگی شیکارانەی زاراوەی ئەدەبی (کوردی – ئینگلیزی)، هەولێر، ٢٠٠٤، ل١٨٥.

[2] لیژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان، زاراوەی ئەدەبی (کوردی – عەرەبی – ئینگلیزی)، هەولێر، ٢٠٠٦،ل١٧٥، ١٩٨.

[3] جەمال عەبدول، فەرهەنگی کیمیا (ئینگلیزی – عەرەبی – کوردی)، یەکەم چاپ، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٢٣٠

.... چەندین نموونەی تریش کە ناکرێت سەرجەم فەرهەنگە کوردییەکان ریزبکەین و نموونەیان لێوەرگرین.

وشە بە وشە بیبیانکات بە (باوکی ڤیان) و (حاجی سەرباز)، بۆیە وەرگێڕان بەلای ئێمەوە هونەرێکی بەرزە و لێهاتوویی و کارامەیی دەوێت.

ڕێبازی وەرگێڕانیش کە لە زانستی زاراوەسازیدا بەکار دەهێنرێت، بەچەند تایبەتمەندییەك لە ڕێبازی وەرگێڕانی دەق جیا دەکرێتەوە، لەم تایبەتمەندییانە، ڕێبازی وەرگێڕانی زاراوە واتای تەنیا وشەیەك وەردەگیڕێ، کە زاراوە وەرگێڕراوەکەیە، بەلام لە ڕێبازی وەرگێڕانی دەقێك ئەو وشە و دەربڕین و ڕستە و داڕشتنانە وەردەگێڕرێن کە دەقەکە پێك دەهێنن، سەرەنجام ڕێبازی وەرگێڕانی زاراوە تاقە ڕێبازێکە کەچی ڕێبازی وەرگێڕانی دەق سێ لقی سەرەکیی لێدەبێتەوە، کە لە هونەری وەرگێڕاندا بە:

- وەرگێڕانی وشە بە وشە.
- وەرگێڕان بەدەستکارییەوە.
- وەرگێڕان بە ئیلهام و خورپەوە، ناودەبرێت[1]، بەلام دەتوانین بلێین کە وەرگێڕان بە شێوەیەکی سەرەکی دوو جۆری هەیە: یەکەمیان ئەو چەشنە وەرگێڕانەیە کە وەرگێڕەکە وتەی یەکێك، دەست بەجێ بە شێوەیەکی زارەکیی لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر وەردەگێڕێ. ئەم جۆرە وەرگێڕانە بە زۆریی لە گفتوگۆی ئاساییدا بەکاردەهێنرێت[2]، کە دەتوانین ناوی بنێین وەرگێڕانی (دەست بەجێ) یان (وەرگێڕانی زارەکی) و ئێستاش بە شێوەیەکی فراوان لە کۆنگرە و کۆڕ و کۆبوونەوەکانی جیهاندا

---

[1] د.کامل بەصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٨٩.

[2] ابراهیم امین بالدار، هونەری وەرگێڕان، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٢١)،ل١١٢–١١٣.

بەکاردەهێنرێت، دووەمیان ئەو جۆرە وەرگێڕانەیە کە یەکێك نووسراوێك دەربارەی بابەتێکی زانستی یان هونەریی، یان هەر زانیارییەکی تر لە زمانێکەوە وەربگێڕێ بۆ زمانێکی تر[1]. دەتوانین لە کوردیدا پێی بڵێین (وەرگێڕانی نووسراوی). لەکاری وەرگێڕانیشدا تا دەتوانرێت دەبێت لە وەرگێڕانی وشە بە وشە دوور بکەوینەوە، بەڵام ئەو زاراوانەی تاکن لە جێی وەرگێڕانی وشە بە وشە دەتوانین وەریانبگێڕین، هەروەها بە پێی توانست ئەگەر وشەکە، یان زاراوەکە ڕوون بوو دەتوانین پەنا بەرینە بەر وەرگێڕانی وشە بە وشە، بە پێچەوانەشەوە وەرگێڕانی واتا بە واتا سوودی زۆرتر دەبێت.

وەرگێڕانیش بەهەر جۆرێکی بێت، لەم کاتەی ئێستاماندا سوودی زۆرە، لەوانە دەوڵەمەندکردنی زمانەکەمان بەو وشانەی کە گوزارشت لە واتا مرۆییەکان دەکەن، هەروەها کۆمەڵێ زاراوەی زانستی تازەمان پێ دەبەخشێت، کە ناتوانین لە پەرەسەندنی زانستیماندا وازیان لێ بێنین.

ڕێگا بە وەرگێڕان دراوە، بەڵام بەمەرجێ تەنیا ئەوەی پێویست بێت نەوەك لە دوارۆژدا ببێتە جێی مەترسی لەسەر زمانەکەمان و ببێتە هۆی بژارکردن و فەوتانی نەریت و کولتوور و باری ڕۆشنبیریی گەلەکەمان.

---

[1] ) ابراهیم امین بالدار، هونەری وەرگێڕان، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٢١)، ل١١٣.

## بناغەکانی وەرگێڕانی زاراوە بۆ سەر زمانی کوردی:

لە کاتی وەرگێڕانی هەر زاراوەیەك بۆ زمانی کوردیی، چەند خاڵێك هەن، دەبێت ڕەچاو بکرێن، لەوانە:

١- پێویستە ئەو وشە و زاراوە و زانیارییانە دەستنیشان بکرێن، کە ئەمڕۆ بۆ باری زانیاریی کورد پێویستن، یان پێوەندییەکی تەواویان بە زانیارییە نوێیەکانی ئەم سەدەیەوە هەیە، وەکو ماتماتیك، فیزیا، کیمیا... هتد.

٢- سوود لە هەموو شێوەکانی زمانی کوردی وەربگیرێت.

٣- سوود لە هەموو جۆرە فەرهەنگەکانی زمانی کوردی وەربگیرێت.

٤- بوژاندنەوەی هەندێ زاراوە و وشەی دێرین، بۆ نموونە وشەی (دەلاندن)[1][*] بۆ (تنافذ- نضوح) بەکاربهێنرێت.

٥- ئەو وشە و زاراوە زانستییە بیانیانەی هەن و لە کوردیدا بەرانبەریان نییە، وەك خۆیان بمێننەوە، وەکو (ترانسستەر، بارۆمەتر، ڕادێتەر، کامێرا، پۆزەتیڤ، نەگەتیڤ، پاوەن، ڤۆڵت، لیتر... هتد).

٦- وردبوونەوە لە واتای زاراوە وەرگێڕاوەکە.

---

[1] هەژار، فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە، ل٣٢٥.

[*] دەلاندن = تەڕایی دادان، تەڕەشوح، بە فارسیش تراویدن، نشتی پێ دەوترێت. (هەنبانەبۆرینە ل٣٢٥).

٧- هەندێك کورتە وشە، یان زاراوەی زانیاریی هەن، واباشە هەر وەکو خۆیان بهێڵرێنەوە، وەکوو = ئەکاتە . ناکاتە (بچوکتر، گەورەتر، بێ کۆتا... هتد).

٨- وەرگێڕانی زاراوە بە گوێرەی پێویست.

٩- لە کاتی دەستنیشانکردنی زاراوەی زانستیی کوردیدا، لە تەنیشتییەوە بنەڕەتەکەی پیشان بدرێت کە سەر بە چ زمانێکە.

١٠- خۆ دوورخستنەوە لە وەرگێڕانی وشە بە وشە.

١١- خۆبەستنەوە بە دیاردەی زاراوە هاوواتاکان و چەند وشەیەکی زانیاری کوردی هاوواتاکە بەرانبەر چەند وشەیەکی زانستیی ئینگلیزی، یان عەرەبی بەکاردەهێنرێن، تا ئێستاش ئەو گیروگرفتە هەیە کە کام وشەی کوردیی بەرانبەر کام وشەی ئینگلیزی، یان عەرەبی دابنرێت، وەکو لە عەرەبیدا (السحالي، العظايا، الصنب، اسفنقور، ابوبريص، ارول) لە کوردیدا: (مارمێلکە، قۆڕیی، شەوگەرد/شەوگەڕ، بزنمژ، دیلەمار، سوسەمار، پیسپیسۆك، مەلاتەقتەقێنە...) واباشە کە چاکترین وشەی کوردی لەمانە بەرانبەر چاکترین وشەی عەرەبی دابنرێت.

١٢- پێویستە وشە و زاراوە کوردییەکان کوردییەکی پەتی بن، لە فەرهەنگی کوردی یان لە ئاخاوتنی کوردەواریدا بەکارهێنرابن.

١٣- وشەیەکی وا هەڵبژێرین کە بێژەکەی لەگەڵ بێژەی وشەیەکی تردا تێکەڵ نەبێت، بۆ نموونە ئەگەر (چڕی) بۆ (كثافة) دابنێین دەشێت لەگەڵ (جیڕی) (مرونة) تێکەڵ بێت، لەبەرئەوە واباشە بۆ (كثافة)(چڕی) دابنێین.

١٤- واباشه بەرانبەر هەر وشەیەك، یان زاراوەیەك، تەنیا یەك وشە یان زاراوەی کوردیی هەبێت، وەك بەرانبەر (اللیل)ی عەرەبی تەنیا وشەی (شەو) هەبێت.

١٥- واباشه وشە هەڵبژێردراوەکە بتوانرێت بۆ چەند جۆرێکی تر پەرەی پێبدرێت، بۆ نموونە بەکارهێنانی (تەوژم) بەرانبەر (تیار) باشە، چونکە ئەوساکە دەتوانین بڵێین (تەوژمی با)، (تەوژمی ئاو)، (تەوژمی خوێن).

١٦- وەرگێڕان لە زمانی بێگانەوە وەکوخۆی، یان بەدەستکارییەوە، یان بە کورتکردنەوە، یان بە وەرگێڕان بێت.

١٧- لێکوڵینەوەیەك باس لە شێوەی ڕێزمانیی ئەو وشە بێگانەیەی، کە دەمانەوێت دەستکاریان بکەین یان کورتیان بکەینەوە، بکات.

١٨- لە کاتی وەرگرتنی یان گۆڕینی یان وەرگێڕانی وشە و زاراوەی نوێدا، پێویستە ئەو وشە و زاراوانە لە تەنیشتییانەوە ڕاڤەیەکی کوردی کورت و پڕ واتایان بۆ دابنێین.

١٩- ئەو وشە و زاراوانەی کە پێوەندییان بە ناوی هەندێك مادەی کیمیایی یان گیاندار یان ڕووەکەوە هەیە... و لەکۆنەوە بەکارهێنراون با هەروەکو خۆیان بمێننەوە، چونکە ڕێکەوتنێکی جیهانییان لەسەر کراوە، بۆ نموونە:

Oxygen اوکسجین ئۆکسجین -------- ترشی پەیداکەر

٢٠- ئەگەر وشەیەك لە بنچینەدا کوردی بوو و زمانێکی تر وەریگرتبوو، هیچی تیدا نییە بە دەستکارییەوە وەریبگرینەوە و بیخەینە سەر شێوەی کوردیی و بەکاری بهێنین، بۆ نموونە:

بنچینەی کوردی عەرەبی شێوە تازەکەی لەکوردی

بەهار بهارات بەهارەمەنی = بەهار ..... هتد[*].

جگە لەم خالأنەش هەندێ هۆکار، یان ڕێگەی تر هەیە، کە بە هۆیەوە وشەی نوێ دێتە نێو زمانی زگماکەوە:

## أ- داگیرکردن: Invenntion

زۆرجار داگیرکردن و دەستبەسەرداگرتنی ولأتێك لەلایەن ولأتێکی ترەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی کار بکاتە سەر دانیشتوانی و هەندێ وشە و زاراوەی خۆی بخاتە نێو فەرهەنگی زمانی ولأتە داگیرکراوەکەوە، یان

---

[*] سەبارەت بەم خالأنەی کە دەبێت ڕەچاو بکرێن لە وەرگێڕانی زاراوەی کوردی، بڕوانە:

أ- محەمەدی مەلاکەریم و کەمال جەلال غەریب، هەڵبژاردنی زاراوەی کوردی، گۆڤاری (پەروەردە و زانست)، ژمارە (٦)، سالّی (٣)، ل٤٩- ٥٥. =

ب- د. کامل بەصیر، زاراوەی کوردی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، ل٩٢- ٩٦.

پ- کۆمەڵێ نووسەر، گۆڤاری (پەروەردە وزانست)، فەرهەنگی زاراوەکانی قوتابخانە ، ژمارە (١٤)، سالّی (٣)، بەغدا، ١٩٧٨، ل (المقدمة).

ت- محەمەد وەسمان، بەرەو فەرهەنگی پزیشکی یەکخراو، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٨)، ل١٨-١٩.

ج- جەمال عەبدول، بەرکوڵێکی زانستە زاراوەسازی کوردی، ل٧١-٧٢.

چ- د.نەسرین فەخری، بەکوردیکردنی زاراوە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە(١١٤)، ل١٢٧-١٣٢.

هەردوو زمانەکە دەتوانن وشە لەیەکترییەوە وەربگرن و یان تەنیا یەك زمان خۆی دەسەپێنێت و زمانەکەی دیکە وشەی لێ وەردەگرێت.

ب- بازرگانی: Trade

پێوەندی ئابووری و کۆمەڵایەتی زمانێك لەگەڵ زمانانی دیکە، دەبێتە هۆی ئەوەی زاراوە بێنە نێو زمانی زگماك، وەك: (دۆلار، یۆرۆ، تومەن / تومان، لیرە...).

## پ- هۆکارەکانی جوگرافی:

سنوور و شوێنی کوردستان وایکردووە، کە چەندین وشە لە زمانە دراوسێکانی (فارسی، تورکی، عەرەبی...)وەربگرین.

ت- دۆزینەوەکان Exploration :

ئەو دۆزینەوە و داهێنانە زانستییانەی لە وڵاتانی دیکە ئەنجام دەدرێن و زاراوەی تایبەت بەو بوارانەیان بۆ دادەنرێت، زۆر جار لەبەر پێویستی زمانی کوردی بەو واتایانە لە بواری زانستیدا، ئەم زاراوانە دێنە نێو زمانی کوردییەوە.

## ج- کۆچکردن: Imigratio

ئەمیش هۆکارێکی گرنگە بۆ هاتنی کۆمەڵێك وشە و زاراوە بۆ نێو زمانی زگماك تا ئەندازەیەکیش توانیویانە فەرهەنگی زمانەکە دەوڵەمەند بکەن[١].

---

[١] ڕۆژان نوری عبداللە، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، ل٢٢٥-٢٢٦.

## هەندێ گیروگرفتی وەرگێڕان

پرۆسەی وەرگێڕان لە ئاکامی بلاویی زانیاریی و تەکنەلۆژیا لە جیهاندا و هەر زمانێك بە پێی تایبەتمەندیی خۆی تووشی چەندین گیروگرفت دەبێت، لەو گیروگرفتانەی کە تووشی وەرگێڕانیش دەبێت-کە کردەیەکی بەردەوامە- لە هەندێ خاڵی پێکداچوو خۆی دەبینێتەوە لەوانە:

- ئەوانەی بایەخ بە وەرگێڕان دەدەن لەو باوەڕەدان کە سیستەمی پەروەردە تا ئێستاش لە شێوازەکانی وانەوتنەوەی زمانی کوردیدا کەمتەرخەمە، سەرەڕای ئەوەی لە گشت قۆناغەکاندا بە کوردی دەخوێنرێ، بەڵام لەبەرئەوەی مامۆستاکانی زمان جەخت دەکەنە سەر ئەوەی خوێندکار پەنا بەرێتە بەر لەبەرکردنی دەستوورەکان، تا ئێستاش بە باشی ناتوانن پێی بنووسن و قسەی پێ بکەن[1].

- بوونی شێوەزاری جۆراوجۆر لە زمانی کوردیدا ئەمیش تا ئاستێك کار دەکاتە سەر پرۆسەی وەرگێڕان، هەندێ جاریش بوونی ئەو شێوەزارانەش لە پرۆسەی وەرگێڕاندا لای هەندێ کەس سوودی خۆی دەبێت، بۆ نموونە گەر وشەیەکت وەرگێڕا و واتاکەیت بە شێوەزارێك نەزانی دەتوانی بە شێوەزارێکی تر واتاکەی وەرگێڕیت.

- دواکەوتنی ژیاریی و زانستی کە زۆربەی پارچەکانی کوردستان بە دەستییەوە دەناڵێنن، لەبەر چەندین هۆ: نەبوونی دەوڵەت، ژێردەستەیی، نەبوونی داهێنان لە پارچەکانی کوردستاندا، نەخوێندەواریی...، کە ڕۆڵی

---

[1] نجاة عبدالعزيز المطوع، آفاق الترجمة والتعريب، مجلة (عالم الفكر)، المجلد التاسع عشر – العدد الرابع، وزارة الاعلام، كويت، ١٩٨٩، ل١١.

سەرەکی لە بواری وەرگێڕان و بە تایبەتی لە دامودەزگای زانستی و زانکۆیی و ڕۆشنبیریدا دەگێڕێت.

لەگەڵ ئەوەشدا زمان دەشێت بۆ وتنەوەی وانەی زانستە مرۆییەکان و زانستی پراکتیکی نوێ، بەڵام لاوازی لە بواری سەرچاوەی زانستی و تەکنیکی و کتێبی خوێندنی بوارەکانی پزیشکی و ئەندازیاری و فیزیایی و... هتد هەیە.

- فرەزاراوەیی زیاتر لەیەك زاراوەی زانستی کە بۆ یەك چەمك دانراوە.[1]

- نەبوونی دەزگایەك کە تایبەت بێت بە کاری وەرگێڕان.

## مەرجەکانی وەرگێڕ:

پێویستە ئەم مەرجانەی خوارەوە لە وەرگێڕدا هەبێت، وەك:

١- بە لایەنی کەمەوە زمانێکی تر، لە پاڵ زمانەکەی خۆیدا بزانێت.

٢-زانیارییەکی باشی لە دەستووری هەردوو زمانەکەدا هەبێت.

٣- توانستی شیکردنەوە و لێکدانەوەی ئەدەبیی هەبێت.

٤- بیرۆکە و وێناکردنێکی باشی بۆ ناوەوەی دەقەکە هەبێت.

٥- دەستپاکی لە وەرگێڕاندا زۆر گرنگە، وا لە وەرگێڕ دەکات کە ڕۆژ بە ڕۆژ بڕوای بە خۆی و کارەکەی زیاتر ببێت.

---

[1] انترنيت: فريد امعضشو و رشيد سوسان، ترجمة المصطلح الأجنبي وجهود المغاربيين فيها

/?p=١٨٩٥٣.www.doroob.com

٦- خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی هەمەلایەن بێت و بە بەردەوامی هەوڵ بدات بخوێنێتەوە.

٧- لە کەلتووری ئەو دوو نەتەوەیە کە لێوەی یان بۆی وەردەگێڕێت ئاگاداربێت.

ئەمانە و چەندین خاڵی تر، کە دەبێت لە وەرگێڕدا هەبن و هەمووشیان گرنگن، بەڵام خاڵی یەکەم زۆر گرنگە، کە وەرگێڕ چەندێك زمانی بێگانە بزانێ، زیاتر لە کارەکەی سەرکەوتوو دەبێت، هاوکات تەنیا ئەمە مەرج نییە بۆ ئەوەی ببێتە وەرگێڕ، بەڵکو پێویستە مەرجەکانی تریشی تێدابن، هەروەها خاڵی دووەمیش یەکێکە لەو خاڵە گرنگانەی کە پرۆسەی وەرگێڕانی لە سەر بنیات دەنرێت.[1]

## حەوتەم : ڕێگای پێوانە (زرەڕێژ)– كلمة مقتبسة بالقياس Calque ,Translation loan-Word

وشەی (زرەڕێژ) یان (پێوانە) لە گشت زمانەکاندا بەرچاو دەکەون و لە ڕێی داتاشین و واتاوە وەرگیراون وارێدەکەوێ وشەیەکی بێگانە لە ڕووی وشەسازییەوە لەچەند بەش پێکهاتبێ و چۆن درووست بووبێ و واتای چی بێ، لە وەرگرتن و وەرگێڕاندا بۆ سەر زمانێکی دی، پێکهاتن و درووستبوون و واتای ڕەچاوکراون[2] لە ڕووی درووستبوونی وشەسازییەوە

---

[1] سامية اسعد، ترجمة النص الادبي، مجلة (عالم الفكر)، المجلد التاسع عشر – العدد الرابع، وزارة الاعلام، كويت، ١٩٨٩،

[2] د. ئەورەحمانی حاجی مارف، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، ل٣٩٦.

لە زمانە بێگانەکەدا چۆن بووە، لە زمانەکەی دیکەیشدا هەر بەو جۆرە داتاشراوە. هەروەها لە ڕووی لیکسیکۆلۆژییشەوە واتایان بووە، هەر بەو شێوەیە واتای بەخشیوە، بۆ نموونە وشەی (pronoun)ی ئینگلیزی، کە لە (pro – جێ، لەجێ، لەباتی) و (noun – ناو)پێکهاتووە بە (جێناو) کە لە (جێ) و (ناو) پەیدابووە، ڕۆنراوە.

ڕێبازی پێوانەش گشت گەلانی جیهان بە پێی تایبەتمەندیی زمانەکەی خۆیان سوودیان لێ بینیوە و هەر یەکەش بە جۆرێك باسی کردووە و ناوی بردووە، بۆ نموونە لە زمانی عەرەبیدا ئەم ڕێبازە لە دانان و سازکردنی وشە و زاراوەدا بە ناوی (القياس) ناوبراوە و بەوە ناسراوە کە بنەمایەکە لەژێر ڕووناکیی ئەودا گشت دەستوورەکانی زمان و دارێژراوەکانی وشە و واتاکانی وشە بنیات دەنرێن، هەروەها پێوانە وەکو پێوانە و تەرازوو وایە بە دەست زمانەوانەکانەوە، کە لە ڕێگەیەوە دەتوانرێت ڕاستی و هەڵەکانی دیاردەیەکی زمانەوانی لێك جیا بکەنەوە[1]، کە لە زانستی وشەسازیی و زاراوەسازیی هاوچەرخدا باوە. هەروەها لە بارەیەوە وتراوە: ئەوەیە کە وشەیەك یان دەستەواژەیەك لە هەر زمانێکدا لە ڕێگەی وەرگێڕانی وشەکە یان دەستەواژەکە بۆ سەر زمانێکی دیکە نوێ دەکرێتەوە[2]، وەك (التقيم) کە بۆ وشەی (خەملاندن) وەرگێڕراوە کە بە پێی ڕێبازی پێوانە وشەیەکی تازەی لێ درووست کراوە بۆتە (نرخاندن) یان (ضريبة العرصات) وەرگێردراوە بۆتە (زەویانە) و بە ڕێبازی پێوانە بۆتە (کاولانە) یان لە

---

(1) د. ابراهيم انيس، من اسرار اللغة ١٩٧٥، ل٨.

(2) د. محمد على الخولي، معجم علم اللغة النظري، ل٢٩١.

وشەی (استنفار) وەگێڕدراوە بۆ وشەی (ڕاپێچان) و بەهۆی ڕێبازی پێوانەوە، چەندین وشە و زاراوەی دیکەی پێ دروستکراوە، وەك (ڕاپێچانی گشتی، ڕاپێچ دەر[٢]...).

ئێمە گەر چاوێك بە سامانی وشەکانی زمانی کوردیدا بخشێنین، دەبینین هەریەکە و بە پێی ڕێبازێك دانراوە و بۆ مەبەستێك بە کاردێت، لەم قۆناغەی ئێستای زمانەکەماندا لە هەموو بوارەکانی زانستدا پێویستیمان بە سازکردنی زاراوەی نوێباو هەیە، زمانی کوردییش یەکێکە لەوانەی کە بە ڕێبازی پێوانە ناسراوە، بۆیە پێویستە ئەم ڕێبازانەی زاراوەی کوردی بکەینە پێوانەیەك بۆ زاراوەسازی، بەڵام مەرجی گرنگی ئەمەش تێگەیشتنێکی زانستییانەی سروشتی زمانەکەمان و شارەزایی و لێزانی و تایبەتمەندییەکی قووڵ و فراوانی زانستەکانی زمانە[١]، کە لە هەموو جیهاندا ئەکادیمیانە ڕەچاوکراون، ئەم چەند نموونەیەی خوارەوە ئەو وشانەن کە بە ڕێبازی پێوانە سازکراون:

| وشە | زاراوەی پێوانە |
|---|---|
| دانساز | دەرمانساز، زاراوەساز، پاتریساز |
| مردووشۆر | جلشۆر، قاپشۆر، ماڵشۆر |
| دارتاش | پەیکەرتاش، سەرتاش، ڕیشتاش |
| جووتیار | کڕیار، فرۆشیار، هۆشیار |
| ئاوکێش | بەردکێش، چۆپی کێش، بارکێش |

---

[٢] مسعود محمد، زاراوەسازی پێوانە، ل١٥١.

[١] جەمال عەبدول، بەرکولێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی، ل٤٧.

ترسنۆك لەرزۆك، نەزۆك، گەڕۆك

داربەند شیشبەند، سیمبەند، تێلبەند

زەویانە پووشانە، مەڕانە، سەرانە

سووتاندن گشتاندن، نرخاندن، خەملاندن

دوکاندار و چاندار

شاخەوان باخەوان

ئاوەڕۆ پاشەڕۆ

کارگە فێرگە، جێگە

دڵ مردوو نەست مردوو، هەست مردوو

... هتد (*)

ئەگەر لەم بوارەدا هەندێ زاراوە وەربگرین بۆ نموونە:

دریل Drill

وەرشە Workshop

بڕۆش Broch

سەختاندن Hardning

تۆکمەیی Toughnes

مژین Absorption

شەبەنگ Speetrum

---

(*) بەهەڵەدا ناچین گەر بڵێین تا ئێستاش کاری هەرە مەزن لە بواری ڕێبازی پێوانەدا، کتێبەکەی مامۆستا (مەسعود محەممەد)ە بە ناوی (زاراوەسازی پێوانە) کە لە ساڵی ١٩٨٨ لە بەغدا چاپ کراوە و (٤٤٥) لاپەڕەیە.

ئەم جۆرە زاراوانە یان کوردێنراون، یان هەندێکیان هێشتا نە کوردێنراون، چونکە کورداندنیان، وردبییەکی زۆرتری دەوێت، کە لەگەڵ سروشتی ئەو زانستانە و دابینکردنی واتای واژە و گوزەرانی دەگۆڕێت، بۆیە هەندێك دەنگە گوێزانەوە پەسەند دەکەن، هەندێکیش واتا وەرگێڕان و لێداڕشتنی واژەی کوردی نوێباو پەسەند دەکەن، هەندێکی دیکەیش هەردووکیان تێکەڵ دەکەن و هەیشیانە ئاخاوتنی ئاسایی گشتی بەکاردەهێنن[1].

[1] جەمال عەبدول، بەرکوڵێکی زانستە زاراوەسازی کوردی، ل٥٧.

# ئەنجامەکان

**ئەنجامەکان:**

پاش کۆتایی هێنانی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەگەینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- سەرەڕای ئەوەی ئاماژە بۆ تێکەڵیوپێکەڵی و چوونەنێویەکی چەمکی زاراوەکان کرا، ئاماژەش بۆ ئەوە کراوە کە زاراوە و زاراوەسازیی کوردیی توانای ئەوەی هەیە بتوانێت زاراوەی زانستی گونجاو بۆ چەمکەکان دابنێت.

٢- هەندێ لە زاراوە و چەمکەکان بە تایبەتی زاراوەی زانستی تا ئێستا پێویستییان بە ڕوونکردنەوە و دیاریکردن هەیە.

٣- ئەگەر لێکۆڵینەوەی وشەی فەرهەنگیی لە بناغەکەیەوە بێت، ئەوا لێکۆڵینەوەی زاراوە لە چەمکەکەیەوە دەست پێدەکات.

٤- تا ئێستا زاراوەی زانستیی کوردیی بایەخی زۆری پێنەدراوە و نەگەیشتووەتە ئاستی چاوەڕوانکراو لەبەر کۆمەڵێك هۆکاری ڕۆشنبیریی و سیاسی و فیکری و کۆمەڵایەتی و... هتد.

٥- یەك نەخستنی زاراوەکانی کوردیی کێشەیەکی گەورەیە لەبەردەم پێشکەوتنی زانستی زاراوەسازی کوردی و بە پێچەوانەشەوە یەکخستنیان دەبێتە بەردی بناغەی درووستکردنی زمانی ستانداردی کوردی.

٦- چەندین کێشە هەن، دێنە بەردەم زاراوەی کوردی، هەندێکیان پێوەندییان بە زمانی کوردی خۆی و ئەو زمانەی لێی وەردەگیرێت و باردۆخی نەتەوەی کوردەوە هەیە.

٧- پێشگر و پاشگر لە زمانی کوردیدا ڕۆڵێکی گەورە و چالاك لە دروستکردنی وشەی داڕێژراو و دروستکردنی زاراوە دەگێڕن و کاریگەرییەکی گەورەیان لە دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی کوردیی هەیە.

٨- ئەو کارانەی لە بواری زاراوەسازیی کوردیدا ئەنجام دراون، زۆربەیان هەوڵی تاکەکەسین، ئەو هەوڵانەش هەرچەندە فراوان و خاوەنەکانیان شارەزاییان لە لایەنەکانی بواری زانستیی و پسپۆڕێتی خۆیان و خاوەن ئەزموون بن لەو بوارەدا، هێشتا ناتوانن بگەنە دانانی زاراوەی زانستی گونجاو کە بتوانێت تەشەنە بکاو بڵاوببێتەوە، بەڵام هاوکات ئەو هەوڵە تاکەکەسییانە نرخی خۆیان هەیە و کۆڕە زانستیی و زمانەوانییەکان لە کاتی لێکۆڵینەوە و هەڵبژاردنی لە زاراوەی زانستیدا دەگەڕێنەوە سەریان.

٩- لەگەڵ ئەوەی زۆرینەی زمانەوانان کۆکن لەسەر ئەوەی کە زاراوە، ڕێککەوتنی کۆمەڵە کەسێکە لەسەر وشەیەك بۆ گوزارشتکردن لە چەمکەکان، بەڵام هاوکات دەبێت لە چەمکەوە بگەینە دانانی زاراوە.

١٠- بوونی وشەی هاوواتا و فرەواتا و هاوبێژ لە زانستی زاراوەسازیدا یەکێکە لە گیروگرفتەکانی دانانی زاراوە، بەڵام لە زانستی زمانەوانیدا بە دەوڵەمەندبوونی زمانی کوردی دەژمێردرێت.

١١- نابێت زاراوە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی و بێ سەرە و بەرە دابنرێت، هەرکەسێ ئارەزووی کرد زاراوە دروست بکات، بەڵکو لە دروستکردنی

زاراوەدا کۆمەڵێك مەرج هەیە کە دەبێت ڕەچاو بکرێن، بەهەمان شێوە کۆمەڵێك مەرج هەن دەبێت لەو کەسەدا هەبن کە زاراوە دادەنێت.

١٢- زاراوە ڕۆڵێکی گرنگ لە بەستنەوەی پێوەندیی نێوان نەتەوە و گەلاندا دەگێڕێت، هەروەها لە گواستنەوەی زانیاری و تەکنەلۆژیادا.

١٣- پێوەندییەکی لۆجیکی لە نێوان زاراوە و چەمکدا هەیە، ئەم پێوەندییە ڕێکخەرە، بەڵام ئەم پێوەندییە لە نێوان ناو و ناونراودا نییە.

١٤- زانستی زاراوەسازیی کوردی، وەك زاراوەسازیی عەرەبی مێژوویەکی کۆنی نییە، ئەوەی لەم بارەیشەوە نووسرابێت تا ئێستا بە پێی مێژووەکەی بە کارێکی باش دەژمێردرێت و ئەوە دەسەلمێنێ کە زمانی کوردیی زمانێکە دەتوانێت لە بواری پەرەسەندن و پێشکەوتنی زاراوەی زانستیی شان بە شانی زمانەکانی دیکە بڕوات... .

## پێشنیار

- لە کاتی زاراوەداناندا، زۆر گرنگ و پێویستە وشەی ڕەسەنی کوردی بەکاربێنین، بەتایبەتی لە بواری فێرکردن و پەروەردە و فێرگە و خوێندنگە و... هتد، بۆ ئەوەی نەوەیەکی هۆشیار و زرنگ پێ بگەیێنین.

- بایەخدان بە لێکۆڵینەوە لە بواری زاراوەسازیدا و دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمانی کوردی، بە پێی بنەماکانی دانان و پێکهاتەی زاراوەدانان، چونکە دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمان دەبێتە بنەمایەك بۆ درووستکردن و بەدیهێنانی زمانێکی یەکگرتوو.

- جەختکردن لە بەکارهێنانی زاراوە و وشەی کوردی پەتی لە جیاتی زاراوە و وشەی بێگانە، چونکە بەکارهێنانی زاراوەی بیانی بەتێپەڕبوونی کات زمانەکەمان دەشێوێنێ و لاوازی دەکات.

- هەوڵی کورداندنی سەرجەم ئەو زاراوانە بدرێت، کە لە زمانەکانی ترەوە وەریاندەگرین و دێنە ناو زمانەکەمان و ئەوەش بخەینە بیری هەموو کەسێك کە زمانی کوردی هیچی لە زمانەکانی تر کەمتر نییە، تەنیا ئەوەیە لەو بوارەدا هەوڵ و خۆماندووکردنی دەوێت...

- لەسەر کۆڕ و دەزگا زانستی و زمانەوانییەکان پێویستە بەرەنگاری ئەو زاراوانە ببنەوە، کە ڕۆژانە دەردەچێت لە جیهاندا لە ئاکامی ئەو

پێشکەوتنە خێرایەی بواری زانست و تەکنەلۆجی و تەکنیکی و... هتد، کە بە لانی کەمەوە لە ڕۆژێکدا زیاتر لە (٥٠) زاراوە دەردەچێت، بەزوویی تۆمار بکرێن، یان بکرێن بە کوردی، یان لە بەرانبەریانیاندا زاراوەی کوردییان بۆ دابڕێژرێت.

- بۆ دانان و ڕێکخستنی زاراوە هەوڵ بدرێت سوود لەهەموو شێوەزارەکانی زمانی کوردی ببینرێت، هەروەها لەپاڵ زمانی کوردیدا بایەخ بەچەند زمانێکی دیکە بدرێت، بۆ نموونە وەك زمانەکانی (عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی و... هتد) بەمەبەستی شارەزابوون لە وردەکارییە زانستییەکان.

- دانانی لیژنەی تایبەت بۆ ڕێکخستن و یەکخستنی زاراوەکان و وەرگێڕان و بە خۆماڵیکردنی ئەو زاراوانەی کە لە زمانەکانی ترەوە دێنە نێو زمانەکەمان...

- پێویستە ئاوڕ لە زانستی زاراوەسازیی و زاراوەی کوردیی بدرێتەوە لە پێناو یەکگرتن و چەسپاندن و ئاسانبوونی و سوربوون لەسەر ئەوەی بۆ یەك شت، زیاتر لە یەك زاراوە دانەنرێت و تەنیا لە کاتی زۆر پێویست نەبێت پەنا نەبرێتە بەر زاراوەی هاوواتا، ئەویش بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێ جیاوازی نێوان چەمکەکان.

- دوورکەوتنەوە لە ناونانی چەمکی لێکنزیکی زاراوە.

- پەنا بردنە بەر کورتکردنەوە، لە کاتی بەکارهێنانی زاراوە بۆ ئاسانبوونی دەربڕین و تێگەیشتن.

- ئەو زمانەوانانەی لە بواری زاراوەسازیدا کار دەکەن دەبێت خاوەنی زانیاریی و شارەزای زمانەکانی تر بن و هەروەها خوێندەوارێکی باشی بواری لۆجیك و زانستەکانی بن.

- نەبوونی فەرهەنگێکی سەرتاسەریی و زمانێکی ستانداردی کوردیی هۆیە بۆ دواکەوتن لە بواری زانستی زاراوەسازیدا، بۆیە پێویستە لەلایەن ئەکادیمیای کوردی و ناوەندە زانستییەکانەوە هەوڵی دانانی فەرهەنگێکی زانستیی سەرتاسەری بدرێت لەپێناو دەستەبەرکردنی و هێنانەکایەی زمانی ستانداردی کوردی.

- بە بەراورد لەگەڵ زمانی عەرەبیدا لێکۆڵینەوە لە بواری ئەم زانستەدا لە زمانی کوردیدا زۆر کەمە و پێویستی بە چەندین لێکۆڵینەوە هەیە و زۆربەی ئەو لێکۆڵینەوانەی کراون لە کەموکووڕی بەدەر نەبوون.

- چەندین ڕێگای داڕشتن و دانان و درووستکردنی زاراوە و چەندین هۆکاری تریش، بۆ دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمانی کوردی هەیە.

- لە کاتی دانانی زاراوەیەکدا نابێت مەرجی زۆر قورس بەسەر زاراوەدا بسەپێندرێت و زاراوەش تا بتوانرێت کورت و ڕوون و سووك بێت زیاتر بڵاو دەبێتەوە و خەڵکیش زیاتر بەکاری دەهێنێت.

- بایەخدان بە وەرگێڕان بۆ ئێمەی کورد زۆر پێویستە لەبەر نەبوونی زاراوەی کوردی پەتی بۆ گشت چەمکەکان، بە تایبەتی وەرگێڕانی زاراوە زانستییەکان کارێکی زۆر گرنگە و دەبێ لیژنەیەك نەك تاکە کەس ئەو کارە ئەنجام بدات.

- پێش هەموو شتێك پێویستیمان بە بڕیارێکی سیاسیی هەیە بۆ بڕیاردان لە سەر زمانێکی یەکگرتووی کوردی و پابەندبوون بەو زاراوانەی کە لە کۆڕە زانیارییە زمانەوانییەکانەوە دەردەچن و لەسەرتاسەری کوردستان بەکار بهێنرێت، کە زاراوەی زانستی کوردی بە بەکارهێنانی ڕۆژانە نەبێت بەردەوام نابێت و برەو ناسێنێت و ناژێت.

- ئەو جێگەیەی کە زاراوە هەڵدەبژێرێت، بۆ نموونە ئەگەر کۆڕێکی زانیاری بێت، دەبێت دەزگایەکی نیشتمانی و نەتەوەیی بێت و نوێنەری هەموو دیالێکت و شێوە زارەکانی زمانی کوردیی تێدابێت.

# ملخص الاطروحة

## ملخص البحث

## ((اسس ومكونات المصطلحات في اللغة الكردية))

شهاب طيب طاهر

هذه الاطروحة الموسومة بـ(اسس ومكونات المصطلحات في اللغة الكوردية)، هي تحليل وصفي على المستوى المورفولوجي (الصرفي)، و موضوعها ينضوي تحت لواء علم جديد وهو علم المصطلحات. وعلى الرغم من جدته فقد استوى علماً مكتمل الجوانب، وصار مجالاً من مجالات البحث، وميدان دراسته هو كل مايتعلق بجمع المصطلحات و وصفها ومعالجتها وتمثيلها وعرضها، وبالاخص المصطلحات المعجمية المنتمية الى مجالات تخصصية متنوعة. وعلى الرغم من تنازع عدة فروع معرفية وعلمية على انتماء هذا العلم اليها فقد استطاع في السنوات الاخيرة اكتساب اسس منهجية مستقلة مع مزيد من التنظير وقد غدا اللغويون في الأونة الأخيرة يطالبونه بما هو بعد جديد في الدراسات اللغوية.

وحقيقة الأمر أن هذا العلم مهما حاول اللغويون الاستقلال به فسيبقى دائماً طوع التأثير فضلاً عن ما يتبادله مع سائر العلوم، وستظل دائما

صلته قائمة بعلوم اللغة والمنطق وعلم المعرفة الى جانب حقول التخصص العلمي المختلفة كالحاسوب والانترنيت وغيرها.

من المعروف ان المصطلح سبب رئيسي لتكوين لغة موحدة للأمة، شريطة القيام بتوحيد مصطلحات جميع اللهجات المنتمية الى اللغة نفسها، لأن المصطلح يعد الحجر الأساس لنشوء وتكوين اللغة القومية، و هو العمود الفقري لها ويلعب دوراً كبيراً في بناء جوهري للغة الرسمية الموحدة للأمة. إذ تقرب اللهجات من بعضها وتقوي العلاقات بينها و تصبح سبباً لتكوين وحدة التعبير، وبناء أدوات النقل الفكري، والعقلي، والابداع للأجيال القادمة الموحدة.

لهذا السبب نرى جميع اللغات الحية ومنها اللغة الكردية تهتم بتعريف مفهوم المصطلح وتوضيحه، ومع ذلك لم يتطور هذا العلم بالشكل المطلوب وذلك لجملة من الاسباب السياسية والاجتماعية والاقتصادية والفكرية والعلمية... الخ. لذلك يجب علينا الاهتمام بالدراسات العلمية والاكاديمية والبحث في جميع جوانب هذا العلم للارتقاء به إلى مستوى اللغات الاخرى و قد أجرى الباحث بكتابة هذا البحث لكي يكون محاولة متواضعة في مجال هذا العلم والغور في أعماقه.

يتكون البحث من مقدمة وأربعة فصول، ففي المقدمة وضحَ الباحث العوامل المحفزة لاختيار العنوان وأهميته ونبذة مختصرة عن كل فصل من فصول الاطروحة.

ألفصل ألأول:

خصص لعنوان البحث وسبب إختياره كذلك الأهداف والأهمية و المشاكل والطرق المتبعة وحدود البحث وأدواته وتحديد إطار منهج البحث.

أما ألفصل ألثاني:

فقد خصص لمراجعة وتقييم الأعمال السابقة التي كتبت في هذا المجال وفيها تطرق الباحث الى الأعمال الأكثر أهمية وذات صلة بالموضوع التي تستحق التقويم. ونرى هذا التقييم مفيداً للاستفادة منه في الفصول الاخرى، وانه- على حد علم الباحث – يرجع الينا السبق في التطرق الى تقييم الدراسات السابقة عن علم المصطلح في اللغة الكردية... .

أما ألفصل ألثالث:

فقد خصص بصورة عامة لعلم المصطلح، وقد قسم الى محورين:

ألمحور ألأول:

تعريف وتوضيح علم المصلحات وجوانبه ومراحله التأريخية والمراحل التاريخية لعلم المصطلح الكردي والنظريات العامة التي يقوم عليها هذا العلم...

ألمحور ألثاني:

فقد خصص لتوضيح مفهوم المصطلح وتعريفاته والفروق بينها ومصادرها وتوضيح العلاقة بين الكلمة والمصطلح والمصطلح العلمي الكردي والمشاكل التي تواجهه وشروط وضع المصطلحات والشروط الواجب توافرها لمن يقوم بوضع المصطلحات.

أما الفصل ألرابع :

فقد خصص لأسس ومكونات وطرائق إغناء المعجم الكردي وفيه توصل الباحث إلى جميع الطرق المتبعة لتكوين واشتقاق وترجمة ووضع الطرق القياسية للمصطلح في اللغة الكردية، إذ أصبح علم المصطلحات موضع إهتمام جدي بعد أن استحدثت الدراسة باللغة الكردية...

## TERM BASIS AND CONSTITUENTS IN KURDISH LANGUAGE

**By: Shahab Taeeb Tahier**

This research which is [ Bases and Constituents Of Term in Kurdish Language ] is a descriptive analysis in terms of morphology , the subject is about a new science:terminology Although the research is new , but it has become a widespread science and a field of research that is focusing on collecting , describing and showing the terms , especially those terms that are present in the dictionaries and related to various academic fields.

There is a problem concerning the relativity of this science with other sciences , but in the

previous years the science has gained same independent methodical bases , and it has been dealt with in a new linguistic method.

Scientists try to make it an independent since ;yet , it is influenced by and influencing other sciences , and it always has an established relation with other sciences such as language , logic and informatics , with computer science and internet as well.

Thear is no doubt , that terms are the very means for establishing a united language of every nation , on a condition that all of the terms of the dialects of this language are to be gathered and unified , because terms are the bases and cornerstones for establishing a national language , as they biting dialects closer to each other and tighten their relations.

For this reason , all live languages focus on defining and explaining the concept (term) , and Kurdish language is one of these languages that after establishing Iraqi government , when education turned to be in Kurdish , efforts had been made in schools and offices for making Kurdish terms , but because of some political , social , economic and intellectual reasons , this science hasn't developed as it should.for elevating this language to the level of other

languages of the world , we need scientific and academic research , to meet such need we did this research.

The research consists of three parts plus an introduction:

**-Chapter one:**it is made up of the title of the research ,the reason for choosing it , its importance , obstacles , the content of the research and it has been written how.

**- Chapter tow:**

is specified for reviewing and evaluating other works on the field , this work is done in Kurdish for the first time.

**Chapter three- :**

deals with terminology , it has two section.

**First section:**

defining and explaining the term (terminology),historical stages of Kurdish terminology and the general theories that this science rely on.

**Second section:**

is specified for explaining the concept of term , its various definitions with their differences and sources , the problem of term-making and the conditions that are put forth for a term –maker.

**Chapter Four-:**

studies the basics and methods of enriching Kurdish dictionary.In this part , we have discussed all methods of making , adjusting , translating and using terms , with discussing the standard methods of making Kurdish terms.

# TERM BASIS AND CONSTITUENTS IN KURDISH LANGUAGE


**By**

**Shahab Tayib Tahir**


**٢٠١٢**

# سەرچاوەکان

## ١- بە زمانی کوردی


- **ئازاد حەمە شەریف** (١٩٩٧)، سەرنجێك لە کتێبی (زاراوەسازی پێوانە)، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (١٧)، هەولێر.

- **ئەبوبەکر ماوەتی** (١٩٧٣)، چەند سەرنجێك دەربارەی بەشی فەرهەنگ، گۆڤاری (دەنگی مامۆستا)، ژمارە (٨)، سالّی (٢)، سلێمانی.

- **ئەحمەد تاقانە** (١٩٧٧)، لەبارەی هەندێ لە زاراوە و ئیدیۆمی (کوردی)یەوە، گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان)، ژمارە (٤٣-٤٤)، بەغدا.

- **ئەحمەد حەسەن ئەحمەد** (١٩٧٥)، پێشگر و پاشگر، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق (دەستەی کورد)، بەرگی (سێیەم) بەشی(یەکەم)، بەغدا.

- **ئەورەحمانی حاجی مارف** (١٩٧٥)، وشەی زمانی کوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا.

- **ئەورەحمانی حاجی مارف** (١٩٧٧)، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا.

- **ئەورەحمانی حاجی مارف** (١٩٧٩)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی یەکەم -ناو-، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا.

- **ئەوڕەحمانی حاجی مارف** (١٩٧٩)، با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین، بەشی (چوارەم)، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نویٚ)، ژمارە (٧٥)، بەغدا.

- **ئەوڕەحمانی حاجی مارف** (١٩٨٧)، لە بواری فەرهەنگ نووسی کوردیدا، لە چاپکراوەکانی ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیریی و لاوانی ناوچەی کوردستان، بەغدا.

- **ئەوڕەحمانی حاجی مارف** (١٩٩٢)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی سێیەم -ئاوەڵناو-، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق (دەستەی کورد)، بەغدا.

- **ئەوڕەحمانی حاجی مارف** (٢٠٠٠)، زمانی کوردی و خەوشی هەندیٚ وشە و زاراوەی نویٚ، بەشی یەکەم، بەغدا.

- **ئەوڕەحمانی حاجی مارف** (٢٠٠٠)، بەرهەمە زمانەوانییەکانم (نووسین و وەرگێڕان)، بەرگی سێیەم (وتار و لێکۆڵینەوە) لەگەڵ پاشکۆیەك، سلێمانی.

- **ئەوڕەحمانی حاجی مارف** (٢٠٠٤)، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی(کوردی – عەرەبی – ئینگلیزی)، سلێمانی.

- **ئەنجومەنی کۆڕ/گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد**، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد:

* ڕێنووسی کوردی، بەرگی (یەکەم)، بەشی (یەکەم)، بەغدا، ١٩٧٣.

* زاراوەی کارگێڕی، بەرگی (یەکەم)، بەشی (یەکەم)، بەغدا، ١٩٧٣.

* لیستەی دووەمی زاراوەکانی کۆڕ، بەرگی (دووەم)، بەشی (یەکەم)، بەغدا، ١٩٧٤.

* لیستەی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕ، بەرگی (دووەم)، بەشی (دووەم)، بەغدا، ١٩٧٤.

* لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٥.

* لیستەی پێنجەمی زاراوەکانی کۆڕ، بەرگی (سێیەم)، بەشی (دووەم)، بەغدا، ١٩٧٥.

* لیستەی شەشەمی زاراوەکانی کۆڕ، بەرگی (چوارەم)، بەغدا، ١٩٧٦.

- **ئیبراهیم ئەمین باڵدار** (١٩٨٦)، زاراوە و زمان لە کاروانی زانیاری ئەمڕۆدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٢)، بەغدا.

- **ئیبراهیم ئەمین باڵدار** (١٩٨٩)، هونەری وەرگێڕان، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٢١)، بەغدا.

- بەختیار سەجادی و محەمەد مەحموودی (٢٠٠٤)، فەرهەنگی شیکارانەی زاراوەی ئەدەبی (کوردی — ئینگلیزی)، هەولێر.

- **بەدران ئەحمەد حەبیب** (٢٠٠٥)، فەرهەنگی زاراوە گەلی ڕاگەیاندن (ئینگلیزی — کوردی — عەربی)، هەولێر.

- **بەکر عومەر عەلی** (٢٠٠٠)، میتافۆر لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە، نامەی دکتورا (بلاونەکراوەتەوە)، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی.

- **بەناز رفیق توفیق** (٢٠٠٨)، ڕێگە بنەڕەتییەکانی دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمانی کوردی لە دیالێکتی خواروودا، نامەی ماستەر (بلاّنەکراوەتەوە)، کولێژی پەروەردە — ئیبن ڕوشد، زانکۆی بەغدا، بەغدا.

- **تاهیر سادق** (١٩٩٨)، فەرهەنگی هاوواتاکانی کوردی، کوردستان – سلێمانی.

- **تۆفیق وەهبی** (١٩٤٢)، فەرهەنگی گەلاوێژ، گۆڤاری (گەلاوێژ)، ژمارە (٧-٨) ساڵی (٣)، بەغدا، ژمارە (٩-١٠)، ساڵی (٣)، بەغدا، ژمارە (١١-١٢)، ساڵی (٣)، بەغدا.

- **تۆفیق وەهبی** (١٩٤٣)، فەرهەنگی گەلاوێژ، گۆڤاری (گەلاوێژ)، ژمارە (١)، ساڵی (٤)، بەغدا، ژمارە (٢)، ساڵی (٤)، بەغدا، ژمارە (٣)، ساڵی (٤)، بەغدا.

- **تۆفیق وەهبی** (١٩٤٤)، سەلام سەردەقی شکاند، گۆڤاری (دەنگی گێتیی تازە)، بەرگی یەکەم، ژمارە (٦)، بەغدا.

- **جەلال مەحمود عەلی** (١٩٧٨)، چەند سەرنجێك دەربارەی ((هەندێ زاراوە و ئیدیۆمەی کوردی))، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٦٥)، بەغدا.

- **جەلال مەحمود عەلی** (١٩٨٢)، ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، زنجیرەی کەلەپوور -١ -، بەغدا.

- **جەلال مەحمود عەلی** (٢٠٠١)، ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، بەرگی دووەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی.

- **جەمال بابان** (١٩٧٤)، هەندێك لەو زاراوانەی واتایەك زیاتر ئەبەخشن، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (دووهەم)، بەشی (یەکەم)، بەغدا.

- **جەمال عەبدول** (١٩٨٩)، چەند سەرنجێك دەربارەی نامیلكەی (زاراوەی كوردیی زانستەكان)ی كۆڕی زانیاری عێراق- دەستەی كورد، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٢٣)، بەغدا.

- **جەمال عەبدول** (١٩٩٨)، فەرهەنگی كیمیا (ئینگلیزی — عەرەبی — كوردی)، یەكەم چاپ، سلێمانی.

- **جەمال عەبدول** (٢٠٠١)، بەركولێكی زانستە زاراوەسازی كوردی، یەكەم چاپ، چاپخانەی (قەشەنگ)، سلێمانی.

- **جەمال عەبدول** (٢٠٠٨)، بیردۆزی گشتی زاراوەدانان و یەكخستن و تۆمارسازی....، گۆڤاری (وەشت)، ژمارە (١)، سالّی یەكەم، سلێمانی.

- **جەمال عەبدول** (٢٠٠٨)، زاراوەسازی و زانستاندنی زمانی كوردی، گۆڤاری ئەكادیمی كوردی، ژمارە (٧)، كوردستان — هەولێر .

- **جەمال نەبەز** (١٩٦٠)، هەندێك زاراوەی زانستی، سلێمانی.

- **جەمال نەبەز** (١٩٦٠-١٩٦١)، فەرهەنگۆكی زانستی، هەولێر.

- **جەمال نەبەز** (١٩٦٠-١٩٦١)، زاراوەی لیژنەی (ریاضیات) لەژێر وردبینی لێكۆڵینەوەدا، گۆڤاری (ڕۆژی نوێ):

بەشی یەكەم، ژمارە (٦)، سالّی (١)، سلێمانی.

بەشی دووەم، ژمارە (٧)، سالّی (١)، سلێمانی.

بەشی سێیەم، ژمارە (٨)، سالّی (١)، سلێمانی.

بەشی چوارەم، ژمارە (١١)، سالّی(١)، سلێمانی.

- **جەمال نەبەز** (١٩٧٦)، زمانی یەكگرتووی كوردی، بامبێرگ — ئەڵمانیا.

- **جەمال نەبەز** (١٩٧٨)، سەرنجێك لەچەند زاراوەیەكی تازە بەكارهاتوو و كۆڕی زانیاری كورد، گۆڤاری كۆلێجی ئەدەبیات، ژمارە (٢٢)، چاپخانەی (دار الجاحظ)، بەغدا.

- **حوسێن محەمەد عەزیز** (٢٠٠٥)، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەكانی زمانی كوردی (لێكۆڵینەوە و ڕەخنە)، چاپی دووەم، چاپخانەی (كارۆ)، سلێمانی.

- **دەستەی كورد** (١٩٨٧)، ڕێنووسی كوردی بە پێی بڕیارەكانی كۆڕی زانیاری عێراق، چاپخانەی كۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا.

- **ڕەئووفی ئەحمەد تالانی** (١٩٨٢)، نرخاندنێك دەربارەی (زاراوە زانستییەكان)، گۆڤاری (كاروان): بەشی یەكەم، ژمارە (١)، هەولێر.

بەشی دووەم، ژمارە (٢)، هەولێر.

بەشی سێیەم، ژمارە (٣)، هەولێر.

- **رؤوف عثمان** (١٩٧٦)، پێداچوونەوەیەك بە پەراوێزی زاراوەكانی كۆڕدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٥٠)، بەغدا.

- **ڕەفیق محەمەد شوانی** (٢٠٠١)، چەند بابەتێكی زمان و ڕێزمانی كوردی، چاپی یەكەم، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی موكریانی، هەولێر.

- **ڕەفیق محەمەد شوانی** (٢٠٠٨)، ئەو وشانەی لەچاوگەوە وەردەگیرێن، چاپی یەكەم، چاپخانەی خانی (دهۆك)، دهۆك.

- **ڕزگار كەریم** (١٣٨٥- ٢٠٠٦)، فەرهەنگی دەریا (عەرەبی — كوردی)، بەشی یەكەم، نشری احسان، تەهران.

- **رشید فندی** (١٩٨٦)، زاراڤێت ئەدەبە د مەم و زینا خانی دا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، بەغدا.

- **ڕۆژان نوری عبدالله** (٢٠٠٧)، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، بڵاوکراوەی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا، سلێمانی.

- **شێخ محمدی خاڵ** (١٩٦٠)، فەرهەنگی خاڵ: بەرگی یەکەم، چاپخانەی کامەران، سلێمانی.

- **شێخ محمدی خاڵ** (١٩٦٤)، فەرهەنگی خاڵ: بەرگی دووەم، چاپخانەی کامەران، سلێمانی.

- **شێخ محمدی خاڵ** (١٩٧١)، فەرهەنگی خاڵ: بەرگی سێیەم، چاپخانەی کامەران، سلێمانی.

- **صباح رشید قادر** (٢٠٠٠)، هاوبێژی و فرەواتایی، نامەی ماجستێر (بڵاونەکراوەتەوە)، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی، سلێمانی.

- **طالب حوسێن عەلی** (١٩٩٨)، هەندێ لایەن لە پێوەندی ڕستە و واتا لە کوردیدا، نامەی دکتورا (بڵاونەکراوەتەوە)، کۆلێجی ئاداب — زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر.

- **عەبدولرەحمان عوسمان** (٢٠٠٥)، زاراوەزانی و زاراوەی زانستی کوردی، گۆڤاری ((بانە ڕۆژ))، ژمارە (٢١)، کۆمەڵەی ڕوناکبیریی و کۆمەلایەتی کەرکووك، کەرکووك.

- **عەلی نانەوازادە** (٢٠٠٥)، فەرهەنگی کوردیێ هەرمان (کوردی — کوردی)، بەرگی یەکەم (ئا — ب)، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، کوردستان — هەولێر.

- **عبدالرحمن زەبیحی** (١٩٧٨)، ڕەخنەی زانستییانە یاخود شەلّم کوێرم هیچ نابوێرم، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نویّ)، ژمارە (٧١)، بەغدا.

- **عبدالرزاق بیمار** (١٩٨٦)، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانەکان، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نویّ)، ژمارە (١١١)، بەغدا.

- **عبدالکریم شێخانی** (١٩٨٥)، فەرهەنگی زانیاری و چەند تێبینییەك، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٣٤)، ساڵی (٣)، هەولێر.

- **غازی فاتح وەیس** (١٩٨٤)، کتێبی زاراوەی کوردی و چەند تێبینییەك، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٤)، ساڵی (٢)، بەغدا.

- **غەفوور ڕەشید** (١٩٦٠)، سەرنجێك لە پەڕاوی زاراوەی زانستی کوردی، گۆڤاری (ڕۆژی نویّ)، ژمارە (١٢)، ساڵی (١)، سلێمانی.

- **فوئاد حەمەخورشید** (١٩٨٥)، زمانی کوردی دابەشبوونی جوگرافیایی دیالێکتەکانی، وەرگێڕانی: حەمەکەریم هەورامی، چاپخانەی (آفاق عربیة)، بەغدا.

- **کامل حسن بەصیر** (١٩٧٤)، زمانی عەرەبی و کێشەی زاراوەی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (دووهەم)، بەشی (یەکەم)، بەغدا.

- **کامل حسن البصیر** (١٩٧٩)، زاراوەی کوردی لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن، بەڕێوەبەرێتی چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، سلێمانی.

- **کامل حسن بەصیر** (١٩٨١)، هۆنراوەی کوردی و زاراوەی کلاسیزم لە ڕەخنەسازی ئەورووپیدا، گۆڤاری (بەیان)، ژمارە (٧٥)، بەغدا .

- **كامل حسن بەصير** (١٩٨٥)، بەراوردیەك لە نێوانی زمانی كوردی و زمانی عەرەبیدا، گۆڤاری كۆڕی زانیاری عێراق ((دەستەی كورد))، بەرگی سیازدەهەم، چاپخانەی كۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا.

- **كامل حسن بەصير** (١٩٨٦)، پێناسینی زاراوە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، بەغدا، ١٩٨٦.

- **كەمال جەلال غەریب** (١٩٧١)، فەرهەنگی مامۆستا، گۆڤاری (دەنگی مامۆستا)، ژمارە (٢)، ساڵی (١)، سلێمانی.

- **كەمال جەلال غەریب** (١٩٧٤)، فەرهەنگی زانیاری (عەرەبی – ئینگلیزی – كوردی): بەرگی یەكەم، چاپی یەكەم، بەغدا.

- **كەمال جەلال غەریب** (١٩٧٥)، فەرهەنگی زانیاریی وێنەدار (عەرەبی – ئینگلیزی – كوردی)، مطبعة (الاجیال)، بەغدا.

- **كەمال جەلال غەریب** (١٩٧٩)، فەرهەنگی زانیاری، گۆڤاری (پەروەردە و زانست)، ژمارە (١٥)، بەغدا.

- **كەمال جەلال غەریب** (١٩٧٩)، فەرهەنگی زانیاری (عەرەبی – ئینگلیزی – كوردی)، بەرگی دووەم، چاپی یەكەم، بەغدا.

- **كەمال جەلال غەریب** (١٩٨٣)، فەرهەنگی زانیاری (عەرەبی – ئینگلیزی – كوردی)، بەرگی سێیەم، چاپی یەكەم، بەغدا.

- **كەمال جەلال غەریب** (١٩٨٣)، القاموس العلمي، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (٤)، هەولێر.

- **كەمال مەعروف** (٢٠٠٣)، ئەدەبیاتی كلاسیكی و نوێخوازی كوردی، چاپی یەكەم، سلێمانی.

- **کەمال میاوەلی (٢٠٠٧)**، فەرهەنگی ڕێزمانی کوردی، چاپی یەکەم، لە بڵاوکردنەوەکانی مەڵبەندی کوردۆلۆجی سلێمانی.

- **گۆڤاری (پەروەردە وزانست)(١٩٧٢)**، زاراوەکانی قوتابخانە، ژمارە (٤)، ساڵی (٢)، چاپخانەی (دار العراق)، بەغدا.

- **گۆڤاری (پەروەردە وزانست)(١٩٧٨)**، فەرهەنگی زاراوەکانی قوتابخانە، ژمارە (١٤)، ساڵی (٣)، چاپخانەی (دار العراق)، بەغدا.

- **گۆڤاری (دەنگی مامۆستا)(١٩٧٣)**، بەشی فەرهەنگ، ژمارە (١)، ساڵی (٢)، سلێمانی.

ژمارە (٦)، ساڵی (٢)، سلێمانی.

- **گۆڤاری (دەنگی مامۆستا) (١٩٧٣)**، پرسیارێك دەربارەی نووسراوی کۆڕی زانیاری کورد، گۆڤاری (دەنگی مامۆستا)، ژمارە(٨)، ساڵی (٢)، سلێمانی.

- **لیژنەی ئەدەب / کۆڕی زانیاریی کوردستان(٢٠٠٦)**، زاراوەی ئەدەبی (کوردی – عەرەبی – ئینگلیزی)، هەولێر.

- **لیژنەی زاراوەکانی بیرکاری (١٩٦٠)**، گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)، ژمارە (٥)، ساڵی (١)، سلێمانی.

ژمارە (٦)، ساڵی (١)، سلێمانی.

- **لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاریی کوردستان (٢٠٠٤)**:

زاراوەی کارگێڕی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیریی، هەولێر.

زاراوەی یاسایی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیریی، هەولێر.

- **محەمەد ئیسماعیل** (٢٠٠٦)، ئەم هەنگاوەی لقی هەولێری یەکێتی نووسەران، هیوایەکی گەشە لەڕێی دانانی فەرهەنگی یەکگرتووی کوردی، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٩)، هەولێر.
- **محەمەد چیا** (٢٠٠٤)، فەرهەنگی فەلسەفی (ئینگلیزی – عەرەبی – کوردی)، چاپی دووەم، سلێمانی .
- **محەمەد وەسمان** (٢٠٠١)، بەرەو فەرهەنگی پزیشکی یەکخراو، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٨)، هەولێر.
- **محەمەد وەسمان** (٢٠٠٤)، گیروگرفتەکانی زاراوە دانان لە زمانی کوردیدا، هەولێر.
- **محەمەدی مەلاکەریم و کەمال جەلال غەریب** (١٩٧٣)، هەڵبژاردنی زاراوەی کوردی، گۆڤاری (پەروەردە و زانست)، ژمارە (٦)، ساڵی سێیەم، بەغدا.
- **محمد معروف فتاح** (١٩٨٥)، زمانەوانی، دار الحكمة للطباعة والنشر في اربيل، هەولێر.
- **مسعود محمد** (١٩٨٣)، خۆدیتنەوە لە دوو ڕەخنەی دۆستانەدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٧)، هەولێر.
- **مسعود محمد** (١٩٨٨)، زاراوەسازی پێوانە، چاپخانەی سۆمەر، بەغداد.
- **نەسرین محەمەد فەخری** (١٩٧٤)، فەرهەنگی ناوی دەنگ لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری (کۆلێجی ئەدەبیات)، ژمارە (١٨)، بەغدا.

- **نەسرین محەمەد فەخری** (١٩٧٦)، هەندێ زاراوە و ئیدیۆمەی کوردی
– لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەیان لەڕووی زمانەوە، گۆڤاری (کۆلێجی ئەدەبیات)، ژمارە (١٩)، بەغدا.

- **نەسرین محەمەد فەخری** (١٩٧٧)، یاری لە کوردەواریدا و پێکهاتنی لە ڕووی زمانەوە و کاری بۆ سەر کۆمەڵ، گۆڤاری (ئاسۆی زانکۆیی)، ژمارە (١)، ساڵی (١)، سلێمانی.

- **نەسرین محەمەد فەخری** (١٩٨٧)، ڕێبازی بە کوردیکردنی زاراوە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٤)، بەغدا.

- **نەسرین محەمەد فەخری** (١٩٩٢)، یاری لە کوردەواریدا پێکهاتنی لە ڕووی زمانەوە و کاری بۆ سەر کۆمەڵ: بەرگی یەکەم، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة)، بەغدا.

- **نەسرین محەمەد فەخری** (٢٠٠٠)، یاری لە کوردەواریدا پێکهاتنی لە ڕووی زمانەوە و کاری بۆ سەر کۆمەڵ: بەرگی دووەم، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة)، بەغدا.

- **نەسرین محەمەد فەخری** (٢٠٠٥)، یاری لە کوردەواریدا پێکهاتنی لە ڕووی زمانەوە و کاری بۆ سەر کۆمەڵ: بەرگی سێیەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، زنجیرە (٢٩٨)، بەغدا.

- **نەقابەی مامۆستایان لە سلێمانی** (١٩٦٠)، زاراوەی زانستیی کوردی، سلێمانی.

- **وریا عمر امین** (٢٠٠٤)، چەند ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر.

- **هەژار** (١٣٨١)، فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە (کردی – فارسی)، چاپخانەی انتشارات سروش لیتوگرافی، چاپ و صحافی شد، تەهران.

- **یوسف ڕەئووف عەلی**(١٩٧٨)، دەربارەی لیستەی زاراوەکانی کۆڕ، گۆڤاری (ئاسۆی زانکۆیی)، ژمارە (١٠)، بەغدا.

## ٢- بەزمانی عەرەبی:

- **ابراهيم انيس** (١٩٧٥)، من اسرار اللغة، الطبعة الخامسة، (مكتبة الانجلو المصرية)، القاهرة.

- **ابراهيم كايد محمود** (٢٠٠٥)، المصطلح ومشكلات تحقيقه، مجلة (التراث العربي)، مجلة فصلية تصدر عن اتحاد الكتاب العربي، العدد (٩٧)، السنة الرابعة والعشرون، دمشق.

- **احمد الاخضر غزال** (١٩٧٧)، المنهجية العامة للتعريب المواكب، معهد الدراسات والابحاث للتعريب، الرباط – المغرب.

- **ارسطو طاليس** (١٩٥٣)، فن الشعر، ترجمة: عبدالرحمن البدوي، مطبعة مكتبة النهضة العربية، قاهرة.

- **ايناس كمال الحديدي** (٢٠٠٦)، المصطلحات النحوية في التراث النحوي في ضوء علم الاصطلاح الحديث، دار الوفاء لدنيا الطباعة والنشر، الطبعة الاولى، الاسكندرية - مصر.

- **توفيق وهبي** (١٩٧٣)، حول مقال مسؤولية الاديب الكبرى للاستاذ عبدالمجيد لطفي، گۆڤاری (پەروەردە وزانست)، ژمارە (٥)، ساڵی (٣)، بەغدا.

- **جلال شوقي** (١٩٩٣)، المصطلح العلمي بين الثراء والاغناء، مجلة اللغة العربية الاردني، العدد المزدوج (٤٢-٤٣)، السنة السادسة عشرة، الاردن.

- **جون لاينز** (١٩٨٧)، اللغة والمعنى والسياق، ترجمة: مجيد الماشطة، مطبعة جامعة البصرة، البصرة.

- **سامية اسعد** (١٩٨٩)، ترجمة النص الادبي، مجلة (عالم الفكر)، المجلد التاسع عشر، العدد الرابع، وزارة الاعلام، الكويت.

- **سعد القحطاني** (٢٠٠٣)، قضايا في المصطلح العربي، جامعة الدول العربية، مجلة (الفيصل)، العدد (٣٠٩)، الرياض.

- **شحادة الخوري** (١٩٩٢)، دراسات في الترجمة والمصطلح والتعريب، الطبعة الثانية، دار طلاس للدراسات والترجمة والنشر، دمشق.

- **عبدالقادر الفاسي الفهري** (١٩٨٤)، المصطلح اللساني، مجلة (اللسان العربي)، العدد (الثالث والعشرون)، المنظمة العربية للتربية والثقافة والعلوم (مكتب التنسيق والتعريب)، جامعة الدول العربية.

- **عبدالمالك بوحجرة** (١٩٩٨)، اقتراح في تكوين المصطلحات العلمية العربية، مجلة جامعة قسنطينة للعلوم الانسانية، العدد التاسع، الجزائر.

- **علي القاسمي** (١٩٨٠)، المصطلحية، النظرية العامة لوضع المصطلحات وتوحيدها وتوثيقها، مجلة ((اللسان العربي))، المجلد (١٨)، الجزء (١)، الرباط.

- **علي القاسمي** (١٩٨٥)، مقدمة في علم المصطلح، سلسلة الموسوعة الصغيرة (١٦٩)، دائرة الشؤون الثقافية والنشر، بغداد.

- **علي القاسمي** (١٩٨٨)، علم المصطلح بين علم المنطق و علم اللغة: العناصر المنطقية والوجودية في علم المصطلح، مجلة ((اللسان العربي))، العدد (الثلاثون)، الرباط.
- **علي عبدالواحد الوافي** (١٩٧٣)، علم اللغة، الطبعة السابعة، القاهرة.
- **قاسم السارة** (١٩٨٩)، تعريب المصطلح العلمي (اشكالية المنهج)، مجلة (عالم الفكر)، المجلد التاسع عشر، العدد الرابع، وزارة الاعلام، الكويت.
- **كارم السيد غنيم** (١٩٨٩)، اللغة العربية والنهضة العلمية المنشودة في عالمنا الاسلامي، مجلة (عالم الفكر)، المجلد التاسع عشر، العدد الرابع، وزارة الاعلام، الكويت.
- **محمد حلمي هليل** (١٩٨٩)، خطوات نحو تقييس المصطلح اللساني في الوطن العربي، بحث مقدم الى الندوة (التقييس والتوحيد المصطلحيان في النظرية والتطبيق)، تونس، ١٣-١٧ مارس.
- **محمد رشاد الحمزاوي** (١٩٨٢)، العربية والحداثة — او الفصاحة فصاحات، منشورات المعهد القومي لعلوم التربية، تونس.
- **محمد رشاد الحمزاوي** (١٩٨٦)، المنهجية العامة لترجمة المصطلحات وتوحيدها وتنميطها (الميدان العربي)، الطبعة الاولى، دار الغرب الاسلامي، بيروت.
- **محمد ظافر الصواف** (١٩٨٧)، التقنيات الحديثة واللغة العربية، الموسم الثقافي الخامس لمجمع اللغة العربية الاردني، عمان.

- محمد علي الخولي (١٩٩١)، معجم علم اللغة النظري (انكليزي – عربي)، مكتبة لبنان، لبنان.

- محمد كامل حسين (١٩٥٥)، القواعد العامة لوضع المصطلحات العلمية، مجلة مجمع اللغة العربية بالقاهرة، الجزء (الحادي عشر)، القاهرة.

- محمد مبارك (١٩٦٤)، فقه اللغة وخصائص العربية، الطبعة الثانية، مطبعة دار الفكر الحديث، لبنان.

- محمود فهمي الحجازي (١٩٩٣)، الاسس اللغوية لعلم المصطلح، مكتبة غريب، القاهرة.

- مولاي علي بوخاتم (٢٠٠٥)، مصطلحات النقد العربي السيماءوي الاشكالية والاصول والامتداد، منشورات اتحاد الكتاب العرب، دمشق.

- نجاة عبدالعزيز المطوع (١٩٨٩)، آفاق الترجمة والتعريب، مجلة (عالم الفكر)، المجلد التاسع عشر، العدد الرابع، وزارة الاعلام، الكويت.

٣- به زمانــى فــارسى:

- سيد جعفر سجادى (١٣٨٦)، فرهنگ اصطلاحات و تعبيرات عرفانى، چاپى هشتم، انتشارات طهورى، سرأغاز، تهران.

٤- به زمانى ئينكليزى:

-David Crystal:

- dictionary of linguistics and phonetic , London – Britain,١٩٨٠.

- Helmut Felber:

- standardization in terminology , vianna , ١٩٨٥

- Jennifer Seidl:
- English Idioms ,Oxford University Press , London – England,١٩٨٨.
- Taufiq wahby and C.J.Edmonds:
- ,A Kurdish – English dictionary , London , ١٩٦٦.

٥ - ئەنترنێت:

* (نساء سوريا) / مرصد حر يهتم بقضايا المجتمع في سوريا:
www.nesasy.org / content / category
- **علي القاسمي**، ماهية الفاظ الحضارة: هل هي كلمات عادية ام مصطلحات تقنية؟
* :www.doroob.com /?p=١٨٩٥٣
- **فريد امعضشو و رشيد سوسان**، ترجمة المصطلح الاجنبي وجهود المغاربيين فيها ٢/ يوليو / ٢٠٠٧
* :www.odaba sham.net / print.php?sid=١١٥٤٨
- **فريد امعضشو**، آليات الوضع المصطلحي في اللغة العربية.
* **صوت العربية** www.alarabiyah.ws /section.php?get :sectionid=٣٠
- **علي توفيق الحمد**، في المصطلح العربي (قراءة في شروطه وتوحيده).
* موقع مجلة (اللسان العربي):
- المواصفات القياسية العربية.
* مجلة الحرس الوطني، العدد (٢٣٤) في ١/١٢/٢٠٠١:
- المعجم العربي الماهية والوظيفة.

* موقع – تربوي اون لاين: Tarbawy online.com \mafahim١:html

- عبدالرحمن حللي، المفهوم والمصطلح (تعاريفه واختلافاته و مصادره).

* موقع (اوراق ٩٩ - ٩٩ awrak):

- استيعاب العلم، نقد: سمر روحي الفيصل. نشر في ٢٠٠٧/٥/٤

* منتدى اللسانيات / منتدى المصطلح اللساني :lissanhat.net/view forum.php?

- محمد احمد، المصطلح العلمي بين السيرورة والاندثار.

- iReview of aspects of terminology , **what is terminology** , Internet http. // corol uni – bilefeld.de / eagles/ wp٥ / termdeliv ٩٧ / node ٥ ,. htm/

- Rewiew of aspects of Terminology , **Definition** , Internet. http:// coral , lili. uni – Bielefeld./ eagle ٥ / wp٥ / termdeliv ٩٧ / node ٥٩. htmi

**I s o** , ١٠٨٧ , p. ٤. -

# پێرست

# زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی (٢٠١٢)ی

## بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | زنجیرە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مەنفاکان | و. عەزیز ڕەئوف | شانۆنامە | ٨٣٨ |
| ٢ | ئەکرۆباتێکی ونبوو | ئیسماعیل حەمە ئەمین | وتاری ڕەخنەیی | ٨٣٩ |
| ٣ | پەیکی شادی | محەمەد سەعید نەجاری | شیعر | ٨٤٠ |
| ٤ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٢ |
| ٥ | خاوەن شکۆ | د. یەحیا عومەر ڕێشاوی | لێکۆڵنەوە | ٨٤١ |
| ٦ | ئایین و ئیستاتیکا | خەسرەو میراودەلی | لێکۆڵینەوە | ٨٤٢ |
| ٧ | کوڵێنەری هەڵم | محەمەد بەرزی | زانستی | ٨٤٣ |
| ٨ | چرایەك لەسەر مادیان کۆ | و. عەزیز گەردی | ڕۆمان | ٨٤٤ |
| ٩ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٣ |
| ١٠ | سایکۆلۆژیای بەهرەمەندان | عمر مەرگەیی | لێکۆڵینەوە | ٨٤٥ |
| ١١ | شوناسێکی بێنۆقرە | سەردار عەزیز | کۆمەڵە وتار | ٨٤٦ |
| ١٢ | کۆمەڵە وشە و پێکەوەهاتن | د. بێستوون حەسەن | زانستی زمان | ٨٤٧ |
| ١٣ | مێژووی چاپخانەکانی سلێمانی | مارف ناسراو | ڕۆژنامەوانی | ٨٤٨ |
| ١٤ | وێستگەکان | و. محەمەد کەساس | کۆمەڵە وتار | ٨٤٩ |
| ١٥ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٤ |
| ١٦ | مێژووی دێرینی کوردو شوێنەوارەکانی | کەمال نوری معروف | مێژوویی | ٨٥٠ |
| ١٧ | ئەزموونی چیرۆکنووسین | محەمەد فەریق حەسەن | وتار | ٨٥١ |
| ١٨ | پۆست مۆدێرنەو چەند بابەتێکی شانۆی | ئەنوەر قادر ڕەشید | شانۆیی | ٨٥٢ |

| ١٩ | هەڵوەدای کوێرێك | ڕەنجەی نابینا | کۆمەڵەچیرۆك | ٨٥٣ |
|---|---|---|---|---|
| ٢٠ | ئاوڕدانەوەیەك لە مێژوو | عەلا نووری | مێژوویی | ٨٥٤ |
| ٢١ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٥ |
| ٢٢ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٦ |
| ٢٣ | سمکۆ | سەید کەمال ئیبراهیمی | مێژوویی | ٨٥٥ |
| ٢٤ | تەلیسمی گێڕانەوە | کامیل محەمەد قەرەداغی | لێکۆڵینەوە | ٨٥٦ |
| ٢٥ | نارنجی فڕین | ئەمین گەردی گلانی | چیرۆك | ٨٥٧ |
| ٢٦ | ئایین و کایە جیاوازەکان | سەنگەر زراری | کۆمەڵە دیدار | ٨٥٨ |
| ٢٧ | تیۆرە نوێیەکانی ڕەخنەی ئەدەبی | د. کەمال مەعروف | ڕەخنەی ئەدەبی | ٨٥٩ |
| ٢٨ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٧ |
| ٢٩ | ڕەنگدانەوەی ریالیزمی سیحری | حسین سابیر علی | لێکۆڵینەوە | ٨٦٠ |
| ٣٠ | میدیا و دەسەڵات | و. فاروق جمیل کریم | رۆژنامەوانی | ٨٦١ |
| ٣١ | ئەدەبی ئەمریکای لاتین | و. تەها ئەحمەد رەسول | ئەدەبی | ٨٦٢ |
| ٣٢ | پلۆت لە چیرۆکی کوردیدا | بوشرا کەسنەزانی | لێکۆڵینەوە | ٨٦٣ |
| ٣٣ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٨ |
| ٣٤ | تروسکەیەك لە تاریکیدا | صلاح نیساری | کۆمەڵە چیرۆك | ٨٦٤ |
| ٣٥ | سی و حەوت خوێندنەوەی جیاواز | نەبەز تالیب | بایۆگرافی | ٨٦٥ |
| ٣٦ | سایکۆلۆژیای شۆفێری | بەختیار محمد | زانستی دروونناسی | ٨٦٦ |
| ٣٧ | بکوژی بابانوئێلەکان | و. مستەفا زاهیدی | کۆمەڵە چیرۆك | ٨٦٧ |
| ٣٨ | بارگە | ڕەفعەت مورادی | لێکۆڵینەوە | ٨٦٨ |
| ٣٩ | شێوازی شیعری نوێ- کرمانجی ناوەڕاست | د. حمە نوری عمر کاکی | لێکۆڵینەوە | ٨٦٩ |
| ٤٠ | مادام بۆڤاری (وەرگێڕان) | جەبار سابیر | ڕۆمان | ٨٧٠ |
| ٤١ | ڕۆمانە فارسیە هاوچەرخەکان | عمر شینکی | رانانی کتێب | ٨٧١ |
| ٤٢ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٩ |
| ٤٣ | وەرزەکانی ئەیرۆبیك و دابەزینی کێش بۆ پیاوان و ئافرەتان | و. ڕێباز ئەحمەد فرج | زانستی | ٨٧٢ |

| ٤٤ | دەقناوێزان لەشیعری نوێی کوردیدا | شنۆ محەمەد محمود | ئەدەبی | ٨٧٣ |
|---|---|---|---|---|
| ٤٥ | ئەنفال تاوانێکی دژ بەمرۆڤایەتی | ستارە عارف | لێکۆلینەوە | ٨٧٤ |
| ٤٦ | تەکنیکەکانی سەردەم | جمال محەمەد ئەمین | زانستی | ٨٧٥ |
| ٤٧ | ڕەهەندەکانی شوێنکات لەدەقەوالاکانی شێرکۆ بێکەس | لوقمان ڕەئوف عەلی | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | ٨٧٦ |
| ٤٨ | لەردیوشتە جوانەکانەوە | و. رەئوف حەسەن | کۆمەڵە چیرۆك | ٨٧٧ |
| ٤٩ | جۆرەکانی دەقناوێزان لە ڕۆمانی پێنجەمین کتێب | د. نەجم ئەڵوەنی | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | ٨٧٨ |
| ٥٠ | نەریت و کلتووری کوردی | م. زەکیە ڕەشید محەمەد ئەمین | کلتووری | ٨٧٩ |
| ٥١ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٨٠ |
| ٥٢ | شەوانی بۆن و سەفەر | فروغ نیعمەت پور | کورتەچیرۆك | ٨٨٠ |
| ٥٣ | گۆران لە یادەوەری هاوچەرخەکانیدا | ڕێبوار حمە تۆفیق | لیکۆڵینەوە | ٨٨١ |
| ٥٤ | پێگەی پارتە سیاسییە ئیسلامییەکانی کوردستان | فەیسەڵ سلێمان محمد | لیکۆڵینەوە | ٨٨٢ |
| ٥٥ | بنەما و پێکهاتەکانی زاراوە لەزمانی کوردیدا | شەهاب شێخ تەیب تاهیر | زمانەوانی | ٨٨٣ |